پێشکەشە:

بە ئەو لاوە کوردەی

کـــە ئـــاواتـــی

خۆ رۆشنبیرکردنـــەو

ئـــــــــارەزووی

لە پەرەوەردەکردنی

خۆیـــــــەتـــــی

# پێشەکی وەرگێڕ

زۆر بە کورتی و بەکوردی دەڵێم:

تکـا لــە خوێنــەر دەکــەم، ئــەم وەرگێڕانــە، بەهــەر (٤٧) بابەتەکەیەوە یەك لە دوای یەك بەبایەخەوە بخوێنێتەوە ، ئەو بابەتانــەش پێشخســتن و دواخســتنی تێدانــەکرێن زۆر بــە سوودترن...

ئەم نوسراوەیە ، لەساڵی (١٩٥٨)دا دانراوە، لەوانەیە چەند زانیارییەکی تێدا بێت و گۆڕابێت لەگەڵ ئێستادا نەگونجێت، لەگەڵ ئەوەشدا ، بایەخ و گرنگی و سوودی خۆی هەر هەیەو دەمێنێت، وبەراستیشم نەزانی لە کاتی وەرگێڕانی ئەم نوسراوەیەدا هیچ دەستکارییەکی تێدا بکەم، بۆئەوەی خوێنەر بجوولێنم و بەبەراورد لە تەك زانیارییەکانی خۆیدا ، هەست بە گۆڕانی ئەم (٥٠) ساڵەی دواییە بکات لە نێو بابەتەکاندا.

دڵودەروونمان زۆر کراوەیە بۆ هەر چ رەخنەیەکی بەڕێزتان و بەرەخنــەکانتان چــاومان زێــتر دەکرێنــەوە بــۆ دووبارەنەکردنەوەی هەڵە... و خۆشم رەخنەیەکم لەدانەرەکە هەیە ئەویش ئەوەیە: کە دانەر ئاماژەی بۆهیچ سەرچاوەیەك نەکردووە لە نوسراوەکەیدا... تۆ بڵێی هەر هەموو ئەم زانیارییانە هی خۆی بن؟!....

وەرگێڕ

مەحموودی تاهیر سادق

سلێمانی ٢٠/٥/٢٠٠٦

# پێشەکی دانەر

بابــەتی ئــەم نووســینە، پێگەیانــدنی مرۆڤــی رۆشــنبیرە، لەچییەتی و مەبەست و بەهای رۆشنبیری دەکۆڵێتەوە، بەدوای رێبازی وە دەستهێنانی دەگەڕێت .

بەختــەوەرم بــەوەی تــوانیم واتایــەکی هاوچــەرخانەی بــۆ بهێنمەکایەوە، کاتێکی زۆری ژیانی ویژدانیم تەرخان کردبوو بۆ ئاڕاســتەکردنێکی رۆشــنبیریی لاوەکانمــان، بــە نووســینی جۆراوجۆر کە بەهای سەرەتاکانی هاوچەرخی خستە جێگای سەرەتا لاساییکەرەکان.

کێشــەی رۆشــنبیریی لای مــن هــەروەك کێشــەی سیاســی و ئاینی لای خەڵکی دیکەیەو زۆربەی ئەم کێشانەش کێشەی خۆم بــوون، رووبــەڕووی پــەروەردەی تایبــەتمو گەشــەی نەســتم دەبوونەوە.

ئێمــە لەمیســر، لەهــەژاریی رۆشــنبیریی و بیرکردنەوەیــەکی نزیــك لــە نــەبوودا دەژیــن ، کەســیش نییــە لەئێمــە نــەزانێت هۆیەکانی چییە!؟ بەڵکو تاکە هۆی ئەوەش داگیرکەرە کە تەگەرە بوو لەسەر رێی خوێندنی هاوچەرخدا، تا گەیشتە رادەیەك ، وەزارەتی پەروەردە تاسالّی(١٩٢٥) نەیدەهێشت ئامادەییەکی کچان بکرێتــەوە... و بــۆ مــاوەی (٢٠) ســاڵ زانکــۆی قــاهیرە بەبەڕەڵایی مایەوە و حکومەتیش ددانی پێدانەنا، جگە لەوەی چەندین تەگەرەی دەخستە رێگای ئەوانەی حەزیان لە گۆڤار دەرکردن دەکرد.



پەرەسەندنی رۆشنبیری مافی خۆمانە، بۆ گەیشتن پــێ ی هــەر بــەئارەزوو دەیــان تەگــەرەیان لــەپێش دادەنا، بــەڵام حــەزی پێشکەوتن، کەلەدەرروونی لاوەکاندا کڵپەی دەکرد، و سەرەڕای ئەو هەموو تەگەڕانەش، توانی کەش‌وهەوایەکی بیرکردنەوەی ئــەوتۆ دروســت بکــات کــە تــا رادەیــەك دانــەری ئاســان بــوو و نوسراوە زۆر بوون، و بازاڕێکی بچوکی بۆ دروست بوو و ئەو لاوانــەش کــە هــیچ زمــانێکی ئــەروپاییان نــەدەزانی توانییــان سوودی لێوەرگرن و لێی بەئاگابن.

هەرچەندە جاری ئێمە دوورین لەوەی بتوانین بڵێین:– لاوی میســری رۆشــنبیری بــەرزو تێــر و تەســەل لــەنێو نوســراوە عەرەبییــەکان دەدۆزێتــەوە، و دەشــتوانین بڵــێین، ئەوەنــدە رۆشــنبیرییەی دەیخوێنێتــەوە بەســە بــۆ بــەئاگاهێنانی و پێشخستنی.

بــەدووری نــازانم کــە نوســراوە زۆر دەبــن و لەگــەڵ کۆمەڵــە گۆڕاوەکــەمان کارلەیــەك دەکــەن، و بیرمــان پەرەدەســێنێت، کــە ئەوەش ئاواتمانە و ئەوساکە دەگەینە رۆشنبیرێیکی زیندوو لەم چەرخەدا، کە بیری کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی زۆرانبازی تێدادەکەن.

لاو نییە حەزی لەپێشکەوتن نەبێت، کە حەزو چالاکی بۆ دروســت دەکــات، بۆئــەوەی لــە خــۆی بەرزتربێتــەوە، وبگاتــە ئاستێك بەرزتر بێت لەو ئاستەی کە ئێستا تیایدا دەژیەت، و ئەم حــەز بەپێشــکەوتنە کــە(برنادشــۆ) پێــی دەڵێــت(ئــارەزووی گەشــەکردن)، بەشــێوەی جۆراوجــۆر دەبێــت، و لەگــەڵ ژینگــەی

کۆمەڵایەتی و بەهایەکانی کارلێکدەکەن.

لەوانەیە دەوڵەمەندی، یان پایەی کۆمەڵایەتی بەرز، یان وەرزش، یان خوێندن ئاواتی هەر لاوێك بێت، و لەوانەیە، هەڵبژاردنی یەك لەمانە، ساویلکانە بووبێت، و لە منداڵی کاری تێکردبێت، ولەوانەشە، لەلاوی، وپاش پێگەیشتنی بووبێت، ولەویژدانییەوە دروست بووبێت.

ئەم نوسراوەیە هەوڵێکە بۆئاڕاستەکردنی لاوەکانمان بەرەو بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیرییان، لە سنوری ژینگەی کۆمەڵایەتی میسر، و وڵاتانی عەرەب بەشێوەیەکی گشتی ، یان ئەم نوسراوەیە هەوڵێکە بۆ رێنمایی کردنی لاوان بەرەو گەشەسەندنی رۆشنبیریو روونکردنەوەی راست و ناڕاستە لەچالاکی خوێندندا، ئێمە، لە چەرخێکی پڕ لە تەقینەوەو رووداووشۆڕش وجەنگو کودەتا دەژین، مرۆڤ هەرگیز لە چەرخێکی وەك ئەوەی ئێمەدا نەژیاوە، لەماوەی کەمتر لە (٥٠) ساڵ دوو جەنگی گەورە لە جیهاندا روویاندا، سیستمی هاوبەشییەتی(١٠٠٠) ملیۆن مرۆڤی گرتەوە، بۆمبی گەردیلەیی دروست کرا، ودواتریش بۆمبی هایدرۆجینی ، لەرێگای رادارەوە پەیوەندیمان بە مانگەوە کرد، و دووریش نییە، بەسواری موشەك بگەینە ئەوێ، هاتوچۆی ئاسمانی پێشبڕکێ لەگەڵ هاتوچووی دەریایی دەکات، و خەریکە قسەکردنی بێتەل شوێنی قسەکردنی بەتەل دەگرێتەوە.

ئەمانە هەر هەمووی ئەوە دەسەلمێنن، کە کاریگەرییەتی زانست لە سەر کۆمەڵ جێگیرتر دەبێتو رۆشنبیرییش بۆتە



پێداویستیەکی گرنگی هەموو مرۆڤێك،بۆیە ، ئێمەش دەبێت بگۆڕێین و بگونجێن وگەشەبکەین، چونکی ، وەستان لەم بارودۆخەدا تاوانە، گۆڕینی بیر بەبەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری بەشێکە لەو گەشەکردنە، یان گرنگترین بەشێیەتی. گۆڕینی ئامێریی لە داهێناندا، گۆمانی تێدانییە گۆران لەبەرهەم هێنانو هاتوچۆکردندا بەدیدێنیو دواتریش بەهۆی ئەوەوە، سیاسەت وئابووری وکۆمەڵ دەگۆڕێت. واتا، رۆشنبیری بەردەوام لەگۆڕاندایە و گەر وەستاین وبوینە بەرد، ئێمە نەك هەرئاڕاستەی نوێی ژیانمان ناوێت ، بەڵکو تێگەیشتنو زانیاریشمان ناوێت، و لە نێو کۆمەڵدا، وەك کۆلکەدارێکی سەرئاومان لێدێت، و ئاوەکە بە ئارەزووی خۆی، و بێ ئاگاو بێ هەست بەملاوبەولاماندا دەبات، یان ئاگاییەکی بەرامبەر هەڵوێستمان بوو بێت.

ئێمە بمانەوێت و نەماوێت، لەنێو کۆمەڵێکی پێشکەوتوودا دەژینو پێویستیمان بەلێکۆڵینەوەی بەردەوامە، بۆئەوەی لەئاستی ئاڕاستەکان و مەبەستەکاندا هەڵوێستەمان هەبێت، لەبەرئەم هۆیە، دەبێت هەریەك لە ئێمە بەرنامەیەکی رۆشنبیری هەبێت، کە بەرنامەی ژیانە، تا بژین بۆ خوێندنەوە، و بخوێنینەوە بۆ ژیان، دیارەئەم بەرنامەیەش پوختەکردن و گۆڕین هەڵدەگرێت، بەڵام دەبێت هەریەك لە ئێمە بەرنامەی هەبێت بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی وشیاری.

لەوبەندە کورتانەی کە دێن ئاڕاستە هەن بۆ کورتکردنەوەی بۆ خوێنەر، وەك هێمایان لێهاتووە من خۆم لە درێژەپێدانیان

دەپـاریزم لەبـەر ئـەوەی متمانـەم بـە خوێنـەر هەیـە زیرەکانـە دەتوانێت کەم و کورتییەکانی پڕبکاتەوە، بەڵام لەو شوێنانەدا کـە بـەرەوڕووی قورسـی سـایکۆلۆجی لێکۆڵینـەوە بوومـەوە، درێژەم پێداوە، و کارەکەم بۆ خوێنەر ئاسانکردوە.

ئەوانـەی بـارودۆخ نەیهێشـتووە خوێنـدنی بـاڵا تەواوکـەن، ئاراسـتەکردنیان مەبەسـتی یەکەممـە، و پـاش بیرکردنـەوە، بـۆم دەرکـەوت کـە فێرخـوازانیش پێویسـتییان بـەم ئاڕاسـتەکردنە رۆشنبیرییە هەیە.

پێموایە خوێنەری ئاسایی گەر ئەم نوسراوەیە بەرێزبەندی خـۆی بخوێنێتـەوە هـیچ قورسـییەك لـە تێگەیشـتنی نابینێتوسوودی لێوەردەگرێت.

**ئەم نوسراوەیە دوو بەشە:-**

**بەندەکانی بەشی یەکەم:_**

چارەسـەرکردنی پلانـی گشـتی لێکۆڵینـەوەن، بەشـوێن شێوازو بەهاو بارودۆخەکاندا دەگەڕێت.

**بەندەکانی بەشی دووەم:**

چارەسـەرکردنی لێکۆڵینـەوە بابەتـە جۆراوجۆرەکانـە بەدووردرێژی. ئەم رێکخستنە بەهای خۆی هەیە، گەر خوێنەر پەیڕەویی بکات... سوودی لاوان لەئەم نوسراوەیەدا ئاواتمە گەر رەخنـەیان هـەبێت، بـا لـە هەڵـە و کەمتەرخەمییـەکان ئاگـادارم بکەنەوە، تا لەچاپی داهاتوودا دووبارەنەبێتەوە.

**سەلامە موسا**

**مانگی (٥)ی ساڵی ١٩٥٨**

**قاهیرە**

(١)

## خوێندنگه و كۆمەڵ

لە كۆمەڵی ئێستاماندا ، خوێندنگە پێویستە بۆ هەموو مرۆڤێك چ نێرو چ مێ، لە كۆمەڵێكی پێشكەوتوودا، كە چاوەڕێی دەكەین وخەونی پێوە دەبینین، وای لێدێت زانكۆش بۆ هەموو مرۆڤێك پێویست بێت. و خوێندنگە سەرەڕای ئەوەی پێویستە، لەمیسردا بۆ گشت كەس نییە، زانكۆش تەرخانكراوە بۆ (٥٠) هەزار كەسێك لە كوڕان و كچانی دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوان.

هەموومان دەزانین كە ئەوەی دەستمان دەكەوێت لە خوێندنگە، شتێكی كەمە بەرامبەر پێویستیەكانی ژیان، بۆیە لەبەرەنگاربوونەوەی قورسییەكانی ژیان هەست بە نەزانین دەكەین، و هەروەها هەست بە پیویستی لێكۆڵینەوە دەكەین، فێربوونی خوێندنگە، كۆمەڵێك زانیاریمان دەداتێ، بۆ ڕۆشنبیركردن سەرەكیین، بەڵام خوێندنگە مامەڵەی هەمووان وەك یەك دەكات وبەوە دەچێت كە هەموویان باڵایان وەك یەك بێت و پێویستیان بەیەك ئەندازە پارچە كۆتاڵ هەبێت، بۆ دروستكردنی جلوبەرگیان.

لەبەرئەوەی مرۆڤ لەم جیهانەدا سەربەستە، بۆیە پێویستی



بەو زانیارییانە هەیە كە دەگونجێن لەگەڵ پێویستیە تایبەتەكانیدا. ئەو بەرنامە فێركارییە كە دادەندرێت بۆیەك ملیۆن منداڵ ، یان بۆیەك ملیۆن لاو ناتوانێت پێویستییەكانی هەموو منداڵێك ، یان لاوێك دابین بكات، مەگەرهەر بەشێوەیەكی گشتی نەبێت بەچاوپۆشیكردن لە تایبەتمەندی و خەسڵەتە تاك ڕەهەندەیەكانیانەوە.

ئەو زانیارییانەی كە لە خوێندنگە دەستمان دەكەون، گەر هاتوو زۆر بەوردیش هەڵبژێردرابوون، پاش تەواوكردنی خوێندن دەبنە بناغەیەك شتی لەسەر دروستبكرێت، گەر وەستاین ئەو بناغەیە كەڵكی نابێت چونكە ، پاش خوێندنگە و بگرە زانكۆش پێویستیمان بە لێكۆڵینەوە هەر هەیە.

مامۆستای زۆرباش ، ئەو كەسەیە، كە هەر زانیارییەكان ناگەینێتە مێشكی خوێندكاران، بەڵكو پلانیان بۆ لێكۆڵینەوە بۆ دادەنێت، و دەتوانن بێ ئەو مامۆستایە لە ژیانیاندا سەربەستانە خۆیان فێربكەن و مامۆستای لەو شێوەیەش دەگمەنن.

كۆمەڵەكەشمان لەم پێشكەوتنە خێراییە، پێویستی بەجەماوەرێكی ڕۆشنبیر هەیە، چالاكی بیركردنەوەیان بەردەوام هەبێت، بۆ چارەسەركردنی كێشە كتوپڕەكانیان، بۆئەوەی نەكەونە ژێردەستی ستەمكاران و داگیركەرانی بیانی و زۆردارەمیسرییەكان، كە دەڵێن:(توانای پێشختنی نەتەوەكەمان هەیە بە دان نەنان بە مافەكانیان؟!) جەماوەری نەزان باشترین شێوازە بۆ ئازاكردنی ستەمكار و وزۆرداران ، لەبەرئەوەی بەقسەی بریقەدار و وتەی كاریگەر و فشەی گوتارەكان زوو

هەڵدەخەڵەتێن.

لێرەدا گرنگی نوسراوە و گۆڤارورۆژنامە دەردەکەوێت، ئێمە پاش خوێندن و زانکۆ، نزیکەی (٥٠) ساڵ دەژین، ئەوانەش خۆراکی بیرمانن، شێوازی بەرزکردنەوەی ئاستی پێشکەوتنی رۆشنبیریمانن، بەبێ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە پێناگەین دەبێت بیکەینە نەریت، دەبێت بە دەستکراوەیی خۆمان رۆشنبیربکەین ، هەروەك ئەو دەستکراوەییەی کە بۆ کڕینی پێداویستیەکانمان بەکاریدەهێنین.

کۆمەڵی پێشکەوتوو باوەڕی بە ئازادی رۆشنبیرییە، بۆیە یاسا و بڕیارو پێڕۆی وا دەردەکات ، کە نوسراوە و گۆڤارو رۆژنامە بڵاوو باو بن، لەنەتەوە دیموکراسەکانی ئەوروپا، هەزارەها کتێبخانە ، نوسراوە و گۆڤارو رۆژنامە دەکڕن، بەدەرلەوەی کە خەڵکیش دەیکڕن وبەشداریدەکەن لە کڕینی گۆڤارو رۆژنامە دەستگێریەکان.

لەو ولاتانەدا چالاکی وشیاری، بازاڕی باش بۆ بەرهەمەکانی خۆی دەدۆزیتەوە، گەر بچیتە ماڵێکی ئەوروپایی، دەبینین نوسراوە زۆربەی ژوورەکانی رازاندۆتەوە. جارێك لەلەندەن ، لەماڵێك رێرەوەێکی تەسکی بەرەو چێشتخانەم دێت، رەفەیەکی دووردرێژی هەبوو زیاتر لە(٢٠٠) نوسراوەی لەسەربوو جگە لەوەش ، خاوەن ماڵەکە خۆی هەڵدەکێشا بەوەی کە نوسراوەی چاك‌ونوێی کە لەکەل‌وپەلی نایاب دروستکراوان لەسەر مێزی هۆڵەکەی داناوە. لەبەرئەم هۆیە، زۆرجار فەیلەسوفی گەلەك مەزن لەئەوروپادا دەبینین زانکۆی



تەواونەکردووە، بەڵکو لەخوێندنگەش کەمی خوێندووە، وەك (هربرت سبنسر)ی فەیلەسوفی ئینگلیز، کە خوێندنی سەرەتایی تەواو نەکردبوو دەوربەری هەشتا ساڵیش ژیابوو شانازیشی بەوەوە دەکرد کە لە (خوێندنگە) فێرنەبووە. هەروەها (بەرناردشۆ)، دەتوانین ناوی دەیان لەسەرکردە و سیاسیەکان و نوسەران بهێین.لەوانەی نەخوێندوویانە و نەزانکۆشیان تەواوکردووە، بەڵام ئەو کۆمەڵە پێشکەوتووەی کە تیایدا ژیاون، زانکۆیەکی گەورەی بۆ رەخساندوون لە نوسراوەو گۆڤار، پاش لێکۆڵینەوەیان بیریان پێگەیشت ، رۆشنبیرییەکی چاکیان دەسکەوت و دەرچوانی زانکۆش نەدەگەیشتنە ئاستیان.

گەر خوێنەری ئەم نوسراوەیە، خوێندنگە، یان زانکۆی تەواو نەکردبێت ئەوا لێرەدا بەرنامەیەکی پڕی دەستدەکەوێت بۆ لێکۆڵینەوەیەکی خۆیی، دەتوانێت کەسایەتییەکەی پێ بەرزبکاتەوە و بیری پێبگەیەنێت، خەم لەرابردووی نەخوات، کە خوێندنی لەدەستچووە. گەر خوێنەر وەك بەختەوەرێك زانکۆی تەواوکردبێت. ئەوا لێرەدا ئەوە دەدۆزێتەوە کە پاڵی پێوەدەنێت تا ماوە خوێندکار بێت، و دەرچووی زانکۆش دەبێت هەردەم ئەوەی لەبیر نەچێت، کە خێرایی پێگەیشتن لە زانیارییەکان و نوێ کردنەوەیان پێویستی بە لێکۆڵینەوەی بەردەوامە.

ئەو پزیشکەی ساڵی(١٩١٨)زانکۆی تەواوکردبێت و تائێستاش لە پیشەکەیدا بەردەوام بێت بە زەحمەت دەرمانێك دەدۆزێتەوە بۆ نەخۆشێك. گەر ئەو دەرمانە لەساڵی(١٩١٨) باوبوویێت، لەبەرئەوەی زۆربەی درەمانەکان ئێستا نوێن،

**بەتایبەتی ڤیتامینەکان و هۆرمۆنەکان وەك( ئەنسۆلین) و دژە نەخۆشییەکان و کۆمەڵەی (سولفانامید)و کوتانی خۆپاریزی، ئەم پزیشکە ئەم شتانەی سەرەوەی لە زانکۆ نەخوێندووە وگەر هەر لە شوێنی خۆی پاش زانکۆ مابێتەوە، ئەوا لەپیشەکەی بە نەزان دادەندری ، هەموو زانیارییەکانیش ئەوهان، بەردەوام لە نوێ بوونەوەدان ، داوا لە پسپۆروکانی دەکرێت بە دواچوونی لێکۆڵینەوەیان لەبابەتەکانیان بەردەوام هەبێت، و هەر بۆ نموونە پسپۆڕانی وزەی گەردیلەیی.**

**مەبەست لەم نوسراوەیە ئەوەیە ، سوودی رۆشنبیری بۆ خوێنەر روون بکەینەوە، باشترین شێوازیش بۆ وەرگرتنی بدۆزینەوە، لەبەرئەوەی لاو گەر زانی ، چێژێکی زۆر بەرز لە لێکۆڵینەوەو فراوانکردنی ئاستی وشیاری زانستی دەبینێت، زۆر زێترە لەچێژی رابواردنی بێ مانا، یان خوێندنەوەی بە زۆر لە خۆکردن، هەرگیز رۆشنبیرکردنی خۆی پشتگوێ ناخات چرکەیەکیش دواناکەوێت بۆ دانانی بەرنامەی خۆرۆشنبیرکردن، وپێداویستییەکانیشی بۆ دابین دەکات.**

**تکام وایە خوێنەر، ئەمە بە ئاڕاستەیەك دابنێت، ژیانەوەیەك بۆ شرۆڤەکردن بەدی بێنێت و سیستمێکی بۆ دابنێت و مەبەستیش لەم نووسینە ئەوە نییە مرۆڤ لەبەر پیشەکەی خۆی رۆشنبیربکات ، بەڵکو تکام وایە لاوەکانمان هەتا لاون لەسەر لێکوڵینەوە رابێن و کەگەیشتنە (٥٠)(٦٠)ساڵی، ئەم نەریتە وایان لێدەکات کە بەردەوام بن لە پرسیارکردن و حەز دەکەم وا هەست بکەن کە لێکۆڵینەوە لەلاوییەوە ئایندەی دەگۆڕێت، و**



**دەرگای زۆریش بۆ پێشکەوتنی دەکاتەوە ئەگەر واش نەکات ئەو دەرگایانە هەر هەمووی بە داخراوەیی دەمێننەوە.**

**( ٢ )**

## کۆمەڵ پەروەردەمان دەکات

**مامۆستا (احمد جمعە)ەی هاوڕێم، نوسراوەیەکی هەیە،(گەر چاپکرا) شتێکی سەیرو سەمەری تێدایە، ئەویش ئەوەیە، کەواز لە خوێندنگەکان بهێنین، ئیتر با کۆمەڵ پەروەردەمان بکات، ئێمەش پێویستیمان بەو خوێندنگەیانە نییە کە خوێندکاری تێدا رێکبخەن بۆئەوەی تێیدا فێر بن، سەرسوڕمێنی ئەم بۆچوونە لەوەدایە کە ئێمە لە ژینگەیەکدا گەشەمان کردووە، بە خوێندنگە ئاشنابووین ، و خەریکە وای لێبێت، شارێك یان شارۆچکەیەك نەمێنێت بێ خوێندنگە. بەڵام پێش سەدەیەك ئەوها نەبوو، ئەوسا تەنها لە پایتەختەکاندا خوێندنگەی زۆر کەم هەبوو و خەڵکیش دەستە دەستە خۆیان فێرە پیشەسازییەك یان هونەرێك دەکرد، و خۆیان وەك (تیرە)رێکدەخست، (تیرە)ش ئەو هۆبانە بوون بۆ بەشداریکردن لە پیشەیەکدا دروست دەبوون، منداڵیان دەناردە ناویان، و فێردەبوون ، وردە وردە دەبوون بەکرێکار، دواتریش دەبوون بە وەستای ئەو کارە.**

سیستمی (تیره) لەرۆژگاری (اسماعیل پاشا) دا گشتی بوو، هەروەها لە ئەوروپاش لەسەدەکانی ناوەڕاستدا وابوو سیستمی زانکۆکانی ئەوروپایی ئێستاش وایە، ئەو سیستەمەی کە زانکۆ سەربەخۆ دەکات، بەهەمان شێوەی سیستمی(تیره) دروست بووە، لەبەرئەوەی هەموو تیرەیەکی پیشەیی ، بۆ وەرگرتنی ئەندامەکانی و پەروەردەکردنیان و سزادانیان سەربەخۆ بوو، وشەی زانکۆ مانای (تیره) دەدات، وەك ئێستا بڵێین سەندیکا.

پاساوی مامۆستا( احمد جمعه) ئەوەیە:- کە خوێندنگە زۆر پێویست نییە و زۆریش لەسەرکردە و زاناو دانەرەکان لە خوێندنگە فێرنەبوون، یان فێربوونێکی کەمیان هەبووە، وەك (داروین و کەمال ئەتاتورك و ستالین و برناردشۆ).

ئێمە لێرەدا ناڵێین کە خوێندنگە پێویست نییە، بەڵام دەبێت دان بەوە دابنێین، کە کۆمەڵی باش هەلی زۆر بۆفێربوونمان دەرەخسێنێت، و ئەتوانین سوودی لێوەربگرین،و خۆشمانی پێ رۆشنبیر بکەین. هەمووومان دەزانین سازنگە ( وەرشە) چییە، وەك کارگەیەکی بچوکە ، بۆ هەموو ئەو کرێکارانەی لەوێ کاردەکەن خوێندنگەیەکی هونەرییە، زۆرجاریش ئەو کرێکارانە لەوێ دەردەچن، سەربەخۆ دەبن، بەهۆی ئەو پیشانەی کە لە وەرشە فێریبوون، کاروکاسبی دەکەن.

نابێت ئێمە وا سەیری کۆمەڵ بکەین کە تەنها فێرە پیشەیەکمان دەکات، بەڵکو دەبێت بیقۆزینەوەو خۆمانی پی رۆشنبیربکەین، و ئەمەش بابەتەکەمانە، کۆمەڵی هاوچەرخی باش شێوازی زۆری هەیە بۆ رۆشنبیرکردنمان، وەك: رۆژنامەو



گۆڤارو نوسراوەو سینەما و رادیۆ و مۆزەخانەو یانە و ماڵیش. کاتێکی زۆر باشمان دەداتی ، هەموو ئەم شتانە لە کۆمەڵی زیندوودا باشن و لەکۆمەڵی مردوودا خراپن، هەموو یەك لەوانە دەتوانێت ببێتە شێوازێکی بەهێزی رۆشنبیریکردن، یان ترۆکردن، چەند بەندێك لەم نوسراوەدا بۆ توێژینەوەی ئەو بابەتە ترەخان دەکەین.

رۆژنامەو گۆڤار و نوسراوە لەپێش هەموو ئەو شێوازانەوەن، وبڕوا ناکرێت هیچ ماڵێکی پێشکەوتوو ئەوانەی تێدا نەبێت، ئەو پیاوە مەزنانەی کە نەتەوەکانیان بەرەو وێژە و رامیاری و زانستەکان بردووە، بێ ئەوەی خوێندنگە یان زانکۆیان تەواو کردبێت، ئەم بەهرەیان لەسەرکردایەتییەوە وەدەست هێناوە، لەرێگەی کۆمەڵە باشەکەیانەوە کە رۆژنامەو گۆڤار و نەسراوەی چاکی تێدابووە، مەحاڵە ئەم جۆرە پیاوانە لە کۆمەڵی میسرییدا دروست بن، چونکە زۆربەی رۆژنامەو گۆڤارونوسراوەکان باش نین. کتێبخانەی باش، بەهای لە خوێندنگە ، یان زانکۆی باش کەمتر نییە ئەگەر زێدەتر نەبێ،

کۆمەڵی چاك ، مۆزەخانەی مێژوویی و زانستیمان دەداتێ، و بەنوسراوە بۆمانی ڕووندەکاتەوە، لاوێکی میسری گەر لێکۆڵینەوەی ئەو شتانەی نێو مۆزەخانەکان بکات، یان سەردانی باخچەی ئاژەڵ بکات، هەموو ئەمانە بۆ رۆشنبیریکردن بەسوودن. هەروەها مۆزەخانەی کشتوکاڵیش ، گەر هاتوو جەماوەر خۆیان فێرە سەردانی کرد بە مەبەستی لێکۆڵینەوە و سوود وەرگرتن. ئەوسا میریش بایەخی پێدەدات و دەکرێت بۆ

روونكردنەوە و راڤەكردن شارەزا لەوێ دابندرێت.

رادیۆ رۆشنبیرییكی گشتی بڵاودەكاتەوە، كە زۆربەی گۆرانی میللی و مۆسیقای گشتییە، و هەندێك وانەی سووك و ئاسان، بەڵام زۆرجاریش ئاستی نزم دەبێتەوە و گۆرانی دەبێتە هەراوهۆریا و مۆسیقاكەش دەبێتە یاری وانەكانیش دەبنە بانگەشە، ئەوسا رادیۆ بۆ رۆشنبیركردن نابێت، بەڵكو بۆ ترۆكردن دەبێت .

مامۆستا(حنا رزق)ی هاوڕێم لەساڵی(١٩٤٦)دا ئیزگەكانی قاهیرەی شیكردەوە، و بۆی دەركەوت كە ئەو ئێزگانە (٥٠٪)ی كاتیان بۆ گۆرانی ومۆسیقا تەرخانكردووە، و (٣,٦٣٪)ی كاتیان بۆ وانەی رۆشنبیری ترەخانكردووە ، فەرمووە ئەمەی خوارەوە ریژە راستەكانە، بۆئەوەی بزانین بەهای رۆشنبیری ئیزگە چییە:-

| | | |
|---|---|---|
| ١- | ٤٩,١٨٪ | بۆ مۆسیقا و گۆرانی |
| ٢- | ١٤,٢٤٪ | بۆ قورئان |
| ٣- | ٢,٣٢٪ | بۆ ئامۆژگاری ئایینی |
| ٤- | ٥,٥٢٪ | بۆ رونكردنەوەو گۆوتەی فەرمانبەرە میرییەكان |
| ٥- | ٣,٦٣٪ | بۆ وانە و شیعر |
| ٦- | ٢,٠١٪ | بۆ هەواڵەكان |
| ٧- | ١,٧٤٪ | بۆ منالان |
| ٨- | ١,٤٥٪ | بۆ وەرزش |
| ٩- | ٠,٨٧٪ | بۆ شانۆ |



ئەم ژمارانە ئەوەت بۆ دردەدەخەن كە نەتەوە سوود لەرادیۆ وەرناگرێت بە تایبەت گەر سەیری كاتی وانەكان بكەین، پیاوی زۆر رۆشنبیر نایانڵێتەوە و وەزارەتە یەك لەدوای یەكەكان تاكو ئێستاش تاقیكردنەوەی پارتایەتی لەسەر رۆشنبیری دەسەپێنن، بەجۆرێك هاوڕێیانی خۆیان خۆشەویست دەكەن و پەیوەندییان لەگەڵ نەیارانیان دەبڕن لەوانەكانی ئێزگەدا.

كۆمەڵی چاك كار رێكدەخات بەم رێكخستنەش ، كات بۆ هەموو كرێكارێك پەیدا دەكات، ئەویش دەتوانێت كاتی زۆر تەرخان بكات بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی هۆشیاری بە زانست، هەروەها پەیداكردنیشی زیاد دەبێت، هەموو كەسێكیش دەتوانێت چێژ لە رۆشنبیری وەربگرێت، بەسەردانی پێشانگە و مۆزەخانە و گەشتو گوزار و شانۆ و كتێبخانە گشتییەكان، هەریەك لەمانەش لە كۆمەڵی چاكدا بەهای رۆشنبیری گەورەی دەبێت ، ولەكۆمەڵی خراپیشدا بەهای كەمتر دەبێتەوە.

ئەو لاوەی روناكبیری و خۆ پەروەردەكردنی مەبەست بێت، هەلی هەمە جۆری بۆ دردەخسێت، لەشارێكی وەك قاهیرەدا كەم روودەدات، لە رۆژێكدا وانەیەك نەگوترێتەوە، ئەم وانانەش هەمەجۆرن، زۆربەشی بەسوودن، سەردانی یەك لە دادگاكان لەكاتی كێشەیەكی تاواندا یان شارستانییەتی هاندەرە بۆ بیركردنەوەی كۆمەڵایەتی وبۆ بەرپرسییەتێكی نوێش بەئاگامان دەهێنێتەوە.

لێرەدا دووبارەی دەكەینەوە، ئەو كۆمەڵەی پەروەردە دەكات، كۆمەڵی باشە، واتا ئەو كۆمەڵەی مۆزەخانە وپێشانگەی

تيادا بلاوو باوە، شانۆی تيادا پێشكەوتووە، ئازادی دراوە بە نوسەری رۆژنامەو نوسەری پسپۆر، بەلام كۆمەڵی دواكەوتوو ئازادی سنوردار دەكات و رۆژنامەكانی ئاستی رۆشنبيرييان نزمە، مۆزەخانەيان كەمە، ئەكتەريش بەگاڵتەجار دەزانن، رۆڵەكانيان بەكار ماندو دەكەن، و كاتيان كەم دەكەنەوە، و بێتوانايان دەكەن، ئەوسا بۆ چێژ وەرگرتن لەبيركردنەوە كات نادۆزنەوە. كۆمەڵی ئەوها ناتوانێت مرۆڤ پەروەردە بكات، و مەحاڵە رۆشنبيرمان بۆ پێبگەيەنی. ئەوە زانای ناودار هەر هيچ..؟!

لە كۆمەڵی پێشكەوتووی ئەمەريكيدا، رێگە بە زيندانيكراوەكان ئەدەن پەيوەندييان بە زانكۆكانەوە هەبێت، بخوێنن، كەچی لە كۆمەڵی ميسريدا تاكو ئێستا ئازادەكان ناتوانن بۆ زانكۆكان بچن و كاتيان بقۆزنەوە، لەكۆمەڵی پێشكەوتوو لەنێو نەتەوە ديموكراسەكاندا قبوڵيانە رۆژنامە و گۆڤار دابمەزرێت بێ سەرانە و پارەدان بەميری ، بەپێچەوانەی كۆمەڵی ئێمە و كۆمەڵی لەئێمە نزمتر.

كۆمەڵی پێشكەوتوو بايەخ بە كتێبخانە وەك خوێندنگە دەدات، لەلەندەن (٢٠٠) كتێبخانە هەيە بۆ خوێندنەوە و وەرگرتنی نوسراوە بێ بەرامبەر ، يان بەپارەيەكی زۆر كەم. چاپخانەكانی توركياش دۆلابی پڕ لە نوسراوەو گۆڤاری تێدايە بۆ خوێندنەوە ، ميری ئەمەريكاش لۆری پڕ لەنوسراوە دەنێرێتە لادێكان بۆ ئەوەی جوتيارەكان چ كات ويستييان سوودی لێوەربگرن، وپاش چەند حەفتەيەك ئەونوسراوانە بە نوسراوەی



تر دەگۆڕدرێتەوە. وشەی (شۆتۆكوا) لە ئەمەريكادا، لەوشە بەناوبانگەكانە، لەبەرئەوەی بە مانای (هەڵمەتی رۆشنبيری) دێت٠ (كۆمەڵەيەك) لەساڵی (١٨٧٠بۆ١٩٤٦) لە لادێكان وانەيان بە جوتيارەكان دەوتەوە، و دەچوونە دوورترين لادێ و چادريان هەڵدەدا، و مەييان پێشكەشدەكردن و وانەيان پێدەوتنەوەو گۆرانی و سەماو مۆسيقای هەمەجۆرەيان پێشكەش دەكردن.

گەر هاتوو بەراوردی نێوان خوێندنگە و كۆمەڵ بكەين كە چەند كاريگەييان هەيە لە پەروەردەكردندا، و گريمان كە هەردوكيان لەيەك ئاستن لە پێشكەوتندا دەبێت بڵێين:-

(كۆمەڵ ، پەروەردەی چاكمان دەكات) ، ( و خوێندنگەش چاك فێرمان دەكات). و پەروەردەكردنيش گشتی ترە لە فێركردن، و رۆشنبيريش لە خوێندنگە و زانكۆكان شێوازييە ، و بەرێسا دەڕوات بەڕێوە و زۆرجاريش سڕ دەبێت. بەلام ئەو لاوەی خۆی لە كۆمەڵدا پەروەردەبكات، خۆی ئاراستەی رۆشنبيرييەكی داهێنەر دەكات، لەبەر ئەوە ئەو لە خوێندكاری زانكۆ ئازادترە، رێسای توتيانەی دەرخستنی بەرنامەی خوێندن لە خوێندنگە و بگرە لە زانكۆش رێگری خوێندكاری ئازادە بۆ فراوانكردنی ئەو بابەتەی كە لێكۆڵينەوەی تيادا دەكات ، يان رێگری ئەو خوێندكارەيە، گەر ويستی لەو بابەتە دەربچێت، و لێكۆڵينەوەی بابەتی ديكە بكات و چێژی لێوەربگرێت.

(٣)

## بۆچی خۆمان رۆشنبیر دەکەین؟!

بۆ مرۆڤی رۆشنبیر قورسەخۆی رابگرێت، لەکاتی روونکردنەوەی ئەو هۆیانەی کەوا لە خەڵك دەكەن رۆشبنبیر بن، چونکی کە راڤەی دەکەیت، بەوە دەچێت کە فێریان بکەیت چۆن قێز لەپیسی بکەنەوە، ودوور بکەونەوە لە کێوییەتی و ئاژەڵییەتی ، وبەهای پاکی و مرۆڤایەتی و شارستانییەتیان بۆ روونبکەیتەوە کە چەند بەسوودن.

ئێمە لێرەدا بە پێویستی دەزانین، بەو لاوانە بڵێین کە هەڵاوساون لەبێکاریو لاویەتی دەبێت خۆیان رۆشنبیربکەن، بۆئەوەی گەندەڵ نەبن، و ژیانی پێگەیشتوو پێویستی بە رۆشنبیری هەیە. مرۆڤ هەن دەکرێت پێیان بڵێین مرۆڤی گۆلك. چونکی هیچ خەسڵەتێکی ژیانیان تێدا نییە جگە لە پێگەیشتنی خانەکانیان نەبێت، ئەمانە لەباری دەروونی ومرڤایەتییانەوە هەروەك گۆلك دەمێننەوە، تا خۆیان رۆشنبیردەکەن ژیانی بۆش ، تەنیایی و بێزاری لە مرۆڤدا دروستدەکات، و بەرۆشنبیریش نەبێت رزگاری نابێت، لەبەرئەوەی رۆشنبیری بایەخی بیریمان دەداتێ و ئاسۆمان فراوان دەکات.

لەبەندی یەکەمدا بە کورتی باسی خوێندنگە و زانکۆمان



کرد، کە تەنها بۆ پەروەردەکردنمان بەس نین، چونکی زانیارییەکان ئەوەندە زۆرن ، لەو دوو شوێنە جێگایان نابێتەوە، وئەم زانیارییانەش پەرەدەسەنن وپێشدەکەونو ناوەستن ، بۆیە دەبێت هەتا ماوین خوێندکار بین. هەست بە پێگەیشتنی رۆشنبیری بکەین، وردە وردەش جیاکاری بیری بکەین، ودەبێت بزانین کە ژیانی مرۆڤ کورتە و سنورداره، کەم وا دەبێت لە (٧٠)و(٨٠) ساڵ زیاتر بێت. بەڵام ژیانی جۆری مرۆڤ درێژە، ئێمەش کە لێکۆڵینەوە دەکەین، ژیانی جۆر دەگوازینەوە بۆ ژیانی مرۆڤ، و تاقیکردنەوەی هەزارەها ساڵی رابردوو دەخەینە سەر تاقیکردنەوەکانی تەمەنە کورتەکەمان، واتا ئێمە کە لێکۆڵینەوەی مێژووی مرۆڤایەتی و رۆشنبیری ئێستامان و کۆنەکان دەکەین، لەهۆی ژیان زیاتر تێدەگەین ، کەهۆی ژیانی تایبەتی خۆمان ئەوەمان تێناگەیەنێت .

یەك لە مەبەستەکانی رۆشنبیری ئەوەیە، کە لە هۆ و هێماکانی ژیان بگەین، واتا دەبێت بزانین کەئێمە ژیانێکی بایەلۆجی ناژین. وەك ژیانی ئاژەڵ ، بایی ئەوەندە زانیاریمان هەبێت، پێداویستییەکانی کەرەسەی ژیانمان بۆ دابین بکات. بەڵکو ئێمە لە ژیانێکی روحیدا دەژین ، کە ئەڵقەیەکە لەو زریزە دووروودرێژەی مرۆڤایەتی، کە ئێمە نمونەی مەبەستو ئامانج و بەها بەرزەکانین، بەوەش دەگەینە ئاستێکی بەرزی مرۆڤایەتی و بەرەنگاری مەترسییە گەورەکانیشی دەبینەوە.

سیستمی فێرکردن و پیشە، دەمانکاتە پسپۆر، فێرە هونەرێك یان پشەیەك دەبین. لەمەودای ئەم هونەرە یان ئەم

پیشەیەدا سنوردار دەژین. لێرەدا ڕۆشنبیری ئەم تەسکییە فراوان دەکات، ومێشك گەورەتر دەکات، و دڵیش خۆشتر دەکات، ئەوسا لێبوردنی مرۆڤانە، لەجیاتی دەمارگرژی نەتەوەیی دەبینین ، وبینینمان جیهانی دەبێت، لەجیاتی ئەوەی بینینی لادێ یانە بێت.

بڵاوبوونەوەی پسپۆری لەم ڕۆژانەدا، باوەڕێکی گەندەڵی لەنیو جەماوەردا چاندووە. ئەویش بەوەی زانیاری زانست و هونەر و وێژە نابێت کەس لێیان بکۆڵێتەوە جگە لەپسپۆڕەکان نەبێت. هەر پسپۆڕەو لەبەشەکەی خۆیدا، واتا پزیشك بۆی نییە، مێژوو بزانێتو نوسەریش بۆی نییە لە گەردوون بزانێت وئەندازیاریش نابێت لە کۆمەڵزانی بزانێت. ئەمەش باوڕێکی هەڵەیە، دەبێت هەوڵ بدەین نەیهێڵین. راستە ئەوەی لەزاستێکدا پسپۆڕە دەبێت زۆر لەو زانستە بزانێت، بەڵام ئەوە نابێتە ڕێگر لەبەردەم ڕۆشنبیرێك کە شتێك لە پسپۆڕییەکەی ئەو بزانێت ، وتوویژی لەسەر بکات، و ناڕاستییەکانیش بەرچاو بخات. مەبەستیشمان لێرەدا ئەوە نییە، کە دەبێت ئێمە فەرهەنگێك بین ، هەموو زانیارییەکان بزانین، چونکی ئەوە مەحاڵە، گەر واش بوو سوودی لێوەرناگرین.

زانیارییەکان لەم شارستانییەدا تێکەڵن بەیەك ، بۆنموونە ئەگەر پزیشکێك لەمیسردا ویستی لێکۆڵینەوەی کێشەی پەتا بڵاوەکان بکات، دەبێت پێشتر لێکۆڵینەوەی سیاسەتی کشتوکاڵ و پلانە ئابوورییە پەیڕەوکراوەکانی پێش (٧٠) ساڵ لەمەوبەر بکات.



خوێنەری ڕۆژنامە بۆئەوەی لەجولانەوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان تێبگات، دەبێت لێکۆڵینەوەی مێژوویی جولانەوەی پیشەسازی و هاوبەشییەتی و پێکدادانەکانی ئەوروپا کە (١٥٠) ساڵ لەمەوپێش ڕوویانداوە بکات. لەبەرئەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژانەی ئەمڕۆ لە جیهاندا بوونەتە بڵقی سەر لافاوەکان.گەر لە لافاوەکان نەگەین ، بڵقەکان هیچمان تێناگەیەنن.

گومان لەوەدا نییە کە پسپۆڕیی گرنگە، بەڵام مرۆڤی ڕۆشنبیر باوەڕی بەسنورو بەربەست نییە، و بۆخۆی هەموو زانیارییەکان بەڕەوا دەزانێت، لەبەرئەوەی هەستدەکات کە پێویستی پێیەتی، و بەهۆیەوە پێدەگات و پەردەسێنێت. پەرەسەندنیش نەك تەنها مافە، بەڵکو ئەرکی هەموو مرۆڤێکیشە.

ئێمە خۆمان ڕۆشنبیر دەکەین بۆئەوەی کەسایەتیمان گەشەپێبدەین و بیرمان پێبگەیەنین، بۆئەوەی پەرەبسێنین، ئەوسا لە (٧٠) ساڵیدا نامرین، بەهەمان ئەو ئاستە ڕۆشنبیرییەی کە لەتەمەنی (٢٠-٢٥) ساڵی، بە تەواوکردنی خوێندنگە یان زانکۆ وەدەستمان هێنابوو بەڵکو لێکۆڵینەوەی بەردەوام دەکەین، بەدرێژایی تەمەنمان گۆڕانکاری لەبیر و دەروونماندا دەکەین، بێ ئەم گۆڕانکارییانە نە کۆمەڵ نە مرۆڤ پێشناکەوێت، و بەختەوەریی کەسییەتی پێویستی بەهەست بە پێگەیشتن و گۆڕان و پەرەسەندن هەیە، و بناغەی هەموو ئەمانەش ، تێگەیشتنە کە مەزنترین جۆری بەختەوەرییە.

(١٣٠) زانست و هونەرە ئێستا لە جیهاندا هەن. کەلتورێکی مرۆڤایەتییە. زانین و هەبوونی مافی هەموو مرۆڤێکە و گەر پارەو کاتی هەبێت ئەرکیشە.( ئایینی کۆنفۆشیوسی چینی) و پشکنینەکانی( هۆرمۆنات) و (نۆیژەکانی ئەخناتون) و (سیستمی هاوبەشییەتی) و ( یاساکانی کارەبا) و (ژیانی ئەفلاتون) و (چییەتی گەردیلە)، هەموو ئەمانە مافی من و تۆیە و دەبێت بیزانین، مەحاڵە خوێندنگە و زانکۆ ئەمانەمان فێربکات لەبەرئەوەی مەودای خوێندن لەوێدا کەمە.

پەیوەندییەکی زیندوو هەیە لە نێوان بیر و رۆشنبیریدا، گەر لێکۆڵینەوە بە هەڵبژاردە و ئارەزوو بوو. بۆ نموونە ، سەیری لاوێك بکە لەتەمەنی (١٧) ساڵیدا کە بابەتی زاوزێ دەخوێنێتەوە، داوای زانیاری زیاتر دەکات، هەروەك چۆن گەدە داوای خواردن دەکات، لەبەرئەوەی پێویستییەکەی تاسەر ئێسقانە و لەقوڵایی دەروونییەوە هەڵدەقوڵێت.. یان سەیری پیاوێك بکە تەمەنی لە (٥٠) ساڵ زیاتر بێت، کە لێکۆڵینەوەی ئاین دەکات، سامانی تاقیکردنەوەکانی رابردووی وای لێدەکات، بەهێز و زیرەکی و دڵسۆزی و وردبینی زۆرەوە داوای زانیارییەکان بکات، یان سەیری بەهای رۆژنامەی رۆژانی جەنگ بکە، دەبینی هەریەك لەئێمە وەك( بسمارك) یان( گلادستون) ی لێدێت وهیچ باسێك ناکات جگە لە باسی سیاسەت نەبێت ، واش هەستدەکات کە ئایندەی ئەم جیهانە وەك ئایندەی تایبەتی خۆیەتی.

هەر هەموو ئەم بارودۆخانە وامان لێدەکەن،دەست بە



خوێندنەوە. بکەین ئەستەمە بتوانرێت ئەو کەش و هەوایە بگوازرێتەوە نێو خوێندنگە و زانکۆ، لەبەرئەوەی زۆرجار کەش وهەوایەکی ناوچەیی سنورداره .

لێرەدا بەهای خۆرۆشنبیرکردن دەردەکەوێت.

( ٤ )

## زۆربوونی کات و زۆربوونی بەرپرسییەتی

هۆی تر هەن وا لە لاو دەکەن کە خۆیان رۆشنبیربکەن، یەکەم هۆ :–زۆری کاتە و زۆربوونییەتی، لەبەر بەکارهێنانی ئامێرەکان و ئاسن وئاگرو کارەبا، ساتەکانی کاری کەمکردۆتەوە بۆدەستکەوت و لەئایندەش کەمتر دەبێتەوە ، دووریش نییە، ببینە کۆمەڵێکی پێشکەوتوو ، ئەوساکەش (٢) سات بەسە بۆ کارکردن و دابینکردنی بژێوی مرۆڤ . پاش ئەو(٢) ساتە هەموو رۆژەکە و بە بەشێکی شەویشەوە تەرخان دەکرێت بۆ حەسانەوە و چێژوەرگرتن لە بیر و لەش و گیان، لەئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێتی جاراندا ئەوە بەدیدەکرا.

لەنێو دانیشتوانی ئەمەریکادا ساڵی(١٨٦٠) شەڕێکی ناوخۆ روویدا بەهۆی کۆیلەتییەوە ، تاقمێك باوەڕی بەوە هەبوو کە مافی سپی پێستەکانە کۆیلەی رەش پێستیان هەبێت. ئەیانکرێت و بەکاریاندەهێنێت، و لە ژەمەخۆراکیان بەولاوە

هیچی دیکەی تێناچێت.

ئەم جەنگە، کۆیلەیەتی نەهێشت و ئەمەریکییەکانیش دەوڵەمەندتر بوون، و کاتیشیان زێتر بوو بەهۆی بەکارهێنانی ئامێرەوە بۆ بەرهەمهێنان، وای لە ئەمەریکییەکان کرد کە هەر تاکێك هێزی (٥٠) ئەسپی هەبێت کە بەرامبەر (١٠٠) کۆیلەیە. لەساڵی (١٨٦٠)دا هەر ئەمەریکییەك ڕۆژانە ، لە(١٠بۆ١٢)سات کاری دەکرد بۆ دابینکردنی بژێوەییەکەی. کە چی ئێستا(٦) سات کاردەکات، و لە حەفتەیەکدا(٢) ڕۆژ پشووی هەیە، لەئایندەدا بەهۆی پێشکەوتنی ئامێرەکانەوە دەبێتە(٥یان ٤) سات لەبەرئەوەی ئامێر لەپێشکەوتنی بێ بڕانەوە دایە......

هەروەها لەیەکێتی سۆڤیەتیش ، میللەت لەئازاری قەیسەرەکان ڕزگاری بوو و دەستکرا بە دروستکردنی کارگە و خەڵکیش بژێوی باشتر بوو و کاتیش زۆرتر بوو.

سەرەڕای هەبوونی سەرەتاکانی ئیمپراتۆریەت و داگیرکەرایەتی بڵاو، ئەم بارە بەسەر جیهاندا زاڵدەبێت و دەبێت ژمێرەی ئەوە بکەین کە کات زۆر دەبێت و قورساییەکی زۆر دەخاتە سەرشانی ، ودەبێت بەبایەخە ڕۆشنبیرییە زیندووەکان پڕ بکرێتەوە... ئێمەش کە باسی ئایندە دەکەین، هەست بەوە دەکەین کە دەبێت لەئێستاوە خوێندنگەکان ، خوێندکارەکانیان فێربکەن، کە چۆن ئەم کاتانە پڕبکەنەوە. لەجیاتی ئەوەی فێریان بکەن کە چۆن بژێوییان دەست بکەوێت .

بەهۆی ئەوەی بژێوی بە (٢) سات دابین دەکرێت، و ئەو گرنگییەی نەماوە، و لەبەرئەوەشە کە کرێکار لەگەڵ هەزارەها



کرێکاری دیکە تێکەڵ دەبن، و بەشێکی کەم لە کاری ئامێری دەدرێتی دوور لە توانای ماسولکەکانی، ئەوسا(٢٢) سات کاتی بێ کارمان دەبێت گەر هاتوو(١٠) ساتمان بۆ نوستن و خواردن دانا، ئەوا (١٢)سات دەمێنێتەوە، دەبێت خۆی خەریك بکات بەئاست بەرزکردنەوەی خۆی. و گەر نەزان بوو لە چۆنیەتی پڕکردنەوەی ئەو (١٢) ساتە، ئەوا هەست بە بۆشاییەکی دەروونی وبیری بێزارکەر دەکات. ئەوسا ناچار ئەو کاتانە بەیاری بێ مانا پڕ دەکاتەوە ، یان تووشی هەڵەی زیانبەخش دەبێت.

لەچەرخە کۆنەکاندا ، زۆریی کات تایبەت بوو بە خانەدان و دەوڵەمەندەکان و هەژارانیش لێی بێبەش بوون، جەماوەریش هەر هەموو هەژار بوون. بەهۆی ئامێرەوە ئەم بۆشاییە لەنێو تاکەکانی میللەتدا زیاد دەبێت.

تەنانەت جوتیارەکانیش تووشی ئەم بۆشاییە دەبن کاتێك کە واز لە ئامێرە کۆنەکانیان دەهێننو ئامێر و ماتۆڕە پێشکەوتووەکان بەکاردەهێنن، لەو سۆنگەیەوە خۆڕۆشنبیرکردن دەبێتە پێویست و ئەو کاتانەش پڕ دەکاتەوە.

هۆیەکیتر هەیە کە دەبێت خۆڕۆشنبیرکردن هەر ببێت ئەویش ئەوەیە، کە جاران توانای ماسولکەکان لە کشتوکاڵ و پیشەسازی و دارتاشیدا بەکاردەهات، کەچی ئێستا بۆتە توانای وشیاری، لەبەرئەوەی توانای ماسولکە ئەو بایەخەی نەماوە، تەنها لەکاتی یارییە وەرزشییەکاندا نەبێت، لەنێو نەتەوە پێشکەوتووەکاندا کە ئاواتمانە پێیان بگەین، کارگەکان

زۆربەیان ئۆتۆماتیکین، لەلایەکییەوە کەرەستەکان وەردەگرێت ولەلایەکی تریەوە بەئامادەکراوی دەردەچێت بۆ بەکارهێنان. هەموو کاری کرێکارەکە ئەوەندەیە کە چاودێری و سەرپەرشتی بکات.

کرێکار لەم بارەدا توانای ماسولکەکانی دەمێنێتەوە، و بەحەساوەیی کارەکەی تەواو دەکات، بۆ رەنجێکی دیکە ئامادەیە، ئەو بەکرێکارەکانی خۆمان ناچێت. لای ئێمە زۆر بەماندوویەتی کارەکەی تەواودەکات، و گەر هاتوو کاتیشی هەبوو هێزی خوێندنەوەی رۆژنامەو نوسراوەی نامێنێت.

ئێمە لەمیسردا، بەرەو ئەوبارە دەڕۆین ، واتا کار ئەوەندە ماندوومان ناکات، و ئەوەندەش کاتمان لێنابات، و بەحەساوەیی لەئیش دەگەڕێینەوە و ئامادەشین بۆ پڕکردنەوەی کات کە تەرخانی دەکەین بۆ بەرزکردنەوەی بیرو دەروون و گیانمان.

بەڕای من، هۆیەکی گرنکتر هەیە بۆ خۆڕۆشنبیرکردن، بریتییە لەوەی کە بەرپرسییەتی مرۆڤ ترسناك بووە، لەچەرخە کۆنەکاندا، ئەم جیهانە بە حوکمڕانی پادشا و فەرماندە و خاوەن دەسەلات و وەزیرەکان بەڕێوە دەچوون، کەچی ئێستاکە جیهان بەرەو دیموکراسییەت دەڕوات، تاکەکانی میللەت خۆیان دەبنە بەرپرسی راستەقینە. ئەم تاکانەش ناتوانن حوکمڕانی بکەن، گەر ئاگاداری کاروبارەکان نەبن، لێرەدا حوکمڕانی هەموو جیهانە، و خراپەکاریش وەك نەخۆشی وایە، بەش بەش ناکرێت لایەنگیر نابێت، هەروەك چۆن نەخۆشییەك لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی دیکە دەگوزارێتەوە، ئەوهاش خراپەکاری و سیاسەت



هەربەو جۆرە دەگوازرێتەوە و دەبنە هۆی روودانی وێرانی و خراپە لە هەموو جیهاندا بە جەنگ و شۆڕش وتەقینەوە.

پێشکەوتنی ئامێرەکان کەباسمان لێوەکرد، کات زۆر دەکات هەر ئەم پێشکەوتنە خۆی، مەترسی جەنگ و گۆڕانکاری زۆر کردووە، ناتوانین خۆمانی لێدووربخەینەوە، گەر هەموو تاکێك رۆشنبیر نەبێت، ونەتوانێت جیاکاری نێوان زانیاری ئاڕاستەکەر و بانگەشەی هەڵبەستراو بکات.

دەرکەوتنی مەترسییەکانی گەردیلەیی و هایدرۆجینی وادەکات خۆڕۆشنبیرکردن پێویست بێت. ئەوەی رۆشنبیریش نەبێت لە مەترسییەکانی ناگات. و جاریش هەیە لە نەزانینیەوە بانگەشەی بۆ دەکات و دەبێتە یاریدەری دروستکردنی.

گەر ژمێرەمان بۆ هەموو ئەم شتانە کرد ، دەتوانین بەڕاستی و دروستی بڵێین، خۆڕۆشنبیرکردن ئەرکێکی ئاینییە، لەئەستۆی هەموو مرۆڤێکدایە، لەبەرئەوەی مسوگەرکردنی حوکمڕانییەکی چاکە لەسەر ئەم زەوییە.

( ٥ )

## چۆن خۆمان پەروەردە دەکەین

(گرافت ئالین)ی نوسەری ئینگلیز دەیوت((دەبێت نەیەڵین خوێندنگە دەست لە پەروەردەکردنی منداڵەکانمان وەردات).

مەبەستیش ئەوەیە، کە خوێندنگە ناتوانێت مرۆڤ پەروەردەبکات، و گەر هەوڵیدا سەرناکەوێت، ماڵ و شەقام و کۆمەڵ جێگای پەروەردەکردنی راستەقینەن، ئێستا کەس گومانی لەوەدا نییە، کە خوێندنگە توانای پەروەردەکردن و دروستکردنی رەوشت و ئاڕاستەکردنی کۆمەڵایەتی و فەلسەفی کەمە. ئێمە ئەو شتانە لەدەرەوەی خوێندنگە وەریدەگرین و دروست دەبن و بەیەکەوە پێدەگەن وەك پێگەیشتنی ژیان،

گریمان خوێندنگە وەك فێرکردن پەروەردەش دەکات. خۆ هەموو مرۆڤێك وەك یەك نین بۆ هەڵی خوێندن لە خوێندنگە و زانکۆ، هەیە سەرەتایی تەواو دەکات، و هەشە بڕوانامەی ئامادەیی وەردەگرێت و ژمارەی دەرچووانی زانکۆش کەم و سنورداران.

خەریکە پەروەردە دەبێتە کارێکی فسیۆلۆجی ، لەش داوای خواردن ناکات گەر برسی نەبێت، و داوای ئاویش ناکات گەر تینووی نەبێت و ئاو و خواردنیش بەپێی پێویستی وەردەگرێت



لەو کاتەی کە هەست بە توێنییەتی و برسییەتی دەکات بەحەز هەڵیدەبژێرێت، ئەوەی حەزی لێ نەبێت ، نایەوێت.

پەروەردەش ئەو هایە، مرۆڤ کە منداڵیی رەت دەکات و دەگاتە هەرزەکاری و کە لە خۆی دەگات تواناو داهێنانی چییە، و هەست دەکات چ رۆشنبیرییەکی پێویستە ،و ئەوەندەش داوا دەکات کەبتوانی هەرسی بکات و سوودی لێوەربگرێت، چۆن خواردن پاش هەرسکردنی دەبێتە شتێکی دیکە، ئەوهاش زانیاری تێکەڵ بەدەرونمان دەبێت و چالاکی دەجولێنێتەوەو ئاواتمان بۆ زیندوو دەکاتەوە. لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە بەپێی پیویستییە دەروونییە جیاوازەکانیان، بۆیە بەفێربوون دەڵێین کارێکی فسیۆلۆجییە، لەبەرئەوەی کاریگەری لەسەر دەروون هەیە، وەك چۆن خواردن کاریگەری لەسەر لەش هەیە.

لەبەر ئەوە چاکترین کەس پەروەردەی لاو بکات، ئەو لاوە خۆیەتی. و بەپێی پێوستییە دەروونییەکانی خۆی، حەزی دەچێتە بابەتێك ، ئەم پێویستییەش وەك برسییەتی وایە، خۆی بۆ هەرسکردن و سوودلێوەرگرتن ئامادە دەکات، گەورەترین خەوشی خوێندنگە ئەوەیە، کە بابەتەکانمان فێردەکات، و زانیاریمان دەداتێ. بەڵام فێری ئەوەمان ناکات بە چ بەرنامەیەك، یان رێگایەك دەگەینە ئەو بابەت و ئەو زانیارییانەو چۆن زیادی دەکەین ، راستە هەندێك خوێندنگەی پێشکەوتوو بەزێبازی(پرۆژە) و رێگای تر، لە گرنگی پەروەردە بەئاگا هاتووەو دەستیکردووە بە چارەسەرکردنی. بەڵام تا ئەم

خوێندنگانە دەبنە باو و بڵاودەبنەوە، لاوەکانمان بەکەمتەرخەمی دەمێننەوە. لەبەر ئەم هۆیە گرنگی خۆ پەروەردەکردن دیارترە و زەقترە لەپەروەردەی خوێندنگە.

هاندەرەکانی خۆ پەروەردەکردن جیاوازن، لای لاوێك لەوانەیە بەپێویستییەکی پیشەکەی بزانێت و بییەوێت تاڕادەیەکی باش زیاتری بکات، ولای یەکێکی دیکە، حەزێکە، هەموو بیری داگیرکردووە. ولای کەسێکی دیکە لەوانەیە پاڵنەرەکە، خوێندنەوەی رۆژنامە بێت، و حەز بەوە بکات بزانێت، چین ئەو هۆیە نادیارانەی پشت سیاسەتە دیارەکان.

هەموو لاوێك لەژیانیدا، ماوەیەك هەیە لەنێوان(١٧بۆ٢٥) ساڵی، بۆ فێربوون هەست بە ئارەزوویەکی گەرم بۆ شارەزابوون دەکات، وەك(تا) وایە، جار هەیە بە خراپی ئەو ماوەیە دەقوزێتەوە، لەبەرئەوەی دایكو باوکی ئەم حەزەیان لە دەروونیدا مت کردووە، و بەئاگابونەکەیان مردار کردۆتەوە، بەڵام زۆربەیان لەو چەند ساڵە، سەرەڕای هەموو تەگەرەکان، هەست بە پاڵنەری بەهێزدەکەن بۆ ناسینی زۆربەی کێشە مرۆڤایەتیی و فەلسەفیو کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکان، لەوانەیە ئەم(تایە) رۆشنبیرییە پەیوەندییەکی فسیۆلۆجی هەبێت بە پەرەسەندن و پێگەیشتنی ئەو لاوەوە لە هەرزەکارییەوە بۆ لاوییەتی. ئەم گواستنەوەیە دوو دڵی دەکاتو دەگەڕێت بەشوێن زانیاری سێکسییەوە، دواتر ئەم گەڕان بەشوێن زانیارییانەدا فراوان دەبێت و دەبێتە بەدواداچوونی رۆشنبیری.

لەو ماوەیەدا ئەو لاوە فێری خوێندنەوە دەبێتو خوێندنەوە



دەبێتە حەزو چێژی لێوەردەگرێت.گەر لە ماوەی لاوییەتی حەز لەرۆشنبیری نەکات، لەدەستی دەدات، بەم حەزە بیردۆزی وبیرۆکەی چاکی دەستدەکەوێتو دەبنە بناغەی پێگەیشتنی بیری. دیارە زانیارییەکان وەك یەك نین، هەیە لەبیردا سستە و زاوزێ ناکات، و هەشەچوستە، پێدەگاتو تێکەڵ دەبێتو لقی لێدەبتەوە، بەتێپەڕبوونی چەند ساڵێك، پاش بەرەنگاربوونەوەی رووداوەکان کە لەگەڵ بیرماندا کارلێك دەکەن چەندین بیرۆکە کۆدەبنەوە وەك سەرەتاو باوەڕو رێباوەڕی لێدێت. ئێمە دەخوێنینەوە بۆئەوەی فراوانیان بکەین، و بەرگرییان لێدەکەین، و دەبنە پاڵنەر، و پاڵمان پێوەدەنێن بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی زیاتر بکەین.

زۆربەی خوێنەران، ئەم بیرۆکانە دەبینن، لەبیریان دروست دەبێتوپێدەگەن: ئەوسا دەبێت ئاگایان لێبێتو بە خوێندنەوەی رێكو لێکۆڵینەوەی بەردەوام فراوانیان بکەن. زۆر لاوم ناسیوە، کەلەبەر حەزێکی زۆر لە بابەتێکی زانستی لە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزیدا قووڵبونەتەوە... لاویش هەبووە، پەروەردەی خوێندنگەی کەمبووە، بەڵام لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا، تای خوێندنەوەی گرتووە، و رۆشنبیرییەکی زۆری دەستکەوتووە. بەرادەیەك ئەوانەی خوێندنگەیان تەواوکردووە نایەگەنێ... لاوی ترم ناسیوە، پەروەردەکردنی خۆی کردووە بەنەریت، لەماڵەوە کتێبخانەی چاکی داناوە، و خۆی لەو گەندەڵییە پاراستووە کە هاوڕێکانی لەبەر نەخوێندنەوە کەوتوونەتە ناوی.

باشە، لاو چۆن دەتوانێت خۆی رۆشنبیر بکات، گەر بێبەختییەکەی نەیهێشبێت خوێندێکی سەروو ناوەندی تەواوبکات...و تای رۆشنبیریش تووشی نەبووبێت، یان کە تووشی بووە، لەبەر بارودۆخی جیاواز نەیتوانیوە سوودی لێوەربگرێت.؟؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە:- لەبەرئەوەی تای رۆشنبیری سروشتییە، ئەو جۆرە لاوانە کەمن، تووشبووانی لە هەموو تەگەرەکان دەپەڕنەوە، گریمان لاوێکی (٢٠یان٢٥) ساڵی دەیەوێت بەرنامەیەکی رۆشنبیری بۆ خۆی دابنێت چی بکات؟

پێش هەموو شتێك رۆژنامەیەك سەرلەبەیانیان بخوێنێتەوە، بۆئەوەی بیری بە ئاگا بهێنێت لەرووداوە ترسناکەکان، و پەیوەندی بە کۆمەڵی جیهانەوە بەردەوام بێت، رۆژنامە پرۆژە و هەواڵ و رووداوی وای تێدایە، وا لە خوێنەری ئاسایی دەکات کە بیربکاتەوە، بێگومان رۆژنامەکان لەبایەخدان بەرۆشنبیریو هونەرو زانستو سیاسەت جیاوازن، خوێنەریش خۆی دەزانێت لەگەڵ کام رۆژنامەدا دەگونجێت.

دەبێت پاش رۆژنامەش، بەرەو گۆڤاری ئاست بەرز بڕوات و دواتریش بەرەو نوسراوە، ئێمە دەڵێین( دەبێت) بەلام راستییەکەی ، حەزی بەگەرموگوڕی پاڵپێوەدەنێت بۆ هەڵبژاردنی گۆڤارو نوسراوە بە ئارەزووی خۆی نەك بەزۆروزۆرداری.

هەر چ کاتێك ئەمەی کرد، ئەوا دەگاتە( رێگای پاشایانەی) رۆشنبیری، و ئامانجێکی رۆشنبیری بۆ خۆی دیاری دەکات



کەوەك قبیلەمان بێتو بەدوای زانیارییەکان دەگەڕێتو کۆی دەکاتەوە، لەبەرئەوەی رۆشنبیری رێبازێکی فسیۆلۆجییە، مرۆڤی رۆشنبیر ئەو جۆرو هەندەی وەردەگرێت کە لەگەڵ تواناو حەزەکانیدا دەگونجێن.

زۆرجاریش مرۆڤ دەگۆڕێت لەبەرگە رۆشنبیریەکەی دادەماڵرێ هەروەکو زیندەوەر لە قاوغەکەی خۆی دێتە دەرەوەو دەبێتە زیندەوەرێکی تەواو.

سەرەڕای هەموو باسەکانمان لەسەر زیانی پسپۆڕی، مرۆڤ بۆ ئەوەی رۆشنبیربێت، دەبێت پسپۆڕییەکی هەبێت پێش ئەوەی رۆشنبیری گشتی هەبێت، یان پاش رۆشنبیرییە گشتییەکەی، حەزی دەچێتە بابەتێك ، کاتو پارەی بۆ تەرخان دەکات، وئەم بابەتەش دەبێتە خولگەیەك(محور) بۆ کۆکردنەوەی هەموو زانیارییەکان ورێکی دەخاتو پێیدەگەینێتو لقی لێدەبێتەوە، بە گشتاندن دەستپێدەکات، ئەمە و ئەوە دەخوێنێتەوە، وەك ئەوەی پیاسە بکات، بەلام بەپسپۆری کۆتایی دێت، هەموو خوێندنەوەکانی لەچێوەی بابەتێك کۆدەکاتەوە، کە پەیوەندارە بە پیشەکەی، یان بە حەزەکانیو ئەوساکە لێکۆڵینەوەی رێکدەخات چونکە پسپۆری وای لێدەکات قوڵبێتەوە و دووربکەوێتەوە لە زانیاری سادە، و هەموو لاوێکی رۆشنبیر دەبێت لە لقێکی دیار لە زانیاری قوڵبێتەوە بۆئەوەی هەموو شتێکی لێبزانێت، هەروەك چۆن شتێك لە هەموو زانیارییەکان دەزانێت.

لەم چەرخەدا، لەبەر زۆری کێشەکان رۆشنبیری پێویستە،

گەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیش نەبێت، بۆ تێگەیشتنییەتی، لێرەدا بەهای پەروەردەکردنی دەروونی و زانینی کاروباری جیهان بە تێگەیشتن و لێکۆڵینەوەو حەز لە زانین دەردەکەوێت.

هەموو لاوێك دەبێت، بایەخێکی زۆر بداتە هەڵبژاردنی هاوڕێکانی، و دەبێت لە رۆشنبیرەکان بن و حەزیان لە خوێندنەوە بێت، تا ببنە رابەرو یاریدەدەری بۆئەوەی سوود لەیەك وەربگرن لە وتووێژە رۆشنبیرییەکانیاندا، و خراپترین رێگر بۆ رۆشنبیریی لاوێك ئەوەیە، کە هەڵیبخەلەتێنن و بەرەو گەندەڵی و جێگای رابواردنی ببەن و هاوڕێکانیش پوچ و گەماوی بن، لە جێگای ئەوەی خاوەن پەیڕەوی ئامانج بەخش و بە نرخ بن .

(٦)

## نەریت هەن رێگری رۆشنبیرین

گریمانەی ئەم نووسینەی ئێمە وابوو بۆ ئاستی تاکەکانی چیینە مام ناوەندو بەرزەکان بنوسرێ، کە رۆژی (٢) سات یان زیاتر، کاتیان هەیە، لەبەرئەوەی خۆڕۆشنبیرکردن کاتی پێویستە بۆیە دەکرا ناوی ئەم نوسراوەیە ناوبنێن، خۆڕۆشنبیرکردن بە قۆستنەوەی کات.



زۆری کات لە میسردا چێژێکی تایبەتی بۆ دەوڵەمەند و نیمچە دەوڵەمەند هەیە. فێربوونیش لە خوێندنگەو زانکۆ هەر بۆ ئەوانە، بەشێکی زۆر کەمیش لە کرێکاری هەژار کاتیان هەیە. لاوی زیرەك ئەم کاتانە دەقۆزێتەوە بۆ پەرەپێدانی کەسییەتی، و گەورەکردنی بیری و راژەی پەرەسەندنی دەکات.

لە قاهیرەدا، لاو دەتوانێت کات بەشێوازێکی رێکخراو پڕبکاتەوە، شانۆو هۆڵی وانەوتنەوەو سینەماو یانەو کتێبخانە هەن، هەموو ئەمانەش دەکرێت ئاوڕیان لێبدرێتەوە، بایەخیان پێبدرێت، بەمەرجێك بەکارهێنانیان مەستمان نەکات، و ترۆیەکانیان هەڵنەبژێرین. بێگومان شانۆ بەسوودە، بەڵام گەر شانۆگەرییەکە لەباو دەرچوو و دوورکەوتەوە لە داکەوت(واقع)، و بایەخی زۆریدا بەشەڕفرۆشتن بەمێبازی و سێکس، ئەم شانۆگەرییە کاتت دەکوژێت و دەروونت گەندەل دەکات. و لەسینەماش جار هەیە روودەدات و دەردەکەوێت چیرۆکی فیلیمەکە بێ بەها و سووکە.

یانەو چاپخانەش بەسوودن ، گەر هاتوو بەهۆیانەوە لەگەڵ هاوڕێی چاك وریك‌وپێك یەکتر بناسن بەمەرجێك بەبەردەوامی و رۆژانە نەبێت،نەبێتە هۆی فێربوونی یاری بەخت و خواردنەوە کە پارەو کاتت لێدەبات، دواتر زۆر بەقورسی لێی رزگار دەبیت.

دەبێت هەموو لاوێك رۆژانە بەشێك لە کاتی خۆی بۆ خۆڕۆشنبیرکردن تەرخان بکات و بیکاتە نەریت وچێژی لێوەربگرێت. رۆژنامەو گۆڤارو نوسراوە ببێتە هاوڕێی رۆژانەی، لەماڵەوەش ئەوشتانە لەجێگایەکی بەڕێز دابنێت.

ئەو تەگەرانەی دروست دەبن و خۆڕۆشنبیرکردن قورس دەکەن و نایەڵن ببێتە نەریت جار هەیە کەسییەتین، جاریش هەیە کۆمەڵایەتیین. کەسانی کراوە هەن حەز بەناو کۆمەڵ دەکەن زیاتر لەوەی حەز بە تەنیایی بکەن. لاوێك گەر وابوو دەبێت ناوبەناو کات تەرخان بکات بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ئاسان بۆ ئەوەی خۆی بناسێت، ئەوەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کەئەم لاوە لە کراوەییەوە بەرەو تەنیایی دەڕوات ، دەبێت ئەم لاوە هەموو کاتەکانی بۆ هاوڕێکانی نەبێت و بەئاگا بێت وەدەستبکات بە خوێندن و لێکۆڵینەوە. بابیریشمان نەچێت، مەزنترین مرۆڤی ڕۆشنبیری ئەم چەرخە (گۆتەی) ی ئەڵمانی ، زۆرکراوەبوو چێژی لە کۆمەڵ وەردەگرت، بەڵام خۆی فێرە تەنیایی کرد بە مەبەستی خوێندن و لێکۆڵینەوە و خۆرۆشنبیرکردن.

زۆر ترسناکە بۆ لاوی کراوە، چایخانە بکاتە تەنها شوێنی بۆ کات بەسەربردنی و هەموو کاتی بەدۆمینەوتاوڵە بکوژێت، واتێبگات کە بەم یارییانە ڕاژەی مرۆڤایەتی دەکات.

کەسییەتی گۆشەگیریش حەز لە تەنیایی دەکات. و خوێندنەوەی لائاسانە بەڵام بەشتی هیچ و پوچی نێو گۆڤارەکان کات بەسەردەبات ، یان تەنها هەر حەزی لە چیرۆکی پۆلیسییە. ئەم نەخۆشیەش لەمیسردا ، لەنێو کوڕو کچ و ژناندا باوە، بەهای ئەم خوێندنەوانەش لەبەهای خواردنی گوڵەبەڕۆژە و یاریکردنی دۆمینە و تاوڵە زیاتر نییە.

داوامان لەم جۆرە لاوانە ئەوەیە کە خۆیان پێشبخەن و ئاستیان بەرزبکەنەوە بە نوسراوەی بەسوود، کە خۆراکی بیریانە



و داوایان لێبکەین شەرم لە نەزانی خۆیان بکەن، بەنوسراوەی چاكوبەسوود لە هەموو بوارەکانی وێژەو زانستەکاندا. دەرگای جیهانی نوێیان بۆ بکەینەوە، کەشارەزاییان تێدانییە، واشیان لێبکەین بگەڕێن بەشوێن مەبەستیاندا لەژیان.

ئەو سرییەی کەتوشی فێرخواز و پسپۆڕان دەبێت ، وەك پزیشك و ئەندازیار لەبەرئەوەی پسپۆڕن خۆیان دووردەخەنەوە لە وێژە و مێژوو و زانستەکان. نەزانی ئەوان لەبابەتەکانی دیکەدا ترسناکی زیاترە لە نەزانی نەخوێندەوارەکان ، لەبەرئەوەی نەزانیی نەخوێندەوار ملکەچی تێدایە، کەچی پسپۆڕەکان پۆزی درۆ لێدەدەن و زیان بە کۆمەڵ دەگەیێنن.

لقەکانی ڕۆشنبیری لە کۆمەڵی ئێستاماندا لێکدراون، وامان لێدەکەن بۆ ئەوەی لەو لقەی کە پسپۆڕیمان هەیە چاك و ڕێكو پێك بین، پێویستیمان بە لێکۆڵینەوەی زۆربەی زانست وهونەرەکان هەبێت.

پزیشك پێویستی بەلێکۆڵینەوەی ئابووری هەیە، لەبەرئەوەی پەیوەندییکی توند هەیە لە نێوان هەژاری و نەخۆشیدا. ئەندازیاریی ئاودێریش لەمیسردا دەبێت لێکۆڵینەوەی نەخۆشییەکانی خاك بکات، بۆئەوەی بزانێت کە نەخۆشی (انگلستۆما)و(بەلهارزیا) جوتیار دەگرێتەوە ، وسستی دەکات، پیاوانی ئاینیش دەبێت لێکۆڵینەوەی ئەو سەرەتاییانە بکەن کە کۆمەڵی ئێستامانی لەسەر دامەزراوە، بۆئەوەی ئایین کارەکی و بەسوود بێت، نەك هەر دەرخستن و وتنەوە بێت.

ئەم مانایانەم دووبارە کردۆتەوە، تکا دەکەم خوێنەر لێم بێزار نەبێت.

(٧)

## ژینگەی خێزانی و رۆشنبیری

خراپترین باری کۆمەڵایەتی لە میسردا ئەوەیە، کە ئاستی رۆشنبیری لەنێوان ژن‌ومێرددا دەگمەنە، یان هەرنییە. جار هەیە مێردەکە خوێندەوارو رۆشنبیرەو ژنەکەشی هەر زۆرکەمی خوێندووە، و ئاشنای رۆشنبیری نەبووە بەهۆی ئەوەی لە کۆمەڵی ئێمەدا پایەی ژن کەمترە لە پایەی پیاو. هۆیەکی تریش هەیە، کەراستییەکی ناشرین‌و قێزەوەنە: ئەویش ئەوەیە کە وەزارەتی پەروەردە، دواناوەندی کچانی تا ساڵی(١٩٢٥) نەکردۆتەوە، هەروەك پێشتر باسمان لێوە کردووە.

ئەم کەمتەرخەمییە وای لە ماڵە میسرییەکان کردووە، کە تائێستا ئاشنای کتێبخانە نەبن. نوسراوە و وێنەو شتی نایاب لەنێو کەل‌وپەلی ماڵیاندا نییە، راپەرینەکەشمان لەساڵی(١٩٢٢)ەوە چارەسەرێکی کەمی ئەم بارەی کردووە. ئێستا هەزارەها خوێندکاری کچمان لەبەشە جیاکانی دواناوەندی‌و زانکۆکانماندا هەیە، واتا، ئێمە سەرکەوتوو بوین لە نەهێشتنی تاریکی سەدەکانی رابردوودا و ستەمی سەدەی بیستیش...ئەو رۆژەش دوور نییە، کە تیشکی رووناکی رۆشنبیری بێتە نێو ماڵەکانمان، و هاوسەرەکانیش هاوئاست



بن، بەیەك زمان قسەبکەن، لەسەر ئاستێکی بەرزی تێگەیشتن‌و لەیەکگەیشتن.

هەتا ژن نەخوێندەوار و نەزان بێت، یان هەر پۆلێك یان دووان یان سیانی سەرەتایی خوێندبێت، ئەوا نەیار دەبێت لەگەڵ مێردەکەی کە کات و پارە بۆ نوسراوەیەك تەرخان دەکات، و ئەو پیاوەش لەبەرباری بژێوی هاوسەری، و دووبارەکردنەوە، و سووربوون، لەکۆتاییدا دەچێتە سەرەڕای ژنەکەی و واز لە نوسراوە کڕین دەهێنێت، یان بیری خۆی سڕدەکات لەپێناوی ئاشتی نێو ماڵەکەیدا. ئەم پیاوە گەر تۆزێك رەوشتی بەپێزبا، دەیتوانی سەرکەوتن وەدەست بهێنێت بەسەر نەزانینی ژنەکەیدا.

بەڵگەنەویستە باشترین شێواز بۆئەم سەرکەوتنە فێرکردنی ژنەکەیەتی تا ئاستی بەرزدەبێتەوە و دەگاتە ئاستی خۆی. ئەم رێگایەش زۆر دژوارە، چونکی قورسە ژنێك(٢٠) ساڵ نەزان‌و نەخوێندەوار بووبێت، فێرە داب‌و نەریتی رۆشنبیری ببێت، زۆرجاریش مێردەکە هەست بە جیاوازییەکی زۆر دەکات لەگەڵ ژنەکەیدا بە هۆی ئاستی رۆشنبیرییان، تا دەگاتە رادەیەك تەنانەت جوتبوون و خواردن و حەسانەوە دەبێتە ژیانی هاوسەرییان، لەبەرئەوەی هەریەکیان ئاڕاستەیەکی بیرکردنەوەی جیای هەیە لە گفتوگۆ و وتووێژ و رەفتاردا،ونەگونجاوە لەگەڵ یەك.

ژن بەشێوەیەکی گشتی، گەر هاتوو خوێندەواریش بوو. پارەی کڕینی نوسراوەیەکی پێ زۆرە و پێشیان ناخۆشە کە

دەبینێ مێردەکەی کاتێکی زۆر تەرخان دەکات بۆ خوێندنەوەو هەستدەکات مێردەکەی کەمتەرخەمەو ئاگای لێنەماوە، و لەچەری (غیرە) لەنوسراوەکانی دەکات، و وەك هەوێ سەیرییان دەکات.ئەم بارە بەگشتی دەمێنێتەوە، تاکو ئەم دابە رەشانە بنبڕدەکرێن‌و واش بکەین کە فێرکردنی ژن‌و پیاو هیچ جیاوازییەکی نەمێنێت لە هەندو جۆردا، بەم یەکسانییەش ئاستی ژن بەرزدەکەینەوە تاڕادەیەك وەك یەك بیربکەنەوە و یەکبگرن و یەك ئاڕاستە بکرێن و لەیەك جیانەبنەوە.

تا دەگەینە ئەو ئاستە، دەبێت:- مێردەکە چارەسەری ژنەکەی بکات بەشێوەیەکی رێك وپێك و دروستکەرانە، بۆنمونە خوێندنەوەی بۆ ئاسان بکات، وبۆی روون بکاتەوە سەرەڕای ئەوەی خوێندنەوە خەریکی دەکات، بەلاّم مێردەکە زیاتر رادەکێشێت بۆ ماڵەوەو خەریکی ماڵ و منداڵ و ژن زیاتر دەبێت، و دووری دەخاتەوە لە شوێنی رابواردن‌وچایخانەو یانە و رزگاری دەبێت لە چەند خوویەکی خراپ‌و کاتیش گەر بەخوێنینەوە پڕنەکرێتەوە، بەڕابواردن پڕ دەکرێتەوە، و لەوانەشە ببێتە هۆی زیانی تەندروستی لەشی‌و دەروونی و دارایی و دەکرێت نوسراوەش بکرێتە کەل‌وپەلە نایابەکانی نێو ماڵ ، گەر هاتوو بایەخمان پێدا وشوێنی جوانمان بۆ دروست کرد، و لەبەرگمان گرتن.

ژن، لەبەر ئاڕاستە کۆمەلاّیەتییەکەی، بایەخ دەداتە کەل‌وپەلی چاك و جوان، تەگەرە گەورەکانی ئەو نوسراوانەی کە لە میسردا دەیکڕین ئەوەیە ، کە لەبەرگێکی کاغەزدایە، و زوو



دەدڕین‌و لێکدەبنەوەو نوسراوەکەش ناشرین دەبێت، و لە نێو کەل‌وپەلی ناو ماڵدا نائاسایی دەبن، و ژنەکەش لە شوێنێکی نادیار دەیانشارێتەوەو گەرهاتوو مێردەکە نوسراوەکانی لەبەرگگرت، و شوێنێکی جوانی بۆ دانانی نوسراوەکان دروستکرد و بەپاك و خاوێنی و شێوازێکی گونجاو پاراستی ، ئەوسا ژنەکە خۆی پێهەڵدەکێشێت ونابێتە نەیاری.

لەگەڵ ئەم نوسراوانەدا، وێنە وپەیکەر و گوڵدانی نایاب دادەنرێن‌و هۆڵەکەیانی پێ جوان دەکەن، ئەوجا نوسراوە دەبێتە دیمەنێکی جوان، و ژنانیش پێشبڕکێی لەسەر دەکەن، و دەشیخوێننەوە.

تاکە رێگا بۆ پیاو گەر ویستی بەختەوەر بژێت لە ماڵەکەیدا، و رۆشنبیربێت لەبیرکردنەوەیدا، و خۆی پەروەردەبکات ئەوەیە: ئاستی رۆشنبیری ژنەکەی بەرزبکاتەوە، و کەش‌وهەوای نێو ماڵەکەی لەگەڵ رۆشنبیریدا ئاشنا بکات.

گەرهاتوو رۆژنامەو گۆڤار بەرێکوپێکی‌و بەردەوام گەیشتە ناوماڵ، ئەوسا ئەندامانی ئەو خێزانە قسەکانیان لە واتەواتەوە دەگۆڕن بۆ وتوێژی سیاسەتی گشتی ولاّت‌و جیهان راستە، زۆربەری گۆڤارەکانمان قسەی پوچیان تێدایە، بەلاّم پیاوی بەئاگا دەتوانێت وتوێژ لەگەل خێزانەکەیدا لەسەرباری ترسناك بکات، ئاڕاستەیان بکات، و بەم ئاڕاستەکردنەش سود وەردەگرێت، ئەوسا سۆز و رێز پەیدادەکات‌و بەگەرمی ئاستی بیرو دەروونی بەرزدەکاتەوە بە رۆشنبیرییەکی قووڵ کە ژنەکەی

ناگاتە ئەو ئاستە، بەڵام ڕێز لەبەهایەکەی دەگرێت، و نابێتە نەیاری مێردەکەی بۆ کڕینی نوسراوەو کات دانان بۆ خوێندنەوەیان، و ئەوساکە مێردەکە دەبێتە پێشەوای منداڵەکانی.

( ٨ )

## کۆنە پەرستی نەیاری ڕۆشنبیرییە

کۆنەپەرستی ئەوە دەگەیەنێت کە بەباوەڕە میراتییە کۆنەپارێزەکان چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان بکەین، لەجیاتی بیرکردنەوەی ئازادو داهێنەرانە، لە کۆمەڵی کۆنەپەرستیاندا مرۆڤ لە ماڵی خۆیدا لەژێر کاریگەری ئەو دابونەریتانەدا دەژێت، وەك بڵێی ئەرکێکی ئاینییە، و نابێت سەرپێچییان لێبکاتو نەیاریان بێت، ئەمەش وای لێدەکات کە هەردەم لەژێر کاریگەری یاسا و ڕێسای ئەو دابونەریتە دواکەوتووانەدا بیربکاتەوە، و نابێت سەرپێچییان لێبکات، کۆنەپەرستیش هەردەم دەگەڕێتەوە بۆ ئاین ودەیکاتە پاڵپشت بۆ قەدەغەکردنی خوێندنەوەی ئەم نوسراوەیەو لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی.

بۆنموونە ، کەنیسەی کاسۆلیکی ناوی(١٠٠) نوسراوە دەردەکات کە باوەڕداران نابێت بیخوێننەوە. پێش (٣،٢) سەدە



هەمان کەنیسە فەرمانی سووتاندنی چەندین نوسراوەی دەرکردووە، و پێش چەند ساڵێك (فرانکۆ) لەئیسپانیاداو (هتلەر) لە ئەڵمانیادا، هەمان کاریان کرد. ئێمەش لەمیسردا، چەند کارێکی وامان کردووە دژی نوسراوە هاوبەشییەکان و شیوعییەکان، چەند کۆنەپەرستێك ئەم شەرمەزارییە نیشتمانییەیان پێکردین.

لەهەموو نەتەوەیەکدا، چەند تاکێك هەن باوەڕیان بەبیرکردنەوەی شێوازییە نەریتییەکان هەیە،و لە سەر ئەو نەریتە دەڕۆن و لەداهینان دەترسن، بۆ وەبیرهێنانەوە، ڕۆژنامەی(تایمس)ی ئینگلیزی، کە دەوڵەمەندەکان دەیخوێننەوە، تاساڵی (١٩١٦) و شەی سۆزەنەك( سفلس) ی قەدەغەکردبوو لەبەرئەوەی ئەم وشەیە ناوی یەك لە نەخۆشییە سێکسییە بەناوبانگەکانە، نەك خێزانە دەوڵەمەندەکان بەباسکردنی ئەم وشەیە تووشی ئەو نەخۆشییە ببن؟! و(تایمس) لەبەر خاتری خاتران دوو سەدە ئەم وشەیەی لە ڕۆژنامەکەیدا قەدەغەکردبوو!؟...

بابەتەکەمان لەم نوسراوەیەدا ئەوەیە، بۆچی کۆنەپەرستان نەیاری ڕۆشنبیریین؟.. گەر هاتوو کۆمەڵ کۆنەپەرست بوو ئەوا شانی قورس کراوە بە دابی کۆن و بۆماوە و گەر هاتوو پیاوانی ئاین کۆنەپەرست بوون( کە زۆر کات وان) ئەوا میری دەتوانێت بە کردنەوەی خوێندنگە، و قەدەغەنەکردنی بیری ئازاد، کۆنەپەرستی بگۆڕێت بە تازەگەری و ڕاپەڕاندن . بەڵام گەر میرییەکە خۆی کۆنەپەرست بوو تازەگەری و ڕاپەڕاندن لەنێو

کۆمەڵدا ڕەنجێکی زۆر مەزنی دەوێت لەوانەیە لە توانای ئەو کۆمەڵەدا نەبێت.لەبەرئەوەی تۆوی تازەگەری و ڕەشەبای ڕاپەڕاندن لەلایەن پیاوانی میرییەوە بەربەرەکانی دەکرێن، ئەم جۆرە میرییانە نەتەوە کۆنەپەرست دەکەن و دەجەنگێن دژی بیرکردنەوەی ئازاد، و نوسراوەش دەسوتێنن، و ژنیش دەگەڕێنەوە بۆ چێشتگە.

مرۆڤ بەمێشکی هەناسە هەڵدەمژێت ، هەروەك چۆن بەسییەکانی هەڵیدەمژێت، و پێویستی بە جولانەوەی بیرە، وەك جولانەوەی هەوا بۆ ئەوەی پێی تەندروست بێتو ببوژێتەوە. بۆئەوەی بیرمان پێبگەێنین، و خۆمان پەروەردە بکەین بەرۆشنبیری مرۆڤایەتی گشتی، دەبێت لە کەشو هەوایەکی ئازاددا بژین ومیرییەکی هاوچەرخ، ئازادییەکەی بپارێزێت کە باوەڕی بە گۆڕان هەبێت نەك بە وەستانوسڕبوون. ئێمەش نەگەیشتوینەتە ئەو کۆمەڵە نموونەییە بۆئەوەی دەزگای میری هاوچەرخمان هەبێتو بڵێین لە جیهاندا لە ئێمە چاکتر نییە، بۆیە دەبێت رۆشنبیرییەکی ئازاد پەروەردەمان بکات، و ڕەخنە لەنێو هەموو دەزگا کۆمەڵایەتییەکاندا ڕەوا بێت، و هیچ تەگەرەیەك دانەنێن و کەسیش دانەمەزرێنین بیری ئازادمان لێقەدەغە بکات.

میرییە کۆنەپەرستەکان، وەك ئەڵمانیا و ئیتاڵیای جاران و ئیسپانیای ئێستا(ئەم نوسراوەیە لەساڵی (١٩٥٨)دادانراوە"وەرگێڕ") نوسراوەی سوتاندو باجی زۆریان خستەسەر دەرکردنی رۆژنامەو گۆڤار، و سزای زۆر توندیان سەپاندە سەر نوسینەکانی رۆژنامەنوسان و نوسەرەکان. لەم



بارودۆخەدا لاو ناتوانێت خۆی پەروەردە بکات، چونکی نوسراوەی ئازاد نادۆزێتەوە خۆی پێ پەروەردە بکات، و رۆژنامەو گۆڤاری ئازادی دەست ناکەوێت.

مەرجی سەرەکی بۆ خۆڕۆشنبیرکردن ئەوەیە: کە لە کەشو هەوایەکی هرزیدا بژین، دانان و دەرکردنی رۆژنامەو گۆڤار بێ باج بێت، و یاساکان لە ڕاژەی ئەواندا بن، و نەبنە تەگەرە بەرامبەر دانان و بڵاوکردنەوەیان ، بەبیانوی جۆراوجۆر، وەك پاراستنی دابو نەریت..هتد. کەسیش پاساوی ئەوە نەکات لەبەرئەوەی ئەم پاساوانە سنورداركردنی بیرکردنەوەی ئازادە کە مافی هەموو نەتەوەیەکی هاوچەرخە و نابێت ئەتك بکرێت، بەڵکو مافی هەموو تاکێکە دژی نەتەوەکەی و مافی هەموو نەتەوەیەکە دژی میرییەکەی...

خوێنەر بابزانێت کە دانیشتوانی (فنلەندا) لە (٤) ملیۆن کەس کەمترە (٢٠٩) رۆژنامەو (٥٥٧) گۆڤاری حەفتانە و مانگانەیان هەیە، هەریەك لەم رۆژنامانە هێزی بونیاتدانی لەرۆشنبیرییدا هەیە، ئەم (دروستکردنە) جیاوازی نێوان نەتەوانی رۆژئاوای ڕاپەڕیوو نەتەوانی رۆژهەڵاتی دانیشتوو دەردەخات.

نەتەوەیەك کە سەرەوری وە دەست دێنێت ورزگاری دەبێت لە داگیرکەر هیچ بەهایەکی نییە، گەر هاتوو کۆنەپەرستەکانی ئەو نەتەوەیە حوکمڕانی بکەن، و بیر سنوردار بکەن، لەبەرئەوەی ستەمکارو کۆنەپەرست و داگیرکەر یەکن...

کە بەراورد لەنێوان ئەو میللەتە عەرەبییانە دەکەم کە لەژێر

دەستی داگیرکەردا بوون ، لەگەڵ ئەو میللەتە عەرەبییانەی نەیانزانیوە داگیرکەر کێیە، دەبینم وشەی(راپەڕین) لەنێو ئەو نەتەوانەدا کە داگیرکەر رەزیلی کردوون و لەهەمان کاتدا جوڵانەوەی (راپەڕین)ی تیایاندا و وروژاندووە، بەهۆی پەیوەندیکردن لەگەڵ رۆشنبیری ئەوروپایی هاوچەرخ ، بەمەش توانیویانە خۆیان لە چەند داب و نەریتێك رزگار بکەن، و پێشبکەون، و ژیانێکی هاوچەرخ بژین.

کەچی میللەتە عەرەبییە(سەربەخۆکان) تا ئێستا لەژێر کاریگەری دابەکانیاندان و خۆیان کۆنەپەرست تر دەکەن، و لەرۆشنبیری دەترسن و نازانن دەستور چییە، و باوەڕیان بە کۆیلەتی هەیە، و فێربوونی ژنانیش رەتدەکەنەوە.

خوێنەر دەتوانێت بە بەراوردێکی خێرا ، بۆی دەربکەوێت کە ستەمی رۆڵە کۆنەپەرستەکانی رۆژهەڵات کەمتر نییە لە ستەمی ژێردەستی و داگیرکەر ، بەڵکو جار هەیە خراپتریشە .

( ٩ )

## دابین کردنی بژێو و رۆشنبیری

وەك پێشتر باسمان لێکرد، چەندین تەگەرە هەن نایەڵن بەحەزی خۆمان رۆشنبیریمان دەست بکەوێت، و دابین کردنی بژێوی لە هەموو تەگەرەکان گەورەترە. (٩٠٪)ئەم نەتەوەیە، بۆ



بژێوییان، ژیانێکی دوودڵی بەسەر دەبەن. ئەم دوودڵییەش خەمیان بۆ دروستدەکات و زۆربەی کاتیان بۆ کۆکردنەوەی پارە تەرخان دەکەن، بۆ ئەوەی بژێوی خۆیان و منداڵەکانیان مسۆگەر بکەن، و ترسشیان لەئایندەیان هەردەم لەپێش چاویانە.

باوك، نازانێت چارەی کوڕەکانی چی دەبێت، و ناشزانێت پیرییەکەی خۆش دەبێت. یان ناخۆش دەبێت، بۆیە کە لەکار دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە بەمەبەستی حەسانەوە، هەموو بیرکردنەوەی لەپەیداکردندایە، و خەو بەدەوڵەمەندییەوە دەبینێت.

ئەم ئاڕاستە مادییە بۆ پوول پەیدا کردن پێش هەموو شتێك و تەرخانکردنی رەنج بۆ تەندروستی و کاتیش بۆ کۆکردنەوەی پارە. حەزی ئەو مرۆڤە بۆ خۆرۆشنبیرکردن ناهێڵێت. بۆیە زۆرکەس دەبینین، (فێ)ی پەیداکردن وایلێکردوون کە دوور بکەنەوە لە نوسراوە و قینیان لە خوێندنەوە ببێتەوە، و لای ئەوانەش هەموو کات بۆ پوول پەیداکردنە.

گومان لەوەدا نییە کە دراو لەم چەرخەدا بەهادارە. چەرخی پێشبڕکێیە، نەدار تیاید دەشێلدرێت، بەڵام نابێت کۆکردنەوەی دراو بکەینە هەوەس و فێ. لەبەر ئەوەی ئامانج لە دراو لە کۆتاییدا ، بۆ چێژ وەرگرتنە لە خانوێکی چاك و خواردن و جل و بەرگ وهتد... رۆشنبیریش بەرزترین نموونەی ئەو چێژانەیە.

زۆر ئاسان نییە بتوانین ئەو مرۆڤەی پوول پەیداکردن

سیحری لێکردووە، چارەسەری بکەین، لەبەرئەوەی وا ئاڕاستەی دەروونی کراوە ، پێویستی بەچارەسەری دەروونی هەیە، ئەو خەوتووە پێویستە بەخەبەری بهێنین، ئەو نابینایە دەبێت چاوەکانی بکەینەوە ، خۆی ئەوەندە بە پوول پەیداکردن خەریك کردووە ، رۆشنبیری لا نامۆ بووە، زۆر بێزار و لا لووت دەبێت کە باسی خۆپەروەردەکردن، و بەرزکردنەوەی کەسییەتی وفراوانکردنی بیری لا دەکەیت.

کەسی ئەوها دەبێت بە فێڵ بیرە ساردەکەی تۆزێك گەرم بکەیتەوەو لە خەو و گێلییەکەی هەڵیبسێنێت. وای لێبکەی شەرم لە نەزانینەکەی بکات، دەوروبەریش جیاوازن لە وروژاندنی بیری، زەمەنیش وەك دەوروبەرە ، توانای جیاوازە لە وروژاندنی بیردا، لەکاتی جەنگدا بەحەزێکی زۆرەوە رۆژنامە دەخوێنینەوە، و لەرۆژانی شۆڕش وئاژاوەشدا، دەربارەی ئەو رووداوانە حەزدەکەین زۆر ببیستین و بخوێنینەوە و ببینین. و لەرۆژانی گرانیو نەبوونیشدا باس هەر باسی کێشە داراییەکانەو هەوڵ بۆ تێگەیشتنیان دەدەین.

دەزانین کە دەوڵەمەندیی بۆ دڵنیابوونی تەواوە. دەوەستێت و زیاد دەبێت، بەڵام بە ئاگا دێت گەر هاتوو مەترسییەکی ئابووری هاتە پێش ، یان کارەساتێکی دارایی تووش بێت. ئەوسا لەوانەیە دەستبکات بە لێکۆڵینەوە پاش ژیانێکی دوورودرێژی پڕ لەتاریکی و نەزانی.

لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە، کە پاڵنەری بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوە، لە نیمچە دوو دڵییەکەوە هاتووە. واتا دڵنیابوون



نابێت بەردەوام بێت، ئەم دوو دڵییەش لە شار زیاترە وەك لە لادێ ، لەرۆژانی جەنگو نەبوونی زێترە وەك لە رۆژانی ئاشتیو گوزەرانی باش، و لەلای پوول پەیداکەر زۆرترە وەك لەلای ئەوەی کە مۆڵك و ماڵی بۆ ماوەتەوە و دڵنیایە.

بۆیە نابێت بژێوی قوڕقوڕاگەمان بگرێت.لەبەر ئەوەی دوو دڵی زۆر بیرکردنەوەی راستو دروست و حەز لە لێکۆڵینەوە قەدەغە دەکات، ئێمە مەبەستمان خەمو خەفەتێکی سووکمان دەداتێ، و دەروون لەم حاڵەتەدا بەرەو ئەندێشەی پێچەوانەمان دەبات و خۆشی دروستدەکاتو ئێمەش کە بیردەکەینەوە بۆئەوەیە کە ئەم ئەندێشانە رێکبخەین لەگەڵ بیرسازدا، و پشت دەبەستین بە لێکۆڵینەوە، بۆ ئەوەی چاك بیربکەینەوە و بگەینە ئەنجام.

ئەم نوقوم بووە لە پەیداکردنی بژێو، و دوورکەوتۆتەوە لەرۆشنبیری . دەبێت بیری بەئاگابهێنینەوە لەرێگای جۆری پەیداکردنەکەی کە نوقوم بووە تیایدا، بەوەی کە دوو دڵییەکی بۆ دروست بکەین، تۆزێك خەمی بۆ پەیدا بێت و وای لێبکات بیربکاتەوە و لێکۆڵینەوە بکات، بۆ نمونە گەر هاتوو بە دەوڵەمەندێکمان ووت کە پارەی زۆر کۆکردبێتەوە، ئەوا بەهای پارە دادەبەزێت، و مامەڵە بەزێر ناکرێت، و خەریکە هاوبەشییەتی لە جیهاندا وردە وردە بڵاودەبێتەوە. بێگومان ئەوا ئێمە لە وەستاوییەکەی بەئاگای دەهێنین، وای لێدەکەین بپرسێت، پارە کۆکردنەوە چ سوودێکی هەیە، گەر هاتوو وەك مارکی ئەڵمانی ساڵی(١٩٢٢)ی لێهات. لەوانەیە ئەمە وای

لێبکات لێکۆڵینەوەی ئابووری بکات، کە دەستی پێکرد وازی لێناهێنێت و کە بەئاگا دێت ئیتر ناوەستێت.

ئەوهاش بۆ ئەو کەسانەی کە هەموو کات و رەنجیان بۆ پوول پەیداکردن تەرخانکردووە ، دەبێت چارەسەریان بکەین، و ناوبەناو بۆیان روونبکەینەوە کە لێکۆڵینەوە سوودبەخشە بۆیان، و چەند پیشەکەیان فراواندەکات. و جاریش هەیە باسی مەترسی پیشەکەیان ئەکەین کە لەئایندە چی بەسەردێت. وتێیان بگەینین کە پایە و رێز لە تۆژێك رۆشنبیری پەیدا دەبێت، بەڵام بابزانن کە بەپارەیەکی زۆر پەیدا نابێت.

هەڵبژاردنی هاوڕێی رۆشنبیر، کە پێشتر باسمان لێکردبوو کاریگەرترین رێبازە بۆ حەزلێکردنی رۆشنبیری، لەبەرئەوەی رابەر گەورەترین کاریگەری هەیە بۆ ئاراستەکردن، و چۆن دەوڵەمەندانی جەنگ خۆیان بەکەلوپەلی نایابەوە هەڵدەکێشن، ئەوهاش مرۆڤ خۆی بە هاوڕێی رۆشنبیرەوە هەڵبکێشیت، ئەوجۆرە هاوڕێیانە دەتوانن ئاراستەیان بکەن بۆ فێرکردنی خۆیان و خێزانیان.



( ١٠ )

## رۆشنبیری چی یە؟

رۆشنبیری ئەوەیە کە بیری پێدەکەینەوە، شارستانییەتیش ئەوەیەکە کاری پێدەکەین، بەڵام ئەم پێناسە ورد نییە، بۆ نموونە، راستە زانیاری من لە وزەی کارەبا کە بەکاردێت بۆ رووناکی و جوڵانەوە و رادیۆ و سینەما و گەرمکردن و چارەسەری تیشکی هتد... ئەم زانیارییانە لای من رۆشنبیرییە، لەبەرئەوەی من بەدەستی خۆم ئەم ئامێرانە بەکارناهێنم، هەموو پەیوەندییەکی من لەگەڵیان، زانیارییەکی بیرییە، بەڵام ئەندازیاری کارەبا،بەرۆشنبیریی و شارستانییەتی چاکیان دەناسێت، لەبەرئەوەی ئەو لە یەك کاتدا بیری لێدەکاتەوە و کاری پێدەکات.

لە کۆمەڵی نموونەییدا، گەر هاتوو پێی گەیشتین، لە زۆر رووەوە رۆشنبیری و شارستانییەتی دەبنە یەك شت ، لەبەرئەوەی هەموو کەسێك فێر دەبێت وئاستی بەرزدەبێتەوە، ئەوسا شتی زۆر ئاست بەرز نامێنێت لەنوسراوەکاندا بیخوێننەوە، بەڵام لەژیاندا ئەیانبینێت.

بۆ نموونە، سەیری مۆزەخانەکان بکە، سەدەها وێنەو پەیکەریان تێدایە، جەماوەر لە دەرگاکانیەوە دەچنە ژوورەوە و

پاسەوانەی لێیە، چێژ لەو هەموو ڕەنگە هونەرییە جوانانە وەردەگرن، پاش ئەم چێژە ڕۆشنبیرییە، دەگەڕێنەوە ماڵەوە، نە وێنەی لێیە، نەپەیکەر. لێرەدا ڕۆشنبیری جیاوازە لەگەڵ شارستانییەتی یەکەمیان لە مۆزەخانەدایە، و دووەمیشیان لە ماڵدایە.

کۆمەڵی نموونەیی ، هەموو ماڵێك دەکاتە مۆزەخانە، شارەکەش بەشەقامەکانیشەوە بە وێنە و پەیکەر و تەلاری جوان دەرازێنێتەوە و ئەوساکە ڕۆشنبیری خۆی دەبێتە شارستانییەتی.

بەڵام ئێمە لەم چەرخەدا لە هەژاری هونەریدا دەژین. هیچ لە هونەر نازانین جگە لە وێنە فۆتۆگرافییەکانی نێو نوسراوەکانو مۆزەخانەکان نەبێت، باسیان لێوە دەکەینو وتوویژ لەسەر بابەتەکانیان دەکەین، هەر وەك هەژارێك کە لە نیسکێنە زیاتر هیچی دیکەی نەخواردبێت. بەڵام باسی ئەو هەموو خواردنە ئاژەڵی و سەوزەییە بکات کە لەسەر مێزی دەوڵەمەندەکان دادەندرێت؟!.

ڕۆشنبیری، ئەو کەلتورە مرۆڤاتییەیە کە بە (٥٠) هەزار ساڵ بۆمان پێکهاتووە، واتا لەو کاتە کە ئاگر دۆزرایەوە. دەبێت لێی بزانینو بەلێکۆڵینەوە تێبگەین، واتا دەبێت مێژوومان و مێژووی ئەم زەوییەش کە لەسەری دەژین، و مێژووی نەتەوەکان، لە چینەوە بۆ فنلەندا، و لە ئۆگەنداوە تاکو ئەڵمانیا بزانین.و دەبێت ئاشنای زانستو وێژە و ئایینەکان ببین، ئێمە بەم لێکۆڵینەوانە بیرکردنەوە ڕەت ناکەین ، ڕاستە بیرکردنەوەمان کار



لەشارستانییەت دەکات، بەوەش دەگەینە وتەکەی( سۆکرات) کە فەرموویەتی:-(( من هەر خەڵکی ئەسینا نیم ، بەڵکو جیهان نیشتمانمە)).

ئەو زانیارییانەی کە کۆی دەکەینەوە بۆ ئەم بیرکردنەوەیە، جیاوازە لەو زانیارییانەی کە ئەندازیارێکی کارەبا کۆی دەکاتەوە بۆ ڕاکێشانی هێڵی تەلەفۆن، یان بۆ ڕوناککردنەوەی ماڵێك. دەبێت بزانین وبڵێین:-ئەم جیاوازییە لە پلەدایە نەك لە جۆردا، لەبەرئەوەی کۆمەڵی نموونەیی کۆمەڵی جیهانییە، گرنگی بە هەموو کاروباری جیهان دەدات، نەك هەر گرنگی دان بە کاروباری وڵاتێك.ئەوساکە هەموو ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی دەبێتە کەلتورێکی گشتی، هەموو دانیشتوانی سەر ئەم زەوییە چێژی لێوەردەگرن، و ڕۆشنبیریش دەبێتە شارستانییەتی.

لەم چەرخەدا کەم هەیە لەئێمە، بگاتە ئەو پلەیە. شارستانییەتیەکەیان ڕۆشنبیرییان بێت و ڕۆشنبیرییەکەشیان شارستانییەتییان بێت، مەبەستم ئەوانەن کە خۆیان گۆڕی و پەرەیان سەندو بەرژەوەندی خۆیان و بەرژەوەندی مرۆڤایەتی وەك یەك دەبینن، ئاینیان بۆ پەیدابوو وێژدانیشیان پەروەردە کرا، تا وایان لێهات بەدڵیان بیربکەنەوە، و بەمێکشیان هەست بکەن، بایەخ بە جیهان دەدەن بە هەمان ئاستو ڕادەی بایەخدانیان بە بەرژەوەندی خۆیان و ماڵیان و نیشتمانیان، سەیری نەهامەتە ئابوورییەکانی هیندو چین و میسر دەکەن، لەڕوانگەی تابلۆیەکی مێژووی جیهانیدا. دەگەنە ئەوەی کەپەرەسەندن بیرسازێکی داهێنراوە لەگەڵ دەوروبەر

دەگونجێت، و کۆمەڵێك باوەڕ و بیرۆکەی کۆن نییە، کە دەگەینەئەم پلەیە، دەژین و بایەخدانی زیندوو پەیدا دەکەین، کە ویژدانمان بە ئاگا دەهێنێتو بیرمان دەوروژێنێت بۆ بیرکردنەوە. و کە دەگەینە ئەو بارە لە جیهاندا دەژین و پێشی دەوڵەمەند دەبین و جیهانیش دەبێتە هی خۆمان ، چالاکی دەکەین و پەروەردەی دەکەین وەك باخچەیەکی بچوکی تایبەتی ماڵەکەی خۆمان.

ئەفلاتوون دەیگوت: گەر پیاوە چاکەکان گوێ نەدەنە کاروبارە گشتییەکان، لەبەر کەمتەرخەمییەکەیان بەوە سزا دەدرێن کە ملکەچ دەکرین بۆ حوکمڕانی پیاو خراپەکان.

گوێدان بە کاروبارە گشتییەکان پێویستی بەرۆشنبیری گشتییە، لای مرۆڤی پێگەیشتوو کاروباری گشتی لەم چەرخەدا، کاوریاری جیهانە، لەبەرئەوەی جیهان هاوبەند بووە بە جۆرێك، خراپەکاری لەچین دەگوازرێتەوە بۆ میسر، وەك چۆن میکرۆبێك لەشارێکەوە بۆشارێکی دیکە دەگوزارێتەوە.

خۆپاراستنی گشتی لە خراپەکاری و نەخۆشییەکان بەش بەش ناکرێن. رۆشنبیری گشتیش ئەم پاراستنەمان بۆ مسۆگەر دەکات.

بۆ ئەوەی ویژدان و لەش و بیرمان بەئاشتی بژیت، دەبێت رۆشنبیر بین، هەوڵی رۆشنبیرییەکی جیهانی بدەین بۆ ئەوەی شارستانییەتێکی جیهانی بدۆزینەوە .



( ١١ )

## بەهای رۆشنبیری و مەبەستەکانی

لەم بەندەدا، بەهای رۆشنبیری و مەبەستەکانی سنوودار ناکەین، لەبەرئەوەی لە هەموو بەندەکانی تری ئەم نوسراوەیەدا باسی ئەو دوو بابەتە کراوە، ئێمە لێرەدا مەبەستمان، چەند لایەنێکی زەقی ئەم دوو بابەتەیە.

رۆشنبیری، بەهایەکی کۆمەڵایەتی و جیهانیو مرۆڤایەتییە، ئەو نەتەوەی رۆشنبیرییەکەی وەستاو بێتو بووبێتە ڕێسا و ڕێباز، کۆمەڵەکەی وەستاو دەبێت و بۆ پێشکەوتنیش سست دەبێت، ئەمەش لە سەدەکانی ناوەڕاستدا روویدا. بەڵکو ئێستاش لە کن چەند نەتەوەیەکی ئاسیاو ئەفریکا بەردەوامە. دەوروبەری کشتوکاڵی ، ئەوانەی کە کاری تێدادەکەن و ئەوانەی سوودی لێوەردەگرن هەست بە پەککەوتوویی دەکەن، لەبەرئەوەی لەو دەوروبەرە نازانن کە ڕێگای نوێ هەیە بۆ پەرەسەندن ، ئەم پەککەوتوییە سرپییەك لەنێو رۆشنبیری و شارستانییەتی پەیدا دەکات، و لە دەوروبەری کشتوکاڵیدا، لە رۆشنبیرییەکی سادەی ئاینی لاساییکەرەوە، و نەریتی و ڕێبازی زیاتر هیچی دیکە بەدیناکەیت.

بەڵام ئەو نەتەوەی کە بازرگانی دەکات، مەبەستمان بازرگانی جیهانییە، کە بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی دوور دەکات، سەرەڕای ئەوەی کە لە کشتوکاڵدا کار دەکات، تێکەڵبوونی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی دیکە، نەتەوە بەئاگا دەهێنێت و ڕۆشنبیرییەکەشی زیندوو دەکاتەوە.

کەلەسەدە تاریکەکانی ئەوروپا(٥٠٠بۆ١٠٠٠) ی.ز ، رادەمینێن، دەبینین بەرەو ڕۆشنبیری دەگەڕانەوە، پاش ئەوەی کە لە ڕۆژگارەکانی ڕۆمان بازرگانی جیهانی بوون. بەبازرگانی لەئاسیا وئەفریکا و ئەوروپا بەردەوام بەئاگا دەهاتن.

بەڵام کە وازیان لەبازرگانی هێنا وگەڕانەوە بۆ لادێکان ڕۆشنبیرییەکەیان بووە ڕۆشنبیرییەکی کشتوکاڵی ئاینی.

ئەوەی لەبازرگانی زیاتر وریایی ڕۆشنبیری بەدەست دێنی پیشەسازییە، لەبەرئەوەی هونەر و زانستی هەمەجۆرە، لەم چەرخەدا دەتوانین بڵێین : نەتەوە پێشکەوتوو و ڕۆشنبیر نابێت، گەرهاتوو نەتەوەیەکی پیشەسازی نەبوو. خوێنەر با خۆی، جیاوازی نێوان نەتەوەیەك بکات کە بارزگانی بەگەنم و جۆ دەکات ،و نەتەوەیەکیش کە بازرگانی بەدروستکردنی ئۆتۆمبیل و رادیۆو هتد... دەکات. کامەیان ڕۆشنبیرییەکەی و زانیارییەکەی فراوانترە. لەکام نەتەوەیان زانستی کیمیا وفیزیا و میکانیك و کارەبا دەدۆزیتەوە؟...

بێگومان ئەم زانستانە، نیشتیمانەکەیان لەنێو نەتەوە پیشەسازییەکەیە، تاکە چەك بۆ نەتەوە داگیرکەرەکان بۆ حوکمڕانی میللەتێك، ئەوەیە کە نەهێڵن پیشەسازی بگاتێ و هەر



بەکشتوکاڵی بیهڵێتەوە، ئازادی بیر لە دەوروبەرێکی پیشەسازیدا پەرەدەسێنێت. لەبەرئەوەی بناغەکەی، داهێنان و دۆزینەوە و زانیارییەکانە، کەچی لە دەوروبەرە کشتوکاڵییەکان وەستاو و مردووە، لەبەرئەوەی ئامێرکانی داب ونەریتی سوونەتو باوەڕە.

ئەمانە هەر هەمووی قسەی گشتی بوون لەسەر ڕۆشنبیری، حەزمان دەکرد فراوانتربوونایە، بەڵام مەبەستمان لەدانانی ئەم نوسراوەیە ئەوەیە. کە ئاڕاستەیەکی کارەکی لاو بکەین بۆ خۆڕۆشنبیرکردنی. بۆیە ئێمە سوودەکانی ڕۆشنبیری بۆ ڕووندەکەینەوە، بۆئەوەی ئەم سوودانە پاڵنەر و هاندەری بن بۆ لێکۆڵینەوە و کڕینی نوسراوە، ئێمە مێشکمان ڕۆشنبیردەکەین بۆئەوەی تەمەنی بایەلۆجیمان بگەیێنینە تەمەنی جیولۆجی، واتە ئەو تەمەنەی کە لە(٧٠یان٨٠) ساڵ زیاتر نییە، بەلێکۆڵینەوە دەگەڕێتەوە، و بەیەك ملیۆن ساڵ دەچێت. ڕۆشنبیر لێکۆڵینەوەی مێژووی مرۆڤایەتی و پێش مرۆڤایەتیش دەکات، و دەزانێت ئەو پەرەسەندنانەی بەسەر زەوی و ڕووەك و ئاژەڵدا هاتوون چین، ئەم لێکۆڵینەوانە کە تا ژیان ماوە ناوەستین بەپیرۆزییەکی ئاینی دەچێت، و حەزێکیشە لە خێر وپێشکەوتن، و سەیرکردنێکی گەشبینانەی ئایندەیە، و هەستێکە بەهاوکاری مرۆڤایەتی و ڕێزگرتنە لە هەموو ژیان.

هەروەها بە لێکۆڵینەوەی کێشەکانی جیهان مێشکمان ڕۆشنبیردەکەین و دەگەینە (بیری گشتی)و بەشداری تێدادەکەین، بەلێکۆڵینەوە جیاکاری نێوان ئەو کێشانە دەکەین و

هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدەین، و بۆ گۆڕانی کۆمەڵ تێدەکۆشین تا نەخۆشی و هەژاری و جەنگ ونەزانی و دەمارگیری نامێنێت، ئەم (بیری گشتی) یە مرۆڤانەمان دەکات، بایەخ دەدەینە ئەو شتانەی کە لەنیۆیۆرك و پەکین و بۆمبای و قاهیرە و پاریس هەن، و وا لە هەر مرۆڤێك دەکەن مرۆییانە بیربکاتەوە.

ئەم لێکۆڵینەوانە کەسیەتییەکی پێگەیشتوومان دەداتێ، و ناتوانیت کەسێکی پێگەیشتوو بیت گەر لە لێکۆڵینەوەدا بەردەوام نەبێت، و بیرت بە زانیارییە نوێیەکان نەگۆڕێت کەزانستەکانت دەدەنێ.

خۆ رۆژێك دێت و پیر دەبێت، لەم جیهانەدا یەك شت هەیە لە مردن خراپتر بێت، ئەویش پیرێیتی و پەککەوتوویی نەخۆشی و بێجووڵە و سڕییە، چاکترین شێوازیش بۆ ئامادەبوون بۆی، رۆشنبیرییەو دەبێت هەریەك لە ئێمە رێگا خۆش بکات بۆ ئەوەی پاش (٦٠) ساڵی لەسەری بڕوات، گەر لەلاویدا بایەخمان دابێتە رۆشنبیری، و لێکۆڵینەوەش باو بووبێت لامان، ئەوا لە پیریدا بەمێشکێکی پڕ و کراوە پێشوازی لێدەکەین، دەیان بایەخدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەلسەفی و زانستی و ویژەییان هەیە، و لەوانەیە رۆشنبیرییەکەشمان پێگەیشتبێت و بووبێتە کار و تێکۆشان و ژیانی پیریمان نوێ دەکاتەوە، نەتەوەش بەچالاکی پێگەیشتوو نوێ دەبێتەوە.

چەند خۆشیشە لە پیریدا پاش(٧٠) ساڵی کە سەیری پێڕستی ژیانی دەکات کە چەند لێکۆڵینەوەی کردووە و چەند



تێکۆشاوە، تا ئەم کەسیەتییە پێگەیشتووەی پەیدا کردووە، کە بریتییە لەسەروەرێیکی گیانی و چێژ وەرگرتنێکی هونەری.

چەند ناخۆشیشە یەك لە ئێمە، پیری بە نەخۆشی و نەزانی و سڕی بەسەربێت، ئەڵێی پەیوەندی لەگەڵ جیهاندا پچڕاوە، لە(٦٠) ساڵیدا لە کارەکەی خانەنشین دەکرێت، وا دەزانێت کە لەهەمووژیان خانەنشین کراوە. لەراستیدا، مردووە و درەنگ دەینێژن، لەبەرئەوەی لەلاویدا خۆی رۆشنبیر نەکردووە، و بایەخدانی زیندووی لە دەروونیدا نەچاندوە، بۆ ئەوەی ببێتە خۆراکی لەپیریدا و سۆزی زیندوو بکاتەوە وبیری بەئاگا بهێنێتەوە.

(١٢)

## مرۆڤی رۆشنبیر کێیە؟

سەرۆك(ولسۆن) پیاوێکی رۆشنبیر بوو لێکۆڵینەوەی نوسراوەی زۆری کردبوو، و بەئاگابوو. سەرۆکی زانکۆی(برنستۆن)بوو، رۆشنبیری بۆ لاوەکانی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رێکدەخست، دواتر لە ساڵانی جەنگدا بووە سەرۆك کۆمار، زۆر هەوڵی بۆ ئاشتیدا، بەڵام ناچار تووشی جەنگ بوو. کە جەنگ تەواو بوو یان پێش ئەوەی تەواو بێت(١٤) مەرجەکەی دانا، کە چارەنووسی نەتەوە بچووکەکان

**یەك لەوان بوو... و ئەم مەرجەش لە جوڵانەوەکەی ساڵی(١٩١٩) بۆ ئێمە سوودی هەبوو.**

**کاریگەری سەرۆك( وڵسون) لە دامەزراندنی (عصبة الامم)دا زۆر بوو بەڵکو یەکێك بوو لە داهێنانەکانی بیرە بەپیت و رۆشنەکەی.**

**گەر سەرۆك (وڵسۆن) لەسەر رۆشنبیری قسەی کردبا، چی‌یە و چۆن دەبێت، و مرۆڤی رۆشنبیر کێیە، ئەو تەنها وەك پیاوی پێنووس و کاغەز قسەی نەدەکرد، بەڵکو وەك پیاوی سیاسی جیهانی، و شارەزایەکی جیهانی دەهاتە گۆ، رۆشنبیرێکی بەرهەمداربوو، رۆشنبیرییەکەی مرۆڤانەتری کردبوو. هەموو جیهانی بە نیشتمانی خۆی دەزانی، و هەوڵی زۆری بۆ ئاشتی دەدا،و پارێزگاری لەنەتەوە بچووکەکان دەکرد.**

**گەرهاتوو تاقیکردنەوەکانی رابوردووی، و نوسینەکانی لە زانکۆو(١٤) مەرجەکانی (عصبة الامم) مان کردە پێوانە بۆ ئەو مەزنە. ئەوا جوانترین نموونەی پیاوی مەردو رۆشنبیرە وهەڵە ناکەین گەر پێی بڵێین: پیاوێکی بەشەرمە.**

**سەرۆك (وڵسۆن) چوار مەرجی بۆ رۆشنبیر داناوە:-**

**١- مێژووی جیهان، لەسەرەتای گەردوونەوە، و دروستبوونی شارستانییەت و تاکو ئێستا ، بزانێت.**

**٢- مێژووی بیرۆکە بڵاوەکانی ئێستا بزانێت، کە لەم چەرخەدا لەسەر سەرەتاکانی دەڕۆین.**

**٣- زانستێك لە زانستەکان بزانێت بەو مانایەی کە بەزمانە ئەوروپییەکان پێدەڵێن(Science).**



**٤- زمانێك بزانێت و چاکترین زامنیش ئەو زمانەیە کە پێی پەروەردە بووە.**

**دکتۆر(وڵسۆن) ئەم چوار مەرجەی بۆ مرۆڤی رۆشنبیر داناوە، لەوانەیە هەریەك لە ئێمە ئێستا لە خۆی بپرسێت: ئایا من رۆشنبیرم؟ یان تەنها یەك دوو مەرجم تێدایە؟...**

**جا هەیە دەپرسێت بۆچی ئەم (٤) مەرجە ؟... بۆچی (١٠) یان (٧) نییە؟...**

**وەڵامەکەی ئەوەیە، دکتۆر (وڵسۆن) گرنگتری پێش گرنگ هەڵبژاردووە، و بناغەی پێش دیوار هەڵبژاردووە، و گشتی پێش تایبەت داناوە، و دەتوانین گرنگی ئەم (٤) مەرجە بەراڤەکردنێکی کەم روونبکەینەوە:-**

**ئەوەی سەرۆك (وڵسۆن) داوای دەکات ئەوەیە، کە ئەم رۆشنبیرییە بەرهەمدار بێت، بەم (٤) مەرجە سنووردراری کردووە، واتا ببێتە مرۆڤێکی زۆر چاك و مرۆڤانە لەم جیهانەدا، بەبیرە روناکەکەی پێشانی بدات، و لەسەرەتاکانی شارستانییەتی نوێ تێبگات، و نەیاری پێشکەوتنەکەی نەبێت، بەڵکو ببێتە ئەندامێکی کاریگەری پێشکەوتنەکەی.**

### مەرجی یەکەم:

**مرۆڤی رۆشنبیر دەبێت مێژووی جیهان بزانێت، چۆن یەکەم ژیان دەستیپێکرد، و بەرەبەرە پەرەی سەند، و جۆرەها رووەك و ئاژەڵ پەیدابوون، بەشێکیان فەوتان وەبەشێکیان مانەوە، و لەپەرەسەندندا هەندێکیان رادەپەڕین و ئەوەی تریش هەرەسی دەهێنا، تا مرۆڤ پەیدابوو و چۆن زاڵ بوو بەسەرئەوانی دیکەدا**

هەتا دەگاتە ئەوەی کەشارستانییەتی یەکەمی لەسەر رووباری (نیل)ی پیرۆز دامەزراند.

دواتر چۆن شارستانییەت دروست بوو و پەرەیسەند، و چەند لەژێر ستەمی قەشە و زۆردار وجەنگ و نەبوونی ونەخۆشیدا ناڵاندی، و بەهۆی ئەوانەوە مرۆڤی یەکەم زانی کە ویژدانی هەیەو خۆشەویستی بۆ دایکی و ژنی و منداڵی فراوانبوو ، وایلێهات کە هەموو مرۆڤێکی خۆشبوێت.

پێویستە لەسەر ئەوەی لێکۆڵینەوەی مێژووی جیهان دەکات، هەست بکات کە خۆی کوڕی ئەم جیهانەیەو گشت مرۆڤەکانیش بران، و جەنگیش کەتن و تاوانە، مێژووی جیهان بیرۆکەی پەرەسەندنمان دەداتێ و دواتر هەرەسی پەرەسەندنمان پێشاندەدات ، لەبەرئەوەی ئەم جیهانە قەت لەیەك باردا نەبووە، هەر لە گۆڕاندابووە و دەبێت ئەم گۆڕانەش بەردەوام بێت.

مێژووش دڵنیامان دەکات بەو چاکە و خێرەی کە لە دەروونیە مرۆڤدا هەیە، و گۆمانمان لا دروستدەکات لەسەر سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی چەرخە تاریکەکان کە چەندین جار کۆتاییان هات، کێ ناڵێت ئێستا خەریك نییە بگەڕێنەوە بۆ ئەو چەرخە تاریکە؟ بۆیە کەمترین شتی لێبزانین هێمایەکانییەتی.

دەبێت مێژووی جیهان بزانین و جیاکاری نێوان سەروەری(باوەڕی حیزبی) و سەروەری(رای و تووێژ) بکەین.

یان جیاوازی نێوان ئەو زانیارییانەی کەلەسەر ژینگە بنیات نراون، لەگەڵ ئەو باوەڕەی کەلەسەر (تسلیم) بوون بنیاتکراوە بکەین.



لێکۆڵینەوەی مێژووی جیهان، خەسڵەتە شارستانییەتیە یەك لە دووییەکەکانمان بۆ دەردەخات، و رەسەن و پێشکەوتووەکانمان پێشاندەدات، تا دەگاتە شارستانییەتە پیشەسازییەکەی ئێستامان.

**مەرجی دووەم:**

مرۆڤی رۆشنبیر دەبێت مێژووی بیرە سیاسی یان زانستییە بلاوەکان بزانێت،ئێمە لەم چەرخەدا، بەهێزی راکان دەڕۆین، پلان و ئامانجی بۆ دادەنێن. بۆیە دەبێت مێژووی ئەو رایانە بزانین، و چەند رەنجی بۆ دراوە بۆ وەدیهێنانی و چین ئەو هێزە نادیارانەی کە دەیبزوێنن؟....

ئێستا را و بیرۆکەی دیموکراسی هەیە، چۆن و کەی و لە کوێوە هاتەکایەوە...؟و بەهای چییە..؟و ئایا دەبێت بمرێت یان بژێت؟.. بەهای جولانەوەی بیر چییە؟... لێبوردنی ئاینی چییە؟... دەستورچییە؟..و چەندین را وبیرۆکەی دیکە، کە بۆ وەدیهێنانی، چەندین رووباری خوێن رژاوە..و ئایا ئەو رەنجانە باش بوو و راژەی مرۆڤایەتییان کرد؟...گەر وایە، ئەوە دێنێت بایەخی بدەینی و رەنج بدەین بۆ مانەوەی یان وازی لێبهێنین بۆ زۆردار و کۆنەپەرستو سڕەکان ، بۆئەوەی لەسەر تابلۆی مێژووی مرۆڤایەتی بیسڕنەوە؟!

را و بیرۆکەکانی نێو شارستانییەتی ئێستامان لەژماردن نایەن؟، بۆ نموونە باوەڕمان بەبیرۆکەی زانکۆ هەیە بۆ فێربوون ، و باوەڕمان بە بیرۆکەی هاوکاری نێوان کرێکاران و هەوروەها بەبیرۆکەی سەندیکا هەیە، باوەڕمان بە ئازادی ژنان هەیە، و

باوڕەمان بەبیرۆکەی مافی چارەنوس هەیە، کە بەپیترین و بەرهەمدارترین بیرۆکە دادەندرێن.

**مەرجی سێیەم:**

مرۆڤی رۆشنبیر دەبێت یەك لە زانستە نوێیەکان بزانێت، لەبەرئەوەی شارستانییەتە پیشەسازییەکەی ئێستا کە لەجیهاندا هەیە، پشت بە بناغەیەکی بەهێزی رۆشنبیری دەبەستێت، کە لە لایەکەوە گازی ژهراوەی دۆزییەوە، و لەلایەکی دیکەوە کۆتاڵ و پەینی دروستکراوی دۆزییەوە بۆ دابینکردنی جلوبەرگ و خواردن ، واتا شەڕو فەڕە. لە هێماکانی ناگەین گەر یەك لە زاتستەکانمان نەزانی ، چاکی زانست لەوەدایە کە دەتوانین بیپێوین، جا ئەگەر پێوانەکان بەمەتر یان بەگرام یان بە لیتر بوون. ئەوەی نەپێودرێت و عەقڵ نەیگرێت زانست نییە، هیچ پیشەسازییەکی ئێستا نییە، زانست داگیری نەکردبێت وسوودێکی فراوانی پێنەگەیاندبێت.

ئێمە زانست لە مەنجەڵی چێشت، و لەئامێری مایکرۆفۆن، و لەسەوزبوونی قەرسیل و لەشیکردنەوەی تیشکی ئەستێرەیەکی دوور، و لەتەندروستی منداڵ، و لەدروستکردنی فڕۆکەدا دەبینین.

ئەو مرۆڤەی بایەخ بداتە رۆشنبیری زانستی، لە دەروونیدا هەوەسی زانستی دروست دەبێت پشت بەپێوانە و تاقیکردنەوە دەبەستێت، تەسلیم بەبیری رووت نابێت، لەبەرئەوەی تەنها باوەڕ بە بیرکردنەوە ناکات ، بەڵکو بەدەستیشی تاقیدەکاتەوە، لەبەرئەوە بەبیر و دەستی بیردەکاتەوە، لەبەرئەم هۆیە باوەڕ بە



چیرۆکی جنۆکە، و نزاکردنی گیان و خوێندنەوەی لەپی دەستو دەموچاو ناسین وسەیرکردنی بەخت ناکات، بەڵکو ئەو نازانێت چۆن گوێ لەم چیرۆك و ئەفسانانە بگرێت، لەبەرئەوەی هەوەسە زانستییەکەی بێزار دەکات و ئەم شتانە لای ئەو تڕۆیە، ئەو مرۆڤەی یەك لە زانستەکان نەزانێت مافی چارەسەرکردنی لێکۆڵینەوەی نییە، لەبەرئەوەی بە گیانێکی نەزانانە چارەسەریدەکات و خۆی لە مەترسییەکانی دووردەخاتەوە و پشت بەو دەرئەنجامانە دەبەستێت کە تاقیکردنەوە نەیسەلماندووە.

**مەرجی چوارەم :**

مرۆڤی رۆشنبیر دەبێت زمانێك بەشێوەیەکی رۆشنبیرانە بزانێت، و زمانی زگماکی لە هەموو زمانەکانی تر باشترە، ئەمەش مەرجە و پشتگوێ ناخرێت، ئەوەی فەرهەنگێکی گەورەی لە وشە نەبێت ، بیرکردنەوەیەکی چاکی نابێت، ئێمە ناتوانین بیربکەینەوە بێ وشە، دکتۆری سایکۆلۆجی(واتسۆن) دەڵێیت: بیرکردنەوە قسەی بێدەنگە، و قسەش بیرکردنەوەیەکی بێدەنگە. شتیش هەیە راستی ئەم وتەیە دەردەخات، ئەوەی تێبینی دەکرێت، هەر کەسەو وشەی تایبەت بە خۆی هەیە، لەقسەکردن و نوسیندا زۆری بەکاردێنێت، بێگومان دیارە ئەمە ئاڕاستەی بیرکردنەوەیەتی، ئەو وشانە هەڵدەبژێرێت کە دەربڕی بیرکردنەوەیەتی. گەر بیرکردنەوەی سووك بێت، ئەوا وشەکانیشی سووکن.

(هۆربرت سبنسەر) دەیگوت:- دەتوانم کێشی بیری مرۆڤێك

بكـەم پـاش قسـەكردنی ، لەبەرئـەوەی لـە وشـەكانی دەزانم چ بابەتێك كارتێیكردووە و چۆنی كاترێكردووە.

باشترین زمان كە دەبێت فێری ببین و باشی بزانین، زمانی زگماكە، هەرئەو زمانەشە دەتوانین بەباشی فێری ببین، زۆریش پەسەند نییە، زمانێكی بیانی بە نیوەچڵی بزانین، لەبەرئـەوەی زمـان شـێوازە ، مەبەسـتە سـەرەكییەكەی خوێندنـەوە وخـۆ روونانككردنەوەی بەردەوامە، گەر زۆر بەباشی نەیزانین، سوودی لێنـابینین، و كـە منداڵـەكانمان فێرە دوو زمـانی بیـانی دەكـەین، گەورەترین هەڵەیە، لەبەرئەوەی یەك زمان بەسـە، و دەكرێـت زۆر بەباشی فێری بێت، و پشتی پێببەستێت بۆ رۆشنبیرێكردنێكی هاوچەرخی.

ئەم چوار مەرجەی كە سەرەك(وڵسۆن) دایناوە، بەرهەمدارن، و پاڵنـەرە بۆكـاركردن، وایلێـدەكات داوای مـاف و چاكسـازی وپێشكەوتن بكات، مرۆڤی رۆشنبیر ناتونێت ستەم قبوڵ بكـات، و بیجوڵـەیی ناوێـت، لەبەرئـەوەی رۆشـنبیرییەكەی تێكـەڵ بەخوێنی بووە، و بۆیە بەشێكە لە گیـانی و ویسـتی، وناتوانێـت بیرۆكـەكانی چاكسـازی و پێشـكەوتن لـە دەروونیـدا بەنـدبكات، لەبەرئەوەی لەبیریدا چەسپاوە، و كە دەوروبەری دەبینێت هاوار بـۆ چاكسـازی و پیپێشـكەوتن دەكـات، و رووبـەرووی ئـەو تەگەرانەش دەبێتەوە كە زیان بە بژێوی دەگەیەنێت، و ئەم گیانە مەردەش گیانی خۆبەختكردنە لەپێناوی راستی و مەردایـەتی و پێشكەوتنی مرۆڤایەتیدا.

ئـەو مرۆڤـە رۆشـنبیرە، ناتوانێـت ملكـەچ بێـت بـۆ زۆرداری،



لەبەرئەوەی بیری پڕە بەو رەنجانەی كە دراون لـەپێناوی ئازادیـدا ، و ناتوانێـت بـۆ بیرۆكەیـەك یـان رێباوەرێـك دەمارگیربێـت وەك دەمارگیری زۆرداری و قین، لەبەرئەوەی دەزانێت بەهای لێبوردن لە مێژووی مرۆڤایەتیدا چییە، و قینی لە جەنگە، لەبەرئـەوەی مێـژووی جیهـان بەبرایـەتی مرۆڤایـەتی ئاشـنای كـردووە. خـۆ، ئەگەر ئارەزووی بیركردنەوەی زانستانە بوو هەوەسی سۆزیشی ئاینانـە بـوو، ئـەوا خۆشـگوزەرانی دەوێـت، و بـۆ ئاینـدەی مرۆڤایەتی تكای (فەڕ)دەكات.

كام لەم چوار مەرجەت تێدایە؟..

و كامیانیش بەرهەمیان هێناوە؟...

لێـرەدا سـەرۆك( وڵسـۆن) هونـەرە جوانـەكانی پشـتگوێ خسـتووە، وەك بڵێـی گـوێ بـە وێـژەو موسـیقا و شـیعر و وێنەكێشـان و پەیكەرسـازی نـەدابێت، وا بـزانم كـە ئـەم چـوار مەرجـەی دانـاوە مەبەسـتی لـە هەڵوێسـتی مرۆڤـی رۆشـنبیرە كـە چـەند سـوودی بـۆ كۆمـەڵ دەبێـت، ئـەو دەیویسـت بـیری پـەروەردەبكات، وبیرسـازە(منطـق) كۆمەڵایەتییەكـەی راسـت بكاتـەوە، بۆئـەوەی راژەی كۆمـەڵ بكـات... سـەرۆك(وڵسـون) بایەخی نەدا بەبەرزكردنەوەی دەروونـی و چێژ لەسۆز وەرگرتن ... ئەمەش كەمتەرخەمییە.

(١٣)

## رۆشنبیرییەکی مرۆڤانە

مرۆڤ لەسەدەی بیستەمدا دەژین و هاوبەندن بەپەیوەندییەکی ئابووری زۆرەوە. ماڵێکی ئاسایی لە قاهیرە یان لەپاریس یان لە نیویۆرکدا، مەبەستیشمان ماڵێکی مۆدێرنە، ئەوەندەی کەل و پەل و خواردنی تێدایە مەگەر لە (٥٠) وڵات کۆکرابێتەوە، ئەم هاوبەندییە ئابوورییە، شێوازی گەیاندنی زۆر وفراوان وخێرا کردووە، ئەم هۆیە وای لە مرۆڤی مۆدێرن کردووە کە هەست بە نیشتمانپەروەری جیهان بکات، نەك هەست بە نیشتمانپەروەری بۆ وڵاتێك بکات، ئەم هەستە بە پەرەسەندنی رۆشنبیری بەهێزتر و تیژتر دەبێت، ئەو پەرەسەندنە رۆشنبیرییەی کەلەنێو دڵماندا گیانێکی مرۆڤانەی نوێی چاندووە، و وایلێکردووین، هەست بکەین کە یەك خێزانین و خاوەنی ئەم جیهانەین کە تیایدا دەژین و لەئێمە زیاتر کەسی دیکەی تێدا نییە.

ئەم دڵنیاییە، گەڕان لە گەردووندا قەدەغە ناکات، بەڵکو بەم گەڕانانە ئەو راستییانە دەدۆزینەوە کە وا لە مێشکمان بکات زیاتر تێبگات و ژیانمانیش بەختەوەرتر بکات.

رۆژنامە و گۆڤار و نوسراوە و سینەما و رادیۆ، هەموو



ئەمانە وەبیرمان دەخەنەوە کە هەموو مرۆڤی سەر ئەم زەوییە هاوبەندن، کە رووداوێك دەخوێنیەوە لەپەکین یان تۆکیۆ یان ریۆدۆجانیرۆ بەهەمان رووداوێکی ئەسکەندەرییە یان ئەسیوت بایەخی دەدەینێ، نەك لەبەرئەوەی رووداوەکانی بیانی دەنگدانەوەی لە وڵاتەکەماندا هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە فێرە بینینێکی جیهانی بووین، لەوانەیە هەردوو جەنگە گەورەکەی رابردوو ئەم هەوەسە جیهانییەی تێدا دورست کردبین، پەرەسەندنی پیشەسازی، و پەرەسەندنی جەنگی ، هەموو جەنگێکی بیانی کردۆتە جەنگی ناوخۆیی لەنێو هەموو نەتەوەکانی ئەم جیهانەدا.

رۆشنبیری میسری لەم چەرخەدا وتووێژ لەسەر دیموکراسییەت و فاشییەت و هاوبەشییەتی و جەنگ و ئاشتی و ئاین بەبایەخێکی زۆرەوە دەکات، سەرەڕای ئەوەی کە ئەمانە لەم کاتەدا لەوڵاتەکەی خۆیدا بەدیناکات، ئێمە لە رامیاری و کۆمەڵایەتیدا پەرەدەسێنین لەبینینی وڵاتییەوە بۆ بینینی جیهانی. و ئەم پەرەسەندنەش، بمانەوێ و نەمانەوێ هەر روودەدات.

مارکس دەیووت:( جەنگ شەمەندەفەری مێژووە). واتا مێژوو هەنگاوەکانی لە جەنگدا خێرا دەکات. ئەم دوو جەنگە، رۆشنبیر و زیرەکەکانی گواستەوە ئاسۆیەکی روون و فراوان لەبایەخدان ، وای لێکردن کێشەکانی هەموو کشوەرەکان بەکێشەی نیشتمانی خۆیان بزانن.

بەواتایەکی دیکە: بارودۆخی دارایی و کۆمەڵایەتی و

جەنگی ، و پەیدابوونی هۆیە خێراکانی گواستنەوە، و کشاندنە شێرپەنجەییەکەی ئەو دوو جەنگە بۆ زۆربەی وڵاتەکان، هەموو ئەمانە وایلێکردین کە رۆشنبیریی جیهانی بین، هەروەك چۆن وەچەکانی پێشوو ئاینی نوێیان وەردەگرت، هێز و فشاری ئەم مرۆڤایەتییە نوێیە وامان لێدەکات هەست بەبرایەتی و هاوکاری و حەز لە پێشکەوتن و فەڕ بکەین.

مرۆڤی رۆشنبیر لەم چەرخەدا، ئەو مرۆڤە نییە کە تەنها داوای رۆشنبیری عەرەبی یان ئینگلیزی یان ئەڵمانی بکات، بەڵکو داوای رۆشنبیری جیهانی دەکات، ئەو رۆشنبیرییەی کە نە رۆژهەڵاتییە، ونە رۆژئاواییە، بەڵکو رۆشنبیرییەکی سەر هەمووئەم هەسارەیەیە. ئەمەش بەروبوومی رەنجی مرۆڤایەتی (٢٥٠) هەزار ساڵ لەمەوپێشە تاکو ئێستا ، رۆشنبیری جیهانی لێکۆڵینەوەی مێژووی چین و میسرو هیند دەکات لەبەرئەوەی مێژووی خۆیەتی، لێکۆڵینەوەی جوگرافیای ئاسیا و ئەمەریکا دەکات، لەبەرئەوەی خاوەنی هەموو کیشوەرەکانە، و ئەم جیهانەش دێیەکی گەورەی خۆیەتی. مافی خۆیەتی، بەڵکو ئەرکییەتی کە بیناسێت وداوای چاکسازی و پلاندانانی بۆ بکات، چۆن بە گوڕ، ئازادی وڵاتەکەی دەوێت، بەهەمان گوڕیش ئازادی بۆ چین و هیند دەوێت، لە زانستەکاندا کاردەکات و پێشیان دەخات لەبەرئەوەی لە جەنگەکانی (ئەسکەندەر) و (جەنگیزخان) بۆ مرۆڤایەتی بەسوودترن، ولەبەرئەوە، لە دەرگاکانی ئاینده دەدەین و زاڵ دەبین بەسەرئەوەی کەپێشینان پێیان دەووت رێککەوت و هات (قضاء وقدر).



مەبەستی (رۆشنبیری مرۆڤایەتی) تێگەیشتنە، بۆئەوەی لەگەڵ ژیری گشتی پەیوەندیمان هەبێت. ئەو ژیرییە گشتییەی کە دەمانگەیینێتە ئەو داهێنانە کۆمەڵایەتییە وئامێرییەی کە جیهان دەگۆڕێت، پاش ئەمەش وەك مرۆڤێك رەفتارەدەکەین کە لەدەروونەوە بەند نییە بە وڵاتێك یان رێباوەرێك، بەڵکو بەندە بەنیشتمانی جیهانەوە و بەرێباوەری مرۆڤایەتییەوە. بەمانایەکی دیکە، مەبەستی رۆشنبیری ئەوەیە کە مرۆڤ مرۆڤانەتر بکات.

لەوانەیە خوێنەر بپرسێت:_

سەرەڕای بارودۆخی جیهانی هاوچەرخ کە رۆشنبیریمان مرۆڤانە دەکات، کام لێکۆڵینەوەیە دەمانگەینێتە باشترین ئەنجام؟....

خوێنەر وەڵامی ئەم پرسیارە لەبەندەکانی داهاتوودا بەئاسانی دەبینێتەوە، بەڵام لێرەدا دەڵێم لاوی میسری پێویستی بە لێکۆڵینەوەی :–

١– کێشە دارایی و کۆمەڵایەتی و رامیارییەکانی ئەم چەرخە هەیە، لەبەرئەوەی باشترین دەروازەن بۆ لێکۆڵینەوەی دیکە، رۆژنامەش باشترین دەروازیە بۆ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە.

٢– پێویستە لێکۆڵینەوەی زانستێك لە زانستە هاوچەرخەکان بکات بۆئەوەی ئاگای لەو هۆیانە بێت کە جیهان دەگۆڕن.

٣– دواتر پێویستە لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەم زەوییە بە هەموو نەتەوەکان و وڵاتەکانەوە بکات، لەو چرکیەوە کە زەوی لە هەتاو جیا بۆوەو تاکو ئێستا ، ئەم رەنجەش زۆر مەزن

وبێزارکەر دیارە، ولەم کاتەشدا وایە، لەبەرئەوەی رۆشنبیرانی مێژوو مێژووی هەموو نەتەوەیەك بەجیا دەنووسنەوە، بەڵام نوسراوەی (هـ.ج. وێڵز) لەمێژووی گشتی ، لێکۆڵینەوەی مێژووی زەوییەکەمانی ئاسانکردووە.

٤- دواتر لێکۆڵینەوەی هەموو ئاینەکان بکات کە دەروونی مرۆڤایەتییان گۆڕیوە، لە داستانی یەکەمەوە کە مرۆڤی سەرەتایی باوەڕی پێبوو، تا دەگاتە ڕێباوەڕە فەلسەفییە نوێیەکان کە هەوڵی ئەوە دەدەن زانیاری زانستی ببێتە بناغەی باوەڕ، لەجیاتی باوەڕی بۆماوە، و وێژەو فەلسەفە کۆنەکان وەك ئاینەکان وابوون، وبەخەیاڵ هەوڵی گەیشتن بە بژێوییەکی نایبیان پێشان دەداین. نەك بەتاقیکردنەوە.

پێویستە لاوی میسری لێکۆڵینەوەی زمانێکی بیانی مۆدرێن بکات، وپشتی پێببەستێت بۆ پێوەندی جیهانی، لەبەرئەوەی بەداخەوە زمانمان کەمو کورتی هەیە، زۆربەی زانستەکان تاکو ئێستا لە زمانی عەرەبیدا لاڵن، لاوێك ناتوانێت زانستێك بەباشی بزانێت، گەر هاتوو تەنها زمانی عەرەبی زانی، زمانی ئینگلیزی وفەرەنسی و ئەڵمانی و رووسی چاکترین زمانی بیانین، بەڵام زمانی ئەڵمانی و رووسی قورسن، لێکۆڵینەوەیان بەباشی، کات و توانایەکی زۆری دەوێت، و زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیش بەسە بۆ پێوەندی بەکاروباری جیهانەوە و ئاراستەی مرۆڤایەتی، کە ئاسۆمان فراوان دەکات و کەسییەتیمان گەورەدەکات، و فێرە رەفتاری مرۆڤانەمان دەکات.



(١٤)

## تەنها ناخوێنینەوە بەڵکو لێکۆڵینەوەش دەکەین

کە لەخۆرئاوا بووم بینیم، وشەی( خوێندکار)یان بەکاردەهێنا لەجیاتی وشەی (زانا) کەلەمیسردا بەکاردێت، لای من ، وشەی یەکەم پەسەندترە، لەبەرئەوەی لەماناو بۆچووندا راستترە، مانای لێکۆڵینەوە و پەرەسەندن و پێشکەوتنە، لەبەرئەوەی بگەینە چ ئاستێك لەرۆشنبیریدا، هەر خوێندکارین، بەردەوام داوای فێربوون و لێکۆڵینەوە دەکەین، و قەت نالێین ئێمە لەرۆشنبیریدا کاملێن، و ئینگلیزیش بە مرۆڤی رۆشنبیر دەڵێن(سکولەر) کەمانای داواکاریورەنجە.

چەند چاکە ئێمەش ئەم وشەیە بەکاربهێنین، هەموو مرۆڤێك دەبێت بەدرێژایی ژیانی خوێندکار بێت، هەروەك چۆن (جاحظ)هەتا ئەو کاتەی مردووە نوسراوەی لەسەر سینگ بووە.

خوێندکار سووکایەتی ناکات و لەخۆرایی ناخوێنێتەوە، ئێمەش چۆن قینمان لەرەفتاری سووك دەبێتەوە، و داوا لە هەموو مرۆڤێك دەکەین کە راستگۆبێت و مەبەستی مەردانەبێت لەبژێویدا، ئەوهاش داوا لە خوێنەر دەکەین کە بەراستگرتووانە (جدی) بخوێنێتەوە و مەبەستێکیش لە لێکۆڵینەوەکەیدا دیاریبکات، کە ئەوهاش ئاراستەکرا، دووردەکەوێتەوە لە

خوێندنەوەی چیرۆکی ترۆ، وچەواشەی هەندێك لە گۆڤارەکان کە پارە و کات دەبەن، ئەو جۆرە گۆڤارانە شەڕ لەگەڵ زیرەکی دەکەن، و هاندەری گێلایەتین.

جیاوازی نێوان خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە زۆرە، خوێندنەوە لای زۆربەی خوێنەران بەکات بەسەربردن و رابواردن دەزاندرێت، کەچی لێکۆڵینەوە پێویستی بەرەنجێکی زۆرە بۆ سوود لێوەرگرتن، راستییەکەی لێکۆڵینەوە نەریت وئاراستەیە،گەر هاتوو لەسەرەتادا لەسەری راهاتین و خۆمان بۆ ماندوو کرد، ئەوکاتە دەبێتە چێژ لێوەرگرتنێکی بەرز.

جۆری چێژ وەرگرتن لە کۆمەڵێ ئێمەدا زۆرە، هەیە چێژ بە قەڵەوبوون و گوڵە بەرۆژەخواردن و دانیشتن لە چایخانەو سەیری خەڵك کردن وەردەگرێت، هەشە چێژ لە یاری وەزرش ، یان بینینی فلمێك ، یان لەپیاسەکردنێك وەردەگرێت، جۆری چێژ لێوەرگرتنی یەکەم رابواردنێکی ترۆیە، و بێ ئامانجە ، بەڵام جۆری دووەم هەست بە ئامانج کردنیکە و سوودی تەندروستی هەیە و بیری دەوڵەمەند دەکات.

خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەش ئەوهایە، یەکەمیان رابواردنێکی بێ ئامانجە،ودووەمیشیان چێژ وەرگرتنە لە ئامانجەکانی پێشکەوتن، گواستنەوەش لە خوێندنەوە بۆ لێکۆڵینەوە بەمەشق ئاسانە، لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوە دەبێتە هەوەس و ئەو هەموو رەنجەی ناوێت، ئەوسا رۆژنامە بەپێنووسی سوور و مەقەس و نەخشە و فەرهەنگ دەخوێندرێتەوە، ونوسراوەش بەرەخنەگرتن و شیکردنەوە و



کورتکردنەوە دەخوێندرێتەوە.

ئێمە کە بەپێنووس دەخوێنینەوە، بەشداری دانەر دەکەین لە نوسراوەکەیدا، لەبەرئەوەی لە کاتی خوێندنەوەیدا وتووێژی لەگەڵ دەکەین، جاریش هەیە تێبینی باشی دەدەینی،ئەوساش خوێندنەوەکەمان ئەرەیی و کاریگەر دەبێت و دوور دەکەوێتەوە لە نەرەیی بێ سوود، ئێمە بیردەکەینەوە و دواتر نوسراوە دادەنێین، خوێنەر وا تێنەگات کە شیعر و وێژە هەر بۆ خوێندنەوەیە، بەڵکو بۆ لێکۆڵینەوەشە. لێرەدا حاشا لەوەناکەین، گەر هاتوو چیرۆکی (تۆڵستۆی)و (دۆستۆفکی) یمان خوێندنەوە، ئیتر ناتوانین بەپێنووس بەدوای دانەر بکەوین، لاپەڕە لاپەڕە توانجی تێبگرین و مانای ئەوەش نییە کە وێژەی جیهانی توانجی تێناگرێ هەروەك مۆسیقا وا بێت و تەنها چێژی بەرزی لێوەربگرین.

ئێمە کە چیرۆکی (تۆلستۆی) دەخوێنینەوەو چێژ لەسیحری هونەرەکەی وەردەگرین، هەروەك چێژ وەرگرتن لە ئاوازێکی پیرۆز لە کاتێکی بێدەنگی و بێجوولەییدا. پاش خوێندنەوەی بۆمان هەیە شیبکەینەوەو بزانین چۆن لەکاتی خوێندنەوەیدا، وایلێکردین بگەینە ئاسمان و هەست بەئاینێکی نوێ بکەین.

بەمانایەکی دیکە، ئێمە چۆن لێکۆڵینەوەی نوسراوەیەکی ئایینی دەکەین، دەبێت ئەوهاش لێکۆڵینەوەی چیرۆکێکی جیهانی بکەین، لەبەرئەوەی ئەویش هەر لە ئاینەوەیە، وئاینیش پێویستی بە رەخنە و راڤەکردنە، گەر هاتوو راهاتین لەسەر لێکۆڵینەوە و بووە هەوەس، ئەوا رۆژنامە و نوسراوە ئاگادارمان

دەكاتەوە، نەك مەستمان بكات، وپاشان لێكۆڵینەوەكانمان بەبەرنامە و ئاڕاستە ڕێكدەخات بۆ ئەو ئامانجانەی كە پێشمان دەخات.

ئەوەی خۆی بەرۆشنبیر بزانێت، واز لە هیچ نوسراویەك ناهێنێت كە خوێندبێتەوە گەر بڕیارێكی لەسەرنەدابێت، واتا لەسەرچەند لاپەڕەیەك كورتەیەكی زورچڕوپڕ لەسەر لایەنە بەسوودەكانی دەنوسێت، وئایا شایستەی ئەو هەموو كات وپارەیە بوو. یان خوێندنەوەی زەرەرمەندەبوو، و هیچ نوسراوەیەك نییە لەسەروو ئەم تاقیكردنەوە بێت، ئێمە كە دەخوێنێنەوە و لێكۆڵینەوە دەكەین بۆئەوەیە كە سوودی لێوەربگرین و ئاستمان پێبەرزبێتەوە، و ئاسۆی بیرمان فراوانتر بكات، ودەروونمان پەروەردەبكات، وپێشمان رووناك بكاتەوە، وچێژیش لەم جیهانە وەربگرین. گەر ئەمانەش پاش خوێندنەوەی نوسراوەیەك رووینەدا، دەبێت پەشیمان ببینەوەو ئامۆژگاری خەڵك بكەین، كە هەڵەكەی ئێمە نەكات و ئەو نوسراوە تڕۆیە نەخوێنێتەوە.

گەر دانەرەكان بیانزانییا كە خوێنەرەكان بەوردی تاقییاندەكەنەوە ، بەسووكی نەیاندەنوسنی ، و نوسەرەكانی رۆژنامەو گۆڤارەكانیش گەر بزانن خوێنەرەكان دەیانەوێ سوود لەنوسینەكانیان وەربگرن، ئەوا خۆیان ماندوو دەكرد و لێكۆڵینەوەیان دەكردو ئەوەی بەسوودیش نەبا نەیاندەنوسی.

با لێكۆڵینەوە لە جیاتی خوێندنەوەبێت، و ببێتە نەریتو هەوەسمان، گەر ویستمان خۆمان رۆشنبیر بكەین، ودەروونمان



پەروەردە بكەین، بالیكۆڵینەوەیەكی بەمەبەست بكەین، ئامانجی دیاری بكەین، ومەودای بپێوین، وگەشتەكەمان رێكبخەین بۆئەوەی پێیبگەین.

( ١٥ )

## پێگەیاندنی مرۆڤی عەرەبی هاوچەرخ

گۆڤاری (ئاداب)ی بەیروتی پرسیارێكی لێكردوم ،و وتیان:– چین ئەو نوسراوانەی كە كاریان لە ژیانت كردووە؟.. وكامیانیش هەڵدەبژێری و وەریدەگێڕی بۆ زمانی عەرەبی؟.

ئەم پرسیارانە، سەرەڕای ئەوەی دوودڵمان دەكاتو پێكەنیمان دەهێنێت، بەڵام مانای تەندروستی و حەز و هێزیش دەبەخشێت.

هەروەك نەتەوە چۆن حەزی لەهێزی سەربازی و رەوشتی بەرزو تەندروستی لەش، و زۆری بەرهەمهێنانی كشتوكاڵی و پیشەسازییە، ئەوهاش حەزی لەهێزی رۆشنبیرییە بۆ راهێنانی رۆڵەكانی و ئاڕاستكردنیان بۆ ئاینده.

وەڵامەكەم ناردەوە بۆ گۆڤارەكە، دواتر رامام ، بیرم كردەوە، چ رۆشنبیرییەك لە میسر و وڵاتانی عەرەبیدا بلاون؟... چەند توانای دەرچواندنی مرۆڤێكی هاوچەرخیان هەیە، كە بتوانێت بەرەنگاری كێشەكان ببێتەوە، ژیانێكی ئاسایی بەسەرببات، گەر

بۆشیكرا ژیانێكی بلیمەتانە بژیت..؟

هەر چۆن سەربازی هاوچەرخ جیاوازە لەسەربازی كۆن لەچەك و تەقەمەنی و راهێنانیدا، ئەوهاش مرۆڤی رۆشنبیری هاوچەرخ جیاوازە لە لێكۆڵینەوەی و ئاڕاستەی و ئامانجی لەگەڵ رۆشنبیری كۆندا، سەربازی كۆن و هاوچەرخ لەئازایەتی یەكسانن، بەڵام جیاوازییەكی زۆر هەیە لە نێوانیاندا لە گۆڕانی بارودۆخ و لەپاڵنەرەكانی شەڕ لەلایەكەوە، و ئامڕازی شەڕكردن لەلایەكی دیكەوە.

ئەوهاش مرۆڤی رۆشنبیری هاوچەرخ و كۆن، لەزیرەكی وتێگەیشتندا یەكسانن ، بەڵام پاڵنەرەكانی رۆشنبیری لەم چەرخەدا زۆر جیاوازن لەگەڵ پاڵنەرەكانی رۆشنبیری پێش هەزار یان دوو هەزار ساڵدا. زۆركات بەرگریكردن لەباوەڕ و سیستەمی دەرەبەگایەتی پاڵنەرەی پیشینەكان بووە ، وهەستیشیان چینایەتی بووە، بۆ ڕاژەكردنی سەركردە و پاشا و پێشڕەوەكان دەژیان، وهەمیشە وێژەشیان لەپێناوی ڕاژەی ئەوەندا بووە، ولای ئەوانیش میللەت ئەوەندە گرنگ نەبووە.

لەهەمووش ترسناكتر ئەوە بووە كە كۆمەڵەكەیان ، واتا كۆمەڵی چینی دەسەڵات تەنها كۆمەڵی پیاوان بووە ، ئەوساش مرۆڤی رۆشنبیر هەستی نەدەكرد كە میللەتێك هەیە لە جوتیار و پیشەساز پێكدێت ، ولەوێژەشیان مەگەر بەهەڵە وەنەزانین باسی ژنیان كردبێتو بارزگانیشیان هەر لەبیرنەبووە، وئەگەر باسیشیان كردبێت بەدەگمەن بووە.

لێرەدا وێژەی كۆنی عەرەب و بگرە هەموو رۆشنبیری كۆنی



عەرەبیش بۆ رۆشنبیری میسری نامۆیە، بۆ چێژمان نامۆیە، وریێبازو ئامانجەكەی بۆ گیانمان بیانییە.

پێش(١٠) ساڵ چەند نوسەرێك كە بیرمەند نەبوون یادی(١٠٠٠) ساڵەی (المتنبی)یان كردەوە. بەشداریم نەكرد، لەبەرئەوەی جیاوازی نێوان (المتنبی)و (شوقی) نییە، هەردووكیان هەموو ژیانیان بۆ هەڵدانی میرەكانیان تەرخانكردبوو (المتنبی) درۆی دەكرد و میرییەكەی بەرزكردەوە بۆ ئاسمان و لەوانەیە بەو هەڵدانانە گەندەڵ بووبن، بەڵام میللەت و خەڵك و زەحمەتكێشەكان لای ( المتبنی )و( شوقی)نادیار بوون.

بەرای من، ئەوانەی بەشداری بۆنەی (المتنبی) یان كردبوو پاڵنەری بەشداریبوونیان هەستكردن بوو بەهەمان نەخۆشییەكانی (المتنبی)و(شوقی)، لەبەرئەوەی لەسایەی ( فؤاد )و( فاروق) ی پاشادا دەژیان ، و گەر كاتی ئەو بۆنەیە پاش شۆڕشی (١٩٥٢) بوایە، كەس لەبەشداربووان هەستی بەڕەندی و پیاوەتی نەدەكرد لە هەڵدانی (المتنبی)داو بۆنەی بۆ نەدەكراو ناویشی نەدەهات.

**مرۆڤی هاوچەرخ كێیە؟...**

١- مرۆڤێكی نوێیە، مێژووی لە (٥٠٠) ساڵ زیاتر نییە، لەو كاتانەوە كە ئەوروپاییەكان پشتیان بە زانیارییەكانی زانست دەبەستی لەجیاتی ئەوەی پشت بە باوەڕە بۆ ماوەكان ببەستن ، بەڵام چۆن زانیارییەكانی زانست جێگای باوەڕە بۆ ماوەكانی گرتەوە؟ ئەوە بابەتێكی دووردرێژە، ئەو كاتە خوێنەر دەیزانێت

كە ميللەتانى عەرەب  هەستان بەوەرگرتنى هۆيەكانى هێزى زانست.

ئێستا وا من ئەم دێڕانەتان بۆ دەنوسم ، لەنێو نوسراوەى (مێژووى سروشتى باڵندە) كە (بيلۆن) ى فەرەنسى لەساڵى (١٥٥٥ى.ز) دايناوە، وێنەيەكى سەيرو سەمەرەى تێدايە ، ئەم وێنەيە ، دوو وێنەى بەرامبەريەكى ئيسكى مرۆڤ و باڵندەيە . و دانە دانە ئاماژەى ئەو ئێسكانە دەكات كە بەرامبەر يەكن و وەك يەكن. ئەوروپاييەكان پێش(٤٠٠) ساڵ ئەم وێنەيان بينيوە، وئێمەش تاوەكو ئێستا نەمانديوە، ئەمە هەولێكە لە هەزارەها هەول بۆ دانانى زانيارى لە جێگاى باوەڕ، وبۆدەرچواندنى مرۆڤى زانستى هاوچەرخ.

واتێدەگەم ، مرۆڤى هاوچەرخ ، ئەو مرۆڤەيە گە دەزانێت و تاقيدەكاتەوە، نەك باوەڕ بكات و تەسليم ببێت، ئەو مرۆڤە پێگەيشتووەيە، كە خۆى و جيهان و گەردوون بەپێوەر و تەرازووى زانستى دەكێشێت.

ئەمە يەكەم هێماى مرۆڤى هاوچەرخە، زانيارە و تاقيكردۆتەوە، وبەردەوام زانيارييەكانى و تاقيكردنەوەكانى زۆر دەكات.

٢- دووەم هێماى مرۆڤى هاوچەرج ئەوەيە كە لادێى نييە، لەبەرئەوەى فێرە رۆژنامە خوێندنەوە بووە، ولاى ئەو وەك دەموچاوشوشتنى بەيانيانە، ئەم رۆژنامانەش گۆڕانكارييان تێدا كردووە، وايان لێكردووە، جيهانانە رەفتاربكات، وديموكراسانە بيربكاتەوە، هەر تەنها بەمێشكى و دەروونى



لەدييەكەيدا ناژيت، هەموو بەيانيان رووبەڕووى رووداوەكان دەبێتەوە، هەستدەكات لەگەڵ هيندييەكانە، گوێ لە وشەكانى پياوەتى (نەهرۆ) رادەگرێت، گوێ لە وشە پيرۆزەكانى(گاندى) رادەگرێت، و مەترسييەكى گەورە دايدەگرێت، كاتێك كاولكارى بۆمبى گەرديلەيى بۆ دەردەكەوێت، وبەپەلە هەوڵ بۆ شێوازى ئاشتى دەدات، هەستدەكات كە ئاينەكەى خۆشەويستييە. شەرمەزارى دايدەگرێت كە تف لە دەموچاوى رەش پێستێكى ئەفريكاى باشووردەكرێت.

بەلاَم بۆ ئاينده هەر گەشبينە ، لەبەرئەوەى مرۆڤانەيە و هەميشە باوەڕ بەوە ناكات كە خراپە لە چاكە بباتەوە، و لەبەر ئەو هۆيەشە هاوبەشييەتيانە لەراميارى رەفتار دەكات.

٣- سێيەم هێماى مرۆڤى هاوچەرخ ئەوەيە كە دەبێت پەرەسەندوو بێت، وخەريكە باوەڕ بكات دژ بەهەوەسە زانستييەكەى كە پەرەسەندن و پێشكەوتن و بەرزبوونەوەيە، ئەم شتەش لە جيهاندا نوێيە ، و جياوازيمان هەيە لەگەڵ پێشينان. ئێمە لەم چەرخەدا لەيەكێك دەپرسين:- ئايا ئەم مرۆڤە پەرەيسەندووە؟ ئايا بيرى پێشكەوتووە ؟... دڵنيايە لەوەى كەلەم گەردوونەدا ، هيچ كەرەسەيەك يان رووەكێك يان ئاژەڵێك نييە كە هەموو رۆژێك پەرەنەسێنێت؟... بەڵكو لە هەموو چركەيەكيشدا... ئەم باوەرە بە پەرەسەندن ، باوەرە بە پێشكەوتن و گەشبينى ، باوەڕە بەوەى كە جيهان پاش(١٠يان ١٠٠) ساڵێكى تر دەبێە دێيەكى گەورە، كاتێك باوەڕ بەوە دەكەين كە هەموومان براين و هاوكارى يەكين، وكەسيش نييە

له نێوانماندا وەك (قابیل) بپرسێت وبڵێت :– ئایا من پاسەوانی براکەمم؟!.

٤–چوارەم هێمای مرۆڤی هاوچەرخ ئەوەیە کە سەرەڕای خۆشەویستییەکەی بۆ سروشت ، و هەستکردنی بەوەی کە دەبێت هەموو رووەك و ئاژەڵێك بپارێزرێت، ئەم مرۆڤە هاوچەرخە لە دەوروبەری پیشەسازیدا دەژیت، کە ئاسن و ئاگر و هەموو هێزە کەرەسەییەکان بەکاردەهێنرێت، بۆ بەرهەمهێنانی فراوان کە هەژاری ناهێڵێت، وگشتاندنی خۆشگوزەرانی دەکات.

ئەمانە چوار هێمای مرۆڤی هاوچەرخن ، ئەم هێمایانەش لە مرۆڤی تر جیایان دەکاتەوە، هەروەك چۆن جیاکاری نێوان مرۆڤی لووت زل و لووت بچوك یان چاو رەش و چاوشین، یان بالاّ بەرزو کورتە بالاّ، یان زیرەکی و تەمەڵی یان لە نێوان ئازایەتی و ترسنۆکیدا دەکەین.

ئایا کتێبخانەکانی عەرەب، بەهەموو ئەو نوسراوانەی کە لەنیوەی ئەم سەدەیە دەریکردووە ، توانیویانە مرۆڤی هاوچەرخ بەرهەم بهێنن؟؟...

بێگومان وەلاّمەکەی( نەخێرە)...

گلەییەکە بۆ ئەو گێلانە دەگەڕێتەوە کە (المتنبی) یان بیردەکەوێتەوەو(داروین) یش پشتگوێدەخەن ، نوسراوە لەسەر (معاویە) و( هارون الرشید) دادەنێن، بەلاّم (بیکۆن)ی یەکەمو(بیکۆن)ی دوەمیان لەبیر دەچێت.

نازانن کە ویژە ژیان و تێکۆشانە... شێوازی چۆنیەتی ژیانە، پەرەسەندن و شۆڕشە.. نازانن سروشتی شارستانییەتی



هاوچەرخ چییە... شارستانییەتی زانست و پیشەسازی چییە...بۆیە بەحاڵ ئاوڕ لە کێشە مرۆڤایەتی و کۆمەلاّیەتییەکان دەدەنەوە ، زۆرجار کە وتووێژیان لەگەڵ دەکەم، نەزانینیان دەمکاتە خەڵووز ..ئەوان کە باسی ژن دەکەن، وەك منداڵێك وایە کە باسی یارییەکی تەختەی خۆی بکات، وەك یارییەکی تایبەتی خۆی بێ وایە، ئەو نان و ئاو و نوستن و ژیان و رەفتار بۆ ژنەکە دیاریدەکات،وئەو ژنەش وەك مرۆڤێك مافی چارەنووسی خۆی نییە...

هۆ سەرەکییەکەی ئەم بارەش زیاتر دەکەوێتە سەر ئەستۆی داگیرکەران و ستەمکاران، کە هاوپەیمانبوون دژی پێشکەوتنی پیشەسازی. گەر کارگەکانمان فراوانترو زیاتربونایە،کێشەکانیشمان دەگۆڕان، وبەرزدەبوونەوە ، ویژە لای میللەتی دەگرت، وبەزمانی ئەوان قسەی دەکرد، وژنیش باری ئابوورییەکەی باشتر دەبوو ، و ترسی دەخستە دڵی ئەوانەی هەر وەك مێ دەیانەوێت، و سەرکردەکانیشمان هەستیان بە دیموکراسییەت زیاتر دەکرد، و کرێکاریش هەستی بەباشی بەرهەمهێنان دەکرد، و ئەوسا رامیاریش نەیدەوێرا دەنگی بفرۆشێت.

نەخێر، نەخێر، ئێمەی عەرەب میللەتی هاوچەرخ نین.. داگیرکەر و ستەمکار شارستانییەتی پیشەسازی لێقەدەغەکردین، بەمەش رۆشنبیر زانستییان لێ قەدەغەکردین، کە پشت بەزانیاری و تاقیکردنەوە دەبەستێت ، پاشان نوسەرانمان لەتەك داگیراکەران و ستەمکاران رۆیشتن، لە

هەوەسیاندا لادییانە بوون، ولەباوەڕدا جوتیارانە بوون، وبەشیعریش بە (فوئاد) و( فاروق) یاندا هەڵدەدا. یان لەسەر (رشید) و(مأمون) یان دەنووسی، تا وای لێهات یەکێك لە نوسەرەکان فەرموویەتی:- (دەکرێت دەستوور لە (٣)ساڵ بۆ(١٠٠) ساڵ دواخرێت؟!)، پاش ئەوەش ئەو نوسەرە دەستییکردووە بە نوسین و باسکردنی پیاوانی ڕاستودادەور کە پێش (١٣٠٠) ساڵ ژیاون، وەك( معاویە)و( عوسمان) و (ئەبوبەکر) بەمەش وێژدانی هاوچەرخی لە دەروونیدا نەهێشت، وخۆشی (١٠٠٠) ساڵ لە چەرخەکەیدا دوورخستەوە.

ئەم نەزانانە بەنەزانینیان دەمکەنە خەڵوز، لەبەرئەوەی تاکو ئێستا باوەڕیان بەو بیرکردنەوانە هەیە، کە لە کۆڵانی کۆن و تاریك و شێداردا دەژین.. نەیانوێراوە یاوەری (کۆلۆمبس) بکەن لە گەشتە هات و نەهاتەکانیدا،چێژیان لەو زانیارییە ترسناکانە وەرنەگرتووە، کەوا لەبیردەکات قێزبکاتەوە و ئازاری بگاتێ.هەستیان بەزەماوەند نەکردووە، کە باسی (سیلاکانت) و مرۆڤی (نیاندرتاڵ) کراوە،ئەم جۆرانە، یەك شەو بێ خەونەبوون، بەهۆی بیرکردنەوەیان لەنێوان ( زۆرانبازی مان) و داواکردنی (بەزەیی و مەردایەتی) لەسروشتدا.

لێرەدا، بۆ خوێنەری باسەکەم کە کێشەیەك سەری کاسکردبووم بۆ ماوەی دەیان ساڵ، دڵنیاشم لە من زیاتر لە کەسی تری نەبیستووە، کێشەکەش ئەمەیە:-

ئایا رووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ بەندن بە (بۆماوە)؟ و لەتك ئەگەرەکانی کۆئەندامی زاوزێیان کە لەدایك دەبن دەرناچن؟ یان



ئازادن، وجیاکاری نێوانیان بەهێزی فێربوونیان و کارلێکردنی دەوروبەری سروشتی و کۆمەڵایەتی و زمانەوانی و پیشەییان دەکرێت؟.

ئەمە جیاوازی فەلسەفییەو نەمانبیستووە، لەبەرئەوەی رۆشنبیری گشتی لە میسردا لادێیانەیە، خۆی لەنێو دیوارێکی دابدا بەندکردووە، وهەر لەبەرئەوەشە ناچێتە نێو ئاسۆ هاوچەرخەکانەوە و رووبەرووی کێشە مرۆڤایەتییەکان نابێتەوە.

رایەك هەیە دەڵێت: زیندوو بە دەوروبەر ناگۆڕێت، لەبەرئەوەی بە ( بۆماوە) بەندە... کاتێك کە لەم کێشەیەدا رادەمینیت و بەدوور ودرێژی دەیخوێنییەوە، و چەند کاری لە مامەڵەی سپی پێست و رەش پێستا کردووە و چەندکاری لە مانای پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، ومانای پەروەردە و شێوازەکانی، وله ئایندەی مرۆڤ کردووە، و کاریگەرییان چییە لە سیاسەت و کۆمەڵزانی و داهێنانی زریزەیەکی نوێی ئاژەڵ و رووکدا، کە ئەمانە هەر هەمووی کێشەی مرۆڤی هاوچەرخن، ئێمە نەمانبیستوون ، لەبەرئەوەی هاوچەرخ نین....و لەبەرئەوەی کتێبخانەی عەرەب ئێمەی ئامادەنەکردووە، بۆ لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنی.

ئێمە لە وێژەیەك و روشنبیرییەکی لادێیانەی سەرسورهێنەرین... وەك بڵێی لە جیهان جیابووینەتەوە.

خەڵاتی( نۆبڵ) دەبەخشرێتە دەیان رۆڵەی ئەوروپا و ئاسیا، بەڵام نابەخشرێتە میسرییەك یان عەرەبێك.

دەبەخشرێتە وێژەو کیمیا و سروشت ومیکانێك و

جوگرافیا و مێژوو و جوڵانەوەی ئاشتی، بەڵام بەر یەك لە (٨٠) ملیۆن عەرەبی میسر و غەیری میسر ناکەوێت. لەبەرئەوەی رۆشنبیری گشتی و وێژەی بڵاویان بە بچووکی دەژیت، وەك قسەکردنێکی نێو دێیەکە، بێ ئامانجێکی مرۆڤانە و جیهانانەیە، بە وێژەی رۆژهەڵاتی کۆن چارەسەری دەوروبەری هاوچەرخی نوێمان دەکەن، بۆیە بەیەك ناچن، وپێش ناکەون، ولێرەدا داگیرکەرم لەبیر ناچێت کە لەپیشەسازی بێبەشیان کردووین.

کارگەکان، زانستەکانیان دۆزییەوە و کارگەکان پاڵنەری داهێنان و دۆزینەوە بوون. ئەشڵێم.. ئازادی دیموکراسی و کەسییەتی وئازادی ژنان، هەر هەموویان ئەنجامی کارگەکانن، ودەوروبەری کشتوکاڵیش ئەم ئەنجامانە بەرهەم ناهێنێت، بەڵام تێگەیشتنی ئەم تویژینەوە لەبابەتەکەمان دوورماندەخاتەوە.

* * * *

باشە .... کتێبخانەی عەرەب نەتوانێت مرۆڤی هاوچەرخ دەرچوێنێت ، لەسەرمانە چەند پێشنیازێك پیشکەش بکەین.

<u>یەکەمیان:</u>

بابگۆڕیین ، با لەبەرهەمە کشتوکاڵییەکانەوە پەرەبسەنین بەرەو بەرهەمە پیشەسازییەکان... میسر پێویستی بە (١٠٠٠) کارگە هەیە، و سەروو (١) ملیۆن کرێکاری تێدابێت، تا دەگەینە ئەم بارەو، تا لە داگیرکەر و مێژوو و داب ونەریت دەبەینەوە... پێویستیمان بەو شێوازە رۆشنبیرییانە هەیە کە بیرمان دەجوڵێنێتەوە بەرەو گیانێکی هاوچەرخ.

بەڕای من ، خێراترین شێواز، وەرگێڕانی



(ئەنسکلوبیدیا)یە،،، کە (٣٠) بەرگە، واشدەزانم کە بکرێتە عەرەبی، راپەڕینێك دەکات وەك شۆڕشێك وا بێت. خەم و بایەخدانی نوێمان دەداتی و وڵاتمان پێشدەخات، دڵی لاوەکانمان پڕدەکات لەئاوات و ڕەندی، و مێشکمان بە ماناکانی شارستانییەت و هێز زیرەك دەکات و سۆزیشمان بەرەو بەرزی دەبات.

وەرگێڕانی ئەم فەرهەنگە هەزار جار پڕفەڕترە لەدامەزراندنی کۆڕی زمانەوانی و زانستی ، کە وڵاتانی عەرەب سەدەها هەزار (جنیە) ی لێ سەرف دەکەن.

ئەم فەرهەنگەمان بۆ وەرگێڕن، ئەمە چەك و تەقەمەنی رۆشنبیری هاوچەرخە، هەرئەویش دەتوانێت مرۆڤی هاوچەرخ بەرهەم بهێنێت، لەبەرئەوەی ئەو زانیارییە نوێیانەی تێدایە کە چۆن مرۆڤ زاڵبووە بەسەر کەرەستە ، و راڤەی زۆری شێوازی بەرهەمهێنان دەکات، وبیرۆکەی پەرەسەندن چییە، ومێژووی مرۆڤایەتی تێدایە پێش ئەوەی مرۆڤ بێت.. تا دەگاتەچۆنیەتی دروستکردنی (مادە) و زریزەی دۆزین و داهێنانی دواتر، هەر لە دروستکردنی تەورەوە تا دەکاتە فرۆکە و گەردیلە.

ئەمانە هەر هەمووی پاڵنەرن بۆ خوێنەر بۆئەوەی لەئایندە بگەن و بچنە ناوی، کە تا ئێستا وایان نەکردووە، لەبەرئەوەی تا ئێستا هەر لە رابردوودا دانیشتوون، شتی نوێ ناخۆن، و هەرسی ناکەن، هەرشتی کۆنە و دەیخون... کاوێژی دەکەن و پێی دەڕشێنەوە.

( ١٦ )

## ئەونوسراوانەی بیرو کۆمەڵانیان گۆڕی

نوسراوەی هاوچەرخی مەزن، ئەو نوسراوانەن کە مرۆڤ دەگۆڕن ، لەبەرئەوەی بەهای نویێ لەرەوشت ، یان کۆمەڵزانی یان زانست یان وێژە یان رۆشنبیری گشتی دروست دەکات.

ئەو نوسراوەی نەمانگۆڕێت ، پەروەردەمان ناکات، لەبەرئەوەی ئەو جۆرە نوسراوانە پاش خوێندنەوەیان هەروەك خۆمان دەمێنینەوەو هیچیشمان لێ ناگۆڕێت.

ئێمە بەو نوسراوانە دەگۆڕین کە شتی تازەمان دەدەنێ و باوەڕمان بە چاکی ڕێباوەڕێك یان سەرەتایەك پێدەهێنێت، نەریتی خراپمان بۆ ڕووندەکاتەوە، بۆیە ئەو نوسراوەی کە دەمانگۆڕێت ئاڕاستەی نوێمان دەکات، وبەرنامەی نوی بۆ ژیانمان دادەنێت.

بە (داروین) دەڵێن: ڕووی رۆشنبیری مرۆڤایەتی گۆڕی، کاتێك کە راستییەکانی خستە جێگای باوەڕەکان، وئاسۆی بیرکردنەوەی مرۆڤی ئاسانکرد کە پێشتر نەدەزاندرا، نوسراوەی (أصل الانواع/ ساڵی ١٨٥٦) ، مەزنترین نوسراوەیە کە بیرکردنەوەی ، گۆڕیبێت، وجیهان پاش(٣) ساڵی دی واتا لەساڵی (١٩٥٩)ئاهەنگی (١٠٠) ساڵی ئەو نوسراوەیە دەگێڕێت



کە بەرنامەیەکی نوێی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر نەژادی مرۆڤ دانا، وبیرۆکەی پەرەسەندنی گشتاند، ئەو بیرۆکەیە دزەی کردە نێو مێشکی بیرمەندەکانەوە، و بگرە پارێزگارەکانیش . لەدەروونماندا هەستێکی مرۆڤایەتی نوێی دروستکرد کە بەرەو یەکەیەکی زیندووی برد.

تا ئێستا نوسراوەی وام نەبینیوە لەم جیهانەدا، مەبەستم جیهانی رۆشنبیرانە، توانیبێتی لەنێو دەوروبەری رۆشنبیریدا ئەو هەموو گۆڕانکاری و ئاڕاستەیە بکات، پاش ئەم نوسراوەیە، پەرەسەندن بوو بە هەوەسێکی گشتی، بەپێی بەرنامەکەی بیر دەکەنەوە، وبایەخ دەدەنە ئەنجامەکانی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی مرۆڤایەتی و گۆڕانکاریی لەنێوان ڕووەك و ئاژەڵ و سروشتدا.

ئەو میللەتەی پەرەنەسێنێت، واتا ئەو میللەتەی نەزانێت(داروین) کێیە، ئەوا دەتوانین لە ریزی ئەو هەزارەها گیانلەبەرانەدا دایانێن کەنەماون، جگەلەو نەخشانە نەبێت کەلەسەر بەردیان جێهێشتووە، هیچی تریان لەبارەوە نازانین. بەرەو ئامانج و ڕێگای خۆیان رۆیشتن، ولەبەرئەوەی سڕبوون و پەرەیان نەسەند، نەمان.دەبێت وەرگێرانی نوسراوەی(أصل الانواع) ئەرکێکی پیرۆزی دەوڵەت بێت، ئەو دەوڵەتەی کە ڕێز لەبیری رۆڵەکانی دەگرێت، وحەز دەکات بە دیوارێکی ژیرانە رەفتار و ئامانجیان بگرێت.

ئەم نوسراوە مەزنە، شێوازی بیرکردنەوەی سەردەمە، ئەو میللەتەی نەیزانێت میللەتێکی هاوچەرخ نییە، میللەتێکی سڕو

کۆنە.

نوسراوەیەکی تر هەیە ، سیستەمی کۆمەڵایەتی مرۆڤی گۆڕی زیاتر لەوەی سیستەمی بیرکردنەوەی بگۆڕێت، ئەو نوسراوەیەش ناوی(کوخ العم توم)ە، ژنێکی ئەمەریکی مەزن دانەری بوو بەناوی(هاربێت ستۆ) لەلایەنی هونەرییەوە نوسراوەیەکی زۆر نایاب نەبوو، ساویلکانە بوو، زمان و دەربڕینی لاوازبوون. ئەم خەسڵەتانەش وایلێکرد کە زوو بڵاوبێتەوە لە نێو جەماوەردا، وەك بۆنێکی خۆشی لێهات، وبەراستیش داوای نەمانی کۆیلەتی کردو کۆیلەتی نەهێشت.

مرۆڤ پێش دانانی ئەم نوسراوەیە لە ساڵی(١٨٥٢)دا ، بەفلس وعانە دەفرۆشرا، وەك فرۆشتنی مەڕوبزنو سەگ و تەماتە وگەنم و جۆی لێهاتبوو، ونرخیان دیاریکرابوو،و بازرگانی تایبەتیشیان هەبوو، ودەشیانزانی چ جۆرە کۆیلەیەك نرخی بەرزە، و کامیشیان نرخی نزمە، دەستدرێژی سێکس دەکرایە سەر کۆیلەکان، لە ئەفریکا بە منداڵی دەفڕێندران و دەگوازرانەوە بۆ ئەمریکا، ولەویش بۆ ئیشکردن لە کارگە و ماڵان و جوتیاری دەفرۆشران و بی پارەپوول کاریان دەکرد.

(هاربێت ستۆ) باسی خێزانێکی کۆیلە دەکات لە ئەمەریکا کە پەردەی دوو روویی دڕاند، وهەموو جۆرە ئەشکەنجەدانی رەش پێستی ئاشکراکرد، ویژدانی میللەتی ئەمەریکی وە خەبەرهێنا، دەروونیانی وروژاند، ودڵیانی هەژاند، وبەسەرکردایەتی (ابراهام لنکۆلن)ی مەزن، شەڕی ناوخۆی ساڵی (١٨٦٠) بەسەرکەوتوویی کۆتایی هاتو بڕیاردرا :



کۆیلەتی لەئەمەریکادا، وبگرە لە هەموو جیهاندا نەمێنێت، وبێ ئابڕوویی هەزارەها ساڵی کۆیلەتی نەما.

بەدانانی ئەم نوسراوە مەزنە کۆمەڵی مرۆڤایەتی گۆڕا.

نوسراوەی سێیەم(رأس المال) ی( کارل مارکس)ە، زۆربەی کۆمەڵانی گۆڕی ، فێری کردین چۆن لێکۆڵینەوەی مێژووی رابردوو و ئێستامان بکەین.

چۆن لەپەرەسەندنی ئابووری میللەتان بگەین، ورەچەڵەکی داگیرکەر چییە، وهاوپەیمانییەتی چییە، وهۆی دەوڵەمەندی زۆر و هەژاری زۆر چین؟!...

ئێستا(١٠٠٠) ملیۆن مرۆڤ لە جیهاندا هەن ، هەموو پێشبرکییە ئابوورییەکان بەهەموو خراپەکارییەکانییەوە گۆڕاوە بۆ هەرەوەزی ئابووری کە پڕە لە خێرو مرۆڤایەتی ، ئەم گۆڕانە بە هۆی ئەم نوسراوەیە و نوسراوەکانی تری کارل مارکسەوە بووە.

دەتوانین بڵێین دەیەها نوسراوەی دیکە هەن ، هەوەسی هرزی بیرمەندان و سیستەمی کۆمەڵایەتی میللەتانیان گۆڕی ، نوسینەکانی (ڤۆلتێر) دەمارگیری ئاینی لەئەوروپادا نەهێشێت... نوسراوەکانی (رۆسۆ) وایلێکردین هەستێکی ئاینیمان هەبێت بەرامبەر بە سروشت ..(گۆرگی) فێری کردین کە باوەڕمان بە مەزنی مرۆڤ هەبێت.. نوسراوەکانی (برناردشۆ) پێبگەیاندین و فێری کردین کێشەکەنمان بە گیانێکی پیاوانە و ئازایانە چارەسەربکەین.

ئەمانە ناوی پێنج بیرمەند بوون، دەتوانم

بیانگەیەنمە(١٠٠).

بەشی میسر کوا لەم دانەرانەی کە گۆڕانکاری و جووڵەی پەرەسەندن و پیشکەوتنیان لەنێو کۆمەڵان و مرۆڤدا کردووە.

دەتوانم بڵێم، نوسراوەیەکی بچوکی( قاسم امین) بەناوی(المرأة الجدیدة) کۆمەڵی میسری گۆڕی...راستە زۆر هۆی تر هەن کە ژنیان رزگارکردووە، بەڵام ئەم نوسراوەیە وەك بۆمبێك لە نێوانماندا تەقییەوە ، وەك ئالآیەك بوو کە ئازادو سەربەستەکان لەژێر سایەیدا کۆبوونەوە، بوو بە دروشمێك و خەڵکانی بەیەك ناسی، بەوشە و واتا جوانەکانی دەروونیانی بەرزکردەوە.

هەموومان دەزانین دایکانمان لەژێر پێچە چۆن بوون، وکچ و ژنمان بە جلی ئێستاوە چۆنن، هەمووشمان دەزانین شوێن و پارتمان لەنێو ئەو دوو ئاستە لە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی چۆن بوو، کاریگەری زۆربەی ئەوانە دەگەڕێتەوە بۆ (قاسم امین).

( قاسم امین) راژەی کۆمەڵایەتی کردووە و مرۆڤایەتی لەمیسردا پێشختووە هەروەك چۆن (هاربێت ستۆ) لە ئەمریکادا توانی کۆیلەتی رەش پێست نەهێڵێت، بەڵام لەتەك (قاسم امین)دا نوسەری تر هەن بە تێکۆشانیان لە دانان ورۆژنامەگەریدا ئێمەیان گۆڕی، بەڵام وەك تەقینەوەکەی (قاسم امین)نەبوو .. ئامانجی سەربەخۆیی بۆ دانایین، و لەسەری رۆیشتین و لامان نەدا تا پێی گەیشتین.

(لطفی السید) یش هەر لەرێگای رۆژنامەگەریەوە سەرەتای زانستی بۆ نیشتمانپەروەریی میسر دانا، وبۆ چارەسەرکردنی



کێشەکانمان ئێمەی لەئاستی سۆزەوە بەرزکردەوە بۆئاستی ژیری، و لەسەرەتادا لەبەرئەوەی دژ بە سۆزمان وەستا لێی تووڕەبوین، دواتر هاتینەوە سەرەخۆ و گەڕاینەوە بۆ ژیری، وبەمەش میللەتەکەمان گۆڕا.

چەندین نوسەری تر بەنوسراوەکانیان گۆڕانکارییان لە کۆمەڵی میسریدا کرد.

زۆربەی ئەم نوسراوانە چیرۆك بوون، داوای خۆشەویستییان دەکرد وەك شێوازێکی چێژ وەرگرتن لەنێو لاواندا وئامادەیانی دەکرد بۆ هاوسەریەتی، هەموو جیهان چێژیان لە خۆشەویستی وەردەگرت جگەلە میسر، وشەی (خۆشەویستی) گەر بوترایە لەکاتی دەزگیرانیدا بەئابڕوبردن دادەنرا، بەڵام ئێستا وشەیەکی پیرۆزە، بەڵکو لای باوك و دایکی پێشکەوتوو بە مەرجی پێش هاوسەرییەتی دادەنێن، و خۆشەویستیش بۆتە مافی کوڕ و کچ وەك یەك.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆك نووسان، کەوشەی (خۆشەویستی) یان پیرۆزکرد لەنێو ویژەو کۆمەڵماندا کە پێشتر وشەیەکی گلاو و حەرام بوو، و بەم وشەیە کۆمەڵمان گۆڕا و بوو بە گۆمەڵێکی مرۆڤانە.

نوسەرمان هەن پابەندی (داب)ن.. هەوڵدەدەن وەك (جاحظ) بنوسن، نوسراوە دەخوێننەوە و نوسراوەی لەسەر دادەنێن؟! ئەمانە کۆمەڵیان نەگۆڕی ، لەبەرئەوەی توخنی کۆمەڵ نەکەوتن، هەر بایەخشیان پێنەدا، کێشەکانی کۆمەڵمان نەگەیشتە نێو دڵیان، بەڵام شێوازی (الجاحظ) و کێشەی (الخوارج) و داهێنانی

(المعتزله) و شیعرەکانی (ابونواس) لەنێو دڵیاندابوو.

(قاسم امین) بەراوردی ئێمەی لەگەڵ کۆمەڵانی ئەوروپا دەکرد بۆیە ئێمەی گۆڕی ، هەڕەشەی لێدەکردین و توڕە دەبوو، دواتر ئەم نوسراوەی دانا کە لەنێوانماندا تەقییەوە، وای لێکردین هەست بکەین کە پیاوێك هەیە ئێمەی خۆشدەوێ و لەبەر ئێمە توڕە دەبێت، وئاگادارمان دەکات و پێمان دەڵێت با بگۆڕێین، ئێمەش زانیمان راستگۆیە ،بۆیە گۆڕاین و پێشکەوتین.

سەرەڕای کاریگەری نوسراوە لە گۆڕینی بیرکردنەوە و کۆمەڵماندا، گۆڕین پێویستی بە ئامادەکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری هەیە، داواکردنی گۆڕان تەنها بە نوسراوە، وەك هاوارێکە لەبیاباندا!؟.

بۆ نموونە لەمیسردا کارکردنی ژنان لەپیشەو کارگە و فرۆشگەدا و تێکەڵاوبونیان لەگەڵ بیانیدا و راپەڕینی (١٩١٩) ی سیاسی و ئابووری و فێرکاری ، ئازادیکردن.

نەهێشتنی کۆیلەتی لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا تارادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ زۆرانبازی سەرمایەداری باکوور و هاوڕێکانیان لەباشووردا، ئەوانەی باکوور کرێکاریان بەبەرامبەر بەکاردەهێنا، ولەباشوردا کۆیلەیان بەبێ بەرامبەر بەکاردەهێنان و بەجەنگی رزگاریی کۆتایی بەم زۆرانبارییە هات.

نوسراوە، جووڵانەوەی چاکسازیی بە گەڕ دەخات، وشە دەکاتە هێما وئاڕاستەی دەکات، جوڵانەوەی چاکسازی بە



نوسراوە دەوڵەمەندتر دەبێت، وپەیوەندی نێوان(ئامادەییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان) لەگەڵ (نوسەرو نوسراوەئازادەکان)دا خۆش و توند دەکات.

( ١٧ )

## ( ١٠ ) نوسراوەمان لێ کەمە

وادەزانم کە ئێمە پێویستمان بە(١٠) نوسراوە هەیە، بەدانان بێت یان وەرگێڕان، بۆئەوەی بگەینە تێگەیشتن و هەڵوێستە و ئاڕاستەیەکی نوێ ، لەبەرئەوەی نوسراوەکانمان ناتوانن مرۆڤی هاوچەرخ دەربچێنن.

من دانانم پێ باشترە لە وەرگێڕان، واشدەزانم کەلە میسر و ولاتانی عەرەبیدا هەن بتوانن ببنە دانەر بۆئەو بابەتانەی کە باسیان دەکەم، لەگەڵ ئەوەش ناچاری وەرگێڕانین لە چەند بابەتێکیدا.

١- سەرەتا ئێمە پێویستیمان بە نوسراوەیەك هەیە لەسەر (پەرەسەندن) و نموونەکانیش لەسەر مێژووی نەتەوە کۆنەکانی رۆژهەڵاتی عەرەبی بێت.

چۆن شارستانییەتی کۆن لە ولاتەکانیاندا دەستپێکرد؟... چۆن سیستەمویاساکانی پێشکەوتن؟... و هۆی سستی و نەخۆشی ئەم(٥) سەدەیەی دواییی، چی بوو؟... تۆزێکیش

پەرەسەندنی سروشتی بخەینە سەر پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی، واتا مێژووی میسر پێش شارستانییەتی، وباسی ئەو زیندەوەرانە بکەین کە لە (القیوم)دا دروست بون و نەمان، دواتریش باسی پەرەسەندنی جیهان بکەین .

مەبەستم لەم جۆرە نوسراوە ئەوەیە، پەرەسەندن ببێتە هەوەسی میللەت، بەردەوام بەرەورووی بڕوات، حەزی لە پێشکەوتن بێت، نەیاری گۆڕان نەبێت، خۆشم نوسراوەیەکی کورتم لەسەر ئەم بابەتە داناوە، بەڵام نوسراوەیەکی دووردرێژتر وتێروتەسەلم پی باشترە.

٢- دووەم نوسراوە (التأریخ البشری)یە کە دانەرەکەی(دکتۆر الیوت سیمث)ە کاتی خۆی مامۆستای (تۆیکاری)بووە لە کۆلێژی پزیشکی لە میسردا، ئەم دانەرە(بیردۆزی)یەکی روونکەرەوەی هەیە، لە هەموو پایەختەکانی جیهاندا مشتومڕی لەسەر دەکرێت.

کورتەی ئەم بیردۆزییە ئەوەیە کە، ئەوەی مرۆڤی لە چەرخی بەردی و ژیانینێو دارستان و هەڵگرتنەوەی میوە و رەگەوە دەرکرد، میسرە، میسر کشتوکاڵی داهێنا ، و کشتوکاڵیش وەکو رگێك وایە، هەموو لقەکانی زانست و ئاین و رەوشت و یاسا و هونەرە کۆنەکانی لێکەوتۆتەوە. باوەڕت بێت ئەی خوێنەر نیشتیمانپەرەوەری پاڵم پێوە نانێت بۆ وەرگێرانی ئەم نوسراوەیە ، بەڵکو هەموو ئەو زانستە زۆرە و مێشکە گەورەیە و بۆچوونە قوولانەی نێو ئەو نوسراوە پاڵم پێوە دەنێت، لاوی میسری پێویستی پێیە بۆئەوەی راستییەکانی مێژووی



شارستانییەتی بزانێت.

٣- نوسراوەی سێهەم کە پێویستە وەربگێڕدرێت ، نوسراوەی (الغصن الذهبی)یە دانەرەکەی مێژوو نوسی ئینگلیزی (فرێزەر)ە، لە (٢٢) بەرگ پێکهاتووە، مەرج نییە هەر هەمووی وەربگێڕین، ودانەریش لە (١٠٠٠) لاپەڕەدا کورتی کردۆتەوە، ودڵنیام گەرهاتوو کرا بە عەرەبی راپەڕین و شۆڕشێکی بیرکردنەوە دروست دەکات، بابەتی نوسراوەکەش ئەمەیە:-

چۆن مێشکی مرۆڤ وێڵ بوو؟.. و چۆن ژیر بوو؟.. واتا چارەسەری داستانە کۆنەکان و چۆنیەتی دروست بوونیان دەکات، وچۆن دزەی کردە نێو رۆشنبیرییە یەك لەدوای یەکەکانەوە.

بابیریشم نەچێت، ئەم نوسراوەیە پێچەوانەی نوسراوی(التأریخ البشری)یە کە هەموو شتێك بۆ میسر دەگەڕێنێتەوە، بەڵام نوسراوەی (الغصن الذهبی)ی (فرێزەر) پشت بەوە دەبەستێت کە دەوربەری مرۆڤایەتی بەیەك دەچن، بۆیە بەڕەوشت و داب ونەریت و باوەڕ و هونەری لێکچوو کۆتایی دێت.

مافی خوێنەرە ئەم دوونوسینە لەیەك نەچووە بناسێت، وبەهێزی بیرسازای و زانیارییەکانی دەرئەنجامی ئایندەی بۆ دەردەکەوێت.

٤- نوسراوەی (خلاصە التأریخ) ی(وێلز) چوارەم نوسراوەیە، ودەتوانین نوسراوەیەك دابنێین لەو باشتربێت،

ئامۆژگاریم ئەوەیە: ئەم نوسراوەیە بە دانان بێت نەك بەوەرگێڕان، حەز دەکەم ئەم نوسراوەیە بۆ بەراورد دابنێم، لەبەرئەوەی زۆر باشترە لە نوسراوەی(التأریخ العام للعالم) کە وەزارەتی پەروەردە وەریگێڕا و چاپی کردو(هامر تۆن) یش سەرپەرشتی کردبوو...بۆ؟...

لەبەر ئەوەی نوسراوەی(خلاصە التأریخ) ئاڕاستەکەرە، هەموو مرۆڤ بەیەك نەتەوە دادەنێت، ودوور کەوتۆوتەوە لە درێژەپێدان ، بەکورتییەکی پڕ و تێر نوسیویەتی کەچی نوسراوەی(هامرتۆن) بەدووردرێژی و بێ ئاڕاستە و روونکردنەوە نوسراوە.

٥- **نوسراوەی(تأریخ الدولە الرومانیە)ی (جیبۆن) نوسراوەی پێنجەمە**، بەشێوازی (الطبری)نوسراوە ولە ئەوروپاش زۆر ناخوێندرێتەوە، ئەم نوسراوەیە چیرۆکێکە بێ لێکۆڵینەوە بەڵام راستە... ئامۆژگاریم ئەوەیە: ئەم نوسراوەیە وەرگێڕدرێت، لەبەرئەوەی نەتەوەی عەرەب مێژووی بۆ ماوەی(٧٠٠-٨٠٠) ساڵ لکابوو بە مێژووی دەوڵەتی رۆمانییەوە، کە بێشەرمترین و ستەمکارترین دەوڵەت بووە لە جیهاندا بۆیە دەبێت بیزانین و بیناسین .

٦- **نوسراوەی شەشەم ژیانی(لیونارد دافنشی)یە**، لەبەرئەوەی راپەڕینی ئەوروپا لە کەسییەتی ئەودا دەردەکەوێت، کە خەڵك وەك منداڵی لێهاتبووو بێ شەرم وسڵ کردنەوە پرسیاریان دەکرد، لاوەکانمان کاتێك ژیانی ئەم مرۆڤە دەخوێننەوە، لەمانای راپەڕین دەگەن کە تا ئێستا لە میسردا



نایزانن. ئەوساکەش دەتوانن دۆست و دوژمنان لەیەك جیابکەنەوە، وبەهۆیەوە نەخشەی ئایندەی وڵاتیان بکێشن.

بۆمان هەیە ئەم نوسراوەیە بەدانان بێت یان بە وەرگێڕان، من دانانم پێ باشترە، گەر مێژوونوسان دانەری بوون کە پێویستە باوەڕیان بە چیرۆك نەبێت، بەڵکو بەئاگاهێنان و روونکردنەوە و ئاڕاستەکردن ئامانجیان بێت و باشترین نوسراوەش کە بیر روونـاك دەکاتەوە وپێیدەگەیێنێت، ئەم نوسراوانەن کە چیرۆکە زانستییەکان راڤەدەکەن ، چۆن پەیدابوون؟... چۆن پەرەیان سەند و پێشکەوتن ؟... تا گەیشتە ئاستی ئێستایان.

٧-**چیرۆکی زانستێك** ، **چیرۆکی مرۆڤێکە** ، یان چیرۆکی بیری مرۆڤێکە، وسیستەمی کۆمەڵەکەیەتی. پێم باشە نوسراوەیەك لەسەر مێژووی پزیشکی دابنێین.. لەو کاتەوەی کە کۆرپە بوو لە باوەشی سیحردا، تا گەیشتە دەرمانی (ئۆریۆماسین)، لەبەرئەوەی تەنها مێژووی ئەم زانستە مرۆڤ دەگوازێتەوە لەئەفسانەوە بۆ راستییەکان، وتائێستاش هێمای پزیشکی ، هێمای ئاخوندە میسرییەکانی پێشوون، وشەی (طب) لە زمانی عەرەبیدا مانای (سحر) ە، و(طبیب)یش(ساحر)ە.

مەبەستی من لە هەڵبژاردنی ئەم نوسراوانە زیادکردنی زانیارییەکان نییە، بەڵکو تەنها مەبەستم دەستنیشانکردنی بەرنامەیە، ومەبەستیشم لە خوێندنەوەی نوسراوەی (جیبۆن) ئەوەیە کە: مێژووی نەزانی و گەندەڵی و دڕەندەیی و بێ شەرمی

دەوڵەتی رۆمانی بزانرێت، لەبەرئەوەی پەیوەندارە لەگەڵ مێژوومان. کەواتە نوسراوەی حەوتەممان (مێژووی پزیشکی)بوو.

٨- نوسراوەی هەشتەمان کە کتێبخانەی عەرەب پێویستییەتی، نوسراوەی(مێژووی شۆڕشی فەرەنسی)یە، وحەزیش دەکەم بە دووردرێژی باسی سەرەتاکان و کەسان و پیاوەتی و ناپیاویی پیش شۆڕش و لەکاتی شۆڕش و دوای شۆڕشیشدا بکات، نوسراوەی ئەوهاش (٧٠٠-٨٠٠) لاپەڕەی دەوێت، لەبەرئەوەی هەموو شۆڕشێك بەشێكە لەپەرەسەندنی نەتەوەیەك و پێشكەوتنەكەی، نەتەوەی بێ شۆڕش نەتەوەیەكی سڕو بێجولەیە، ودەبێت بزانین كە بناغەی هەموو شۆڕشیكیش گۆڕینی شێوازی بژێوییە، ئەم گۆڕانەش پاڵ بەو كەسە ستەملێكراوانەوە دەنێت كە گۆڕین لەنێو كۆمەڵدا داوا بكەن، ئەو نەتەوەی شێوازی بژێوی نەگۆڕێت، واتا شێوازی وەبەرهێنانی نەگۆڕێت، شۆڕشی تێدا ناكرێت.

شۆڕشی گەورەی فەرەنسا شۆڕشێكی مرۆڤایەتی بوو بەرنامەو هێما و یاسای دانا.. گیان و كەرەسەی مرۆڤی دەوڵەمەندكرد، ئازایەتی و بوێری بۆ چوونە نێو ئایندە زۆركرد، بۆیە نابێت هیچ مرۆڤێكی ئازاد و پەرەسەندوو نەیزانێت، وبائەوەشمان لەبیر نەچێت كە وشەی(یەكسانی) لەنێو هەموو یاسا مرۆڤایەتییەكان ، شۆڕشی فەرەنسا داینا.

٩- نۆیەم نوسراوەش: دەبێت مێژووی میسر بێت، مەبەستیشم مێژووی داگیركردنی میسرە لەلایەن بەریتانیاوە،



نوسراوەی(التأریخ السری للأحتلال البریطانی لمصر)ی(بلّنت) كە خۆم لە رۆژنامەی(البلاغ)م وەرگێڕاوەو بڵاوەكراوەتەوە، وئەم نوسراوەش چاپكرا و لەبازاڕدا نەما، وئەم نوسراوەیە وایلێكردم كە( عرابی)یم خۆش بوێت و باوڕ بەوانە نەكەم كە گەمژەن بەرامبەری ئەم نوسراوەیە بەسوودە.

نوسراوەیەكی تر هەیە بەناوی (خراب مصر) لە دانای (رۆذنستین)ە.. حەزدەكەم هەردوو نوسراوەكە بخوێندرێتەوە بۆ ئەوەی بزانرێت كە داگیركەر شێوازە بۆگەنەكانی بۆ كوشتنی نەتەوە، پاش كەوتنە نێو تەڵەكانیان چین؟!...

١٠- دوانوسراوە دەبێت باسی دووەم جەنگی جیهان بێت، هۆیەكانی و ئەنجامەكانی، وداهێنەكانی چین ؟.. و چەند لە جەنگەكانی دیكە نزیكن كە بوونە هۆكاری ، و دەبێت لە بیرشمان نەچێت كە جەنگ گەورەترین هۆیە بۆ جەنگ.

ئەم (١٠) نوسراوەیە وا دەزانم كتێبخانەكانمانی پێ پڕدەكەینەوە، ودەبینە نەتەوەیەكی هاوچەرخ، ونەیاری پەرەسەندن نابین، بەڵكو هەوڵیشی بۆ دەدەین، و مەبەستیشم لەدانان و وەرگێڕانی ئەم نوسراوانە ئەوەیە نییە كەببنە نوسراوەی پسپۆڕی بۆ خوێندكاری زانكۆ، بەڵكو مەبەستم ئەوەیە كە ئەم نوسراوانە بۆ جەماوەری خوێنەرانی میسرو وڵاتانی عەرەب بێت ، بۆئەوەی لە ئێستادا بژین، وبۆ ئایندەشیان سبەینی بەئاگا بێن.

(١٨)

## فەرهەنگە عەرەبییەکان

خوێندمەوە کە خانەی(لاروس) خاوەنی فەرهەنگە فەرەنسییەکان لەپاریس دەستیانکردووە بە دانانی فەرهەنگێکی هاوچەرخ بە زمانی عەرەبی ... ئەمە زۆری نیگەرانکردم و هەستیشمی بریندارکرد.

واش تێگەیشتم کە پشت بەچەند مامۆستایەکی زمانی عەرەبی لە کۆلێژی (الیسوعین)ی بەیروت دەبەستن، وچاکەی ئەم کۆلێژە لەسەر زمانی عەرەبی گەلەك زۆرە هەر ئەوانیش بوون پێش(١٠٠)ساڵ (١٠) بەرگی (لمجانی الادب)یان بڵاوکردەوە، چەند بەرگێکیان فەرهەنگی وێژەیی بچوکن و سەرچاوەیان زۆرە.

هەر ئەوانیش بوون گۆڤاری (المشرق)یان چاپکرد، کە بایەخی بە لێکۆڵینەوەی عەرەبی دەدا... بەڵام ئاراستەکەیان تۆزێك بەرەو ئاین رۆیشت و خوێنەریان کەم بۆوە.

دیسان چاکەکە بۆ بەیروت دەگەڕێتەوە کە دوو فەرهەنگی هاوچەرخی چاکیان پێش(٧٠) ساڵ چاپکرد بەناوی(محیط المحیط)و(أقرب الموارد) تا ئێستاش نوسەر و رۆشنبیر لە وڵاتانی عەرەبیدا پیشتیان پێدەبەستن.



ئێمە وەزارەتی پەروەردەمان هەیە و ساڵی (١٠٠٠٠٠) جنیە بۆ کڕینی نوسراوە سەرف دەکات، یەك لەو هەموو وەزیرانەی پەروەردە کەسیان رانەسپارد بۆ دانانی فەرهەنگێکی هاوچەرخ بە زمانی عەرەبی بۆ خوێندکاران ، سەرەڕای ئەوەی کە کۆلێژیکمان هەیە بەناوی(دار العلوم)و(٧٠) ساڵە پسپۆرە لە زمانی عەرەبیدا، کەسیان تێدا هەڵنەکەوت خۆی و ژیانی تەرخان بکات بۆ دانانی ئەو فەرهەنگە!؟...

لە زانکۆکان کۆلێژی تایبەتمان هەن بۆ زمانی عەرەبی و زمانە سامییەکانی دی. نەدەرچووانی و نەمامۆستایانی هەوڵی دانانی ئەم فەرەهەنگەیان نەداوە، بۆیە کۆڕی زمانی عەرەبی لە میسردا گوێی نەدا بە هەوڵەکانی (لاروس) بۆ دانانی فەرهەنگێکی عەرەبی نوێ.

بەڕای من هۆی زۆر هەن بۆ ئەم کەمتەرخەمییە ، وەزارەتی پەروەردە بەشداری لە گۆڤارێکی بێ پێزدا کردبوو(١٠٠٠) دانە لەو گۆڤارەی وەردەگرت و ساڵانە (١٠٠٠) جنیهی دەدانێ، ولاشی پەسەند نەبوو ئەم پارەیە بۆ ماوەی (٣یان ٤) ساڵ سەرف بکات بۆ دانانی فەرهەنگێکی باش و بەسوود بۆ خوێندکاران و رۆشنبیران، لەبەر ئەوەی گۆڤارەکە ئامادەبوو بە شان و باڵی وەزیر هەڵدا، بەڵام فەهەرنگەکە ئامادەنییە؟

زۆربەی مامۆستاکانی زمانی عەرەبی تووتیانە پێگەیشتوون، نەك داهێنەرانە. بەستنەوەی زمان بەئاین شێوازی فێرکردنمانە، وهەستی پارێزگاری لە ئاینەوە گواسترایەوە بۆ زمان، ئیتر زمان وەك زانست نەمایەوەو وەك ئاینی لێهات،

باوەڕێکە نەوشەکانی و نەرێساکانی دەگۆڕین، یەك وشەی بیانی ناچێتە سەر، گەر لە ترسی و دوودڵی و شاردنەوەوە نەبێت، وەك ئەوە وایە ئەم زیادکردنە کفر بێت، مامۆستاکانی زمانی عەرەبی وەك مامۆستاکانی ئاینیان لێهاتووە بە دوای رابردوو دەکەون و لەئایندەش دووردەکەونەوە.

(دار العلوم)ئەو کۆلیژەی پسپۆڕی زمانی عەرەبی دەردەچواند، بەپێی ئەو مەرجانەی کە بۆ وەرگرتنی خوێندکاران داینابوو مەسیحی و جولەکە وەرنەدەگیران؟!..

بەم سیستمە زمانی عەرەبی سڕبوو پەرەینەسەند، مامۆستاکانی بیریان لە دانانی فەرهەنگێکی عەرەبی هاوچەرخ نەکردەوە، کە وشەی( بایەلۆجی) و(سایکۆلۆجی) لە تەنیشت وشەی (مجان)و(أستعارە) دابنێن، بۆیە باوەڕەیان هەر بە فەرهەنگە کۆنەکان هەیە و وشەی هاوچەرخەکانیش بەپەسند نازانن ، لەبەرئەوەی دوورن لە گیانی هاوچەرخەوە.

ئەم جیاوازییە لەنێو مامۆستاکانی زمانی عەرەبیدا لە زانکۆی بەیروتدا نییە، ئەمە دەردە دەروونییەکەمانە کە قینمان لە دانانی فەرهەنگێکی عەرەبی هاوچەرخ دەبێتەوە لە میسردا، ولەبەیروتیش حەزیان بە دانانیەتی...

سەرەڕای تاڵی سەر زمانم و نیگەرانیم ... داوا لە خانەی( لاروس)ی فەرەنسیو زاناکانی زمان لە کۆلێژی (الیسوعین) دەکەم سەرکەوتووبن لە پرۆژەکەیان و بەم زووانەش ئەو فەرهەنگە لەسەر رەفەی کتێبخانەکانمان دەبینرێت بۆ راژەکردنی زمانمان کە نە دەزگاکان و نەپیاوەکان کردیان.



هەموو رۆشنبیرێك پێویستی بە فەرهەنگێك یان بە چەند فەرهەنگێك هەیە، ئێستا وا من ئەم نوسراوەیەتان بۆ دەنوسم (٦٩) فەرهەنگم لەپێشە، بەشێکی عەرەبین و،ئەوانی دیکە بایەلۆجی و ئاینی و وێژەیی و فەلسەفی و زانستین، وهەیشە بە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزییە، واش دەزانم کە من لەنێو رۆشنبیراندا کەمترین فەرهەنگم هەیە، لەم ژمارەم زێتر هەبوو بەڵام ئەوانەی کۆن دەبن، زوو مەرخەسیان دەکەم ، جا ئیدی مرۆڤ بێ یان نوسراوە؟!....

ئەوروپاییەکان بایەخی زۆر دەدەنە فەرهەنگ وباوەڕیان وایە کە لەدانان و لێکۆڵینەوە وتوێژینەوەدا، کار ئاسانیان بۆ دەکات،بۆیە ئێستا بۆ هەموو زانستێك و هونەرێك، فەرهەنگ پسپۆڕانە دادەندرێت.

کە سەیری کتێبخانەیەك دەکەم و فەرهەنگی بچووك بۆ منداڵان دەبینم، زۆر دڵخۆش دەبم، لەبەرئەوەی منداڵێك جاریێ (١٠) ساڵی تەواو نەکردووە، بەم فەرهەنگانە دەتوانێت نوسراوەیەکی قورس لە بواری بایەلۆجی و رووەك و ئاژەڵدا بخوێنیتەوە، لەبەرئەوەی وشەکان وێنەداران ، و کردارەکانیش رەنگاورەنگە و منداڵەکەش حەزی دەچێتە خوێندنەوەی.

دیاریکردنی مانا لە بیری خوێنەردا بایەخێکی زۆری بەم زانستە نوێیە داوە کە ناوی(سیما)یە، واتە زانستی هێما، بەواتای ئەوەی وشە هێمایە، چەسپاندنی مانا لەبیردا مەبەستی ئەم زانستەیە، هەیە دەڵێت دیاری کردنی مانا لە وشەدا کە لەزانستدا بەکاردێت ئامانجی فەلسەفەیە ، واتا لێکۆڵینەوەی

فەلسەفی لێکۆڵینەوەی زمانەوانییە.

ئێمە لەگەل ئەم رایەدا نین، بەلام گۆمانی تێدا نییە کە بیرکردنەوەی راست و رێك بێ وشەی راست و رێك روونادات، لێرەدا بەهای فەرهەنگی چاکی ئاسان، دەردەکەوێت.

ئێمە لەم کاتەدا پێویستیمان بە (١٠) فەرهەنگی عەرەبی هەیە بۆ رێکخستنی رۆشنبیریمان و بیرمان، پێویستیمان بە فەرهەنگێکی سەرەتایی هەیە لە (١٠٠٠) وشە زێتر نەبێت، منداڵ بەئاسانی بەکاریدەهێنێت، ودەبێت هەموو وشەیەك بەوێنەوە بێت. بۆ نمونە، وشەی ئاسك وێنەی ئاسکی لەگەڵ بێت، وشەی رائەکات وێنەی منداڵێکی تێدا بێت کە رادەکات....وهتد...

دواتر پێویستمان بە فەرهەنگێکی مامناوەندی هەیە لە (٨٠٠٠بۆ١٠٠٠٠) وشەی وێژەیی و زانستی و سایکۆلۆجی و بایەلۆجی و(میسرولۆجی) تێدا بێت، خوێندکارەکانمان پێش چوونیان بۆ زانکۆ بەکاری بهێنن.

پاش ئەمە پێویستیمان بە فەرهەنگێکی گەورە هەیە(٣٠-٤٠) هەزار وشە لە خۆبگرێت بە هاوواتەکانییەوە و لەچ وشەیەکەوە هاتوون، ئەمەش لە پێداویستەکانی خوێندکارانی زانکۆیە.

دوای ئەمانە پێویستیمان بە فەرهەنگی پسپۆڕ هەیە:-

پێش هەموویان فەرهەنگی (أشتقاق) لەگەڵ فراوانکردنی وشەی لاتینی یان عبری یان بابلی یان فارسی، وهتد... ئەم فەرهەنگە لەرووی مێژووی زمانەوانییەوە چاومان دەکاتەوە، و



خۆشی هەر لێکۆڵینەوەیەکی ئینثروبایەلۆجی و مێژووییە.

دواتر فەرهەنگی زانستەکان وەك فەرهەنگی (میسرۆلۆجی)واتا شوێنەواری کۆنی میسر، وفەرهەنگی پزیشکی و فەرهەنگی بایەلۆجی و فەرهەنگی جیۆلۆجی وهتد..

لێرەدا لەبیرمان نەچێت کە پێویستە فەرهەنگە کۆنەکان چاپبکرێنەوە ، وەك

فەرهەنگی (اساس البلاغه)ی (الزمخشری)

فەرهەنگی (لسان العرب) ی(أبن منظور)

فەرهەنگی (القاموس)ی (فیرۆز أبادی)

ئەمانە کەلتورن،وجێی بایەخدانی رۆشنبیرانن،وپێویستیمان بە فەرهەنگی دیکە هەیە بۆ وەرگێڕانی وشەی بیانی بۆ وشەی عەرەبی ، و دانانی فەرهەنگی راستو هەرزان بۆ خوێندکارانی زمانی بیانی ئەرکی وەزارەتی پەرەوەردەیە.

لە کۆتاییدا دەڵێم پرۆژەکەی (لاروس)ی فەرەنسی، باهاندەر بێت و پیاوەتیمان تێدا زیندوو بکاتەوە بۆچاپکردنی ئەو فەرهەنگانەی راژەی رۆشنبیری عەرەبی هاوچەرخ دەکەن.

(١٩)

## رۆشنبیری منداڵانە

مەبەستم لەم سەردێرە سوکایەتی نییە، بەڵکو مەبەستم ڕێزلێنانە، ڕێزلێنان لە منداڵەکانمان، لەمیسردا زیاتر یان کەمتر لەیەك ملیۆن منداڵی تەمەن (٨ بۆ ١٦) ساڵ هەن، ئەو منداڵانە دەپرسن و دەڵێن:- کوا بەشی ئێمە لەرۆشنبیری ئەم چەرخەی کە تیایدا دەژین؟.. کوا نوسراوە؟... کوا گۆڤار؟؟...

نوسراوەی (حیوانات عرفناها) کە (دکتۆر احمد زکی) سەرۆکی زانکۆی قاهیرە وەریگێرابوو هانی دام کە ئەم بابەتە بنوسم، ئەم نوسراوەیە گەورە دەیخوێننەوە و سوودی لێوەردەگرن، بەڵام منداڵان بە گۆرانی و خۆشی دەیخوێننەوەو سوودێکی زۆری هەیە بۆیان، لەبەرئەوەی بەتایبەتی بۆئەوان نوسراوە ، وا باشە زیرەکترین پیاوەکانمان بۆ منداڵەکانمان بنوسن.

سروشتی زەویمان، بەمرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك و شاخ و ڕووبارەکانەوە باشترین چیرۆکن بۆ منداڵەکانمان و سەرنجیان زۆر ڕادەکێشن...ئەم دیاردە سروشتییانە ئارەزووی یەکەم بیرکردنەوەم بوون، دواتر ئارەزووی زانستیم پەیداکرد، ولەوێشەوە بازمدا بۆ بیردۆزی پەرەسەندن کە ئەندێشەمی



فراوانکرد، وهەست و مرۆڤایەتیمی پەراندەوە بۆ هەموو جیهان و مرۆڤ وگیانلەبەرەکان.

باوەڕ ناکەم هیچ نوسەرێکی مەزن و بیرمەندێك لە منداڵییەوە پەیوەندییەکی نەبووبێ لەگەڵ سروشتدا، (داروین) و(سبنسر)و(جان جاك رۆسۆ)و (مەکسیم گۆرکی) و (ئەندرێە جید) و دەیانی دیکە، هەر لەمنداڵییەوە سۆزیان بۆ سروشت زۆربووە، وئەم هەستەش تۆوی یەکەم رۆشنبیری لە وێژدانیاندا چاندووە، ودواتر فراوانیان کردووە، وپێشکەوتوون و بوونەتە نوسەری مرۆڤانە.

پێش (١٠)ساڵ نوسراوەی (طیورمصر)ی (احمد حماد الحسنی)م دەستکەوت کە پیاوێکی مەزنە، وامزانی زێرو زیوی دنیام دەستکەوتووە، و هەستم کرد نیشتمانپەروەرییەکەی دەخاتە سەر زانستەکەی، وزانستەکەشی خستۆتە سەر نیشتمانپەروەرییەکەی. باسی زێتر لە (١٠٠-٢٠٠) باڵندەی نێو میسردەکات، هەر لەباڵندە ڕەسەنەکانەوەو هاتووەکان و کۆچەرەکان و بێدەنگەکان و دەنگ خۆشەکانەوە، وتا دەگاتە بێ وەیەکان ونێچیرەکان و چرنوکدارەکان وراوکەرەکان، بەوێنەکانیان و ناوەکانیانەوە

زانیاری ڕێبازی خۆشەویستییە، کە ئەم نوسراوەیە دەخوێنیتەوە میسرت خۆشدەوێت، ئەم نوسراوەیە خەموخەفەتێکی زۆری دامێ، لەبەرئەوەی وێنەکانی رەش و سپی بوون، وجوانی باڵندەکان و کلکە زەردەکانیان و سینگە سورەکانیان و دەندوکە سپیەکانیانی لێ شاردبوومەوە.

باڵندە گوڵی ئاسمانن، وێنەی گوڵیش بەرەنگی رەش، گوڵت پێشان نادات. گەرئەم باڵندانە وێنەکانیان رەنگاو رەنگی سروشتی بان، ئەم نوسراوەیە شتێکی دەگمەن دەبوو بۆ منداڵان، و گەورەکانیش باشتر دەیانناسینەوە، و بەپیاسە دەچوونە نێو کێڵگەو بیابانەکان، شارەزای نەریت وگواستنەوەیان دەبوون، هێلکەو هێلانەکانیان دەناسینەوە، بایەخیان زیاتر دەدانێ، ئەم بایەخدانە خۆشیو گۆرانی وتنو ویژدان لە ژیانماندا زیاددەکات، وهەستیش بەو پەیوەندییە پیرۆزە دەکەین لەگەڵ بووندا، وپەیوەندییەکی گەرمو گوڕ دروست دەبێت لەگەڵ سروشتدا. ئەو سروشتەی کە دایکی یەکەممانە.

من دەزانم بۆچی ئەم نوسراوەیە رەنگاو رەنگ نەبوو؟!... لەبەرئەوەی ئەم رەنگانە لە (٧٠٠تا٨٠٠) جنیهی زیاتر لەرەشوسپی تێدەچوو، ولەتوانای دانەر نەبوو، گەر لەتواناشیدا با نەیدەوێرا ، کێ دەیوت پارەکەی بۆ دەگەڕاوە؟!. بەدڵنیاییەوە دەیڵێم کە وەزارەتی پەروەردەش تا نوسراوەی هیچ و پوچ هەبێت، نوسراوەی وا گرنگ ناکرێت بۆ دابەشکردنی بەسەر منداڵەکانماندا.

ئەوەی کە جاران نەرەخسابوو بۆمان، دەبێت ئێستا بڕەخسێت، چاپکردنی ئەم نوسراوەیە بەرەنگاو رەنگ هەر راژەی زانست نییە، بەڵکو راژەیەکی نیشتمانی و مرۆڤایەتییە.

<u>چۆن منداڵمان رۆشنبیر بکەین؟؟</u>

حەز بە رۆشنبیریو زانیاری و پەرەسەندنی بیر، نەریتیکە



وەك نەریتەکانی تر، گەر لە منداڵییەوە فێربکرێن ، چەسپاوەتر دەبێت و بیر ناچێت.

نوسینی ئەوروپاییەکان بۆ منداڵانی تەمەن(٣-٧) ساڵ جێگەی سەرسوڕمانە، لەقاهیرەش دەتوانین نوسراوەیەك بکڕین وێنەی قەبارەداری تێدا بێت، لادێیەکی جوان بەوێنەی مرۆڤ و ئاژەڵ و رووەك و ئامێر رازابێتەوە، ئەمانە دەبنە جێی سەرنج و پرسیاری منداڵێکی تەمەن لە (٥) ساڵ زیاتر.

لێرەدا نوسراوەیەك هەیە بە ناوی (حدیقه الحیوان)بە (٣٥) قڕشم کڕی و بەزمانی فەرەنسی بوو دامە دەست منداڵێك تەمەنی(٧) ساڵ بوو لەماوەی حەفتەیەکدا توانی ناویان بهێنێت وردە وردە وێنەیان بکێشێت.

بەڵگە نەویستە، دیتنی ئاژەڵ لەباخچەی ئاژەڵدا منداڵ زێتر فێردەکات لە نوسراوە، بەڵام نوسراوە فێرە خۆشەویستی رۆشنبیری دەکات، وبیرە بچووکەکەی گەورەتر دەکات، تا وای لێدێت، پاش گەورەبوونی نوسراوە دەبێتە کەلوپەلی نێو مێشکیو ماڵی، ودەبێتە بابەتی قسەکردنی و شێوازێکیشە بۆ پەرەسەندنی...

من لێرەدا مەبستم ئەوە نییە، کە نوسراوەمان نییە بۆ منداڵ، لەبەرئەوەی (احمد عطیةوکامل کیلانی)م لەبیرن، یەکەمیان وازی لە نوسین هێنا بۆ منداڵان، بەڵام دووەمیان هەتا ئێستاش لەتێکۆشانە بۆ روونکردنەوە و رۆشنبیرکردن، وئەم تێکۆشانەی کردە نامەی ژیانی.

دەشزانم کە توانایەکی زۆر بەکاردێت بۆ دەرهێنانی گۆڤاری

منداڵان، وداهێنانیش لەو بوارەدا هەیە، (بابەشارو) لەرۆژنامەی (الآخبار الجدیدە)، گۆشەیەکی حەفتانەی تایبەتی بۆ منداڵان هەیە.

ئێمە زۆر لەوە زیاترمان دەوێت، پێویستیمان بە (طیور مصر) و (نباتات مصر) هەیە، بەڵام با رەنگ و رەنگ بن، پێویستیمان بە نوسراوە هەیە لەسەر دراستان و زریزەی مرۆڤایەتی و فرعەونییەکان و شارستانییەتی هاوچەرخ.. وهتد، ئەمەش دەبێت هەمووی رەنگاو رەنگ بێت، تا هانی منداڵ بدات وبیری بکاتەوە و خەوی خۆشی پێوە ببینێت، وئەندێشەی بجولێنێت و رامانی زۆر بکات.

من باسی نوسراوەکانی ئەوروپام کرد، بەڵام کتێبخانەی منداڵ بەرامبەر بە بایەخدانی ئەوروپاییەکان بۆ منداڵ هیچ نییە، فەرهەنگی تایبەت هەیە منداڵی تەمەن(٨-٩) ساڵ دەتوانێت بگەڕی بەشوێن وشە وماناکەیدا، فەرهەنگێکی ئەمەریکیم دیت کرداری کردبوو بەوێنە، وەك لێدان و خواردن و راکردن...هتد، بۆئەوەی منداڵێکی(٤-٥) ساڵی تێبگات.

ئەی چی بڵێم؟!.

فەرهەنگی منداڵانی وا هەیە، بۆ نمونە، فەرهەنگی (جۆنیۆر ئینسایکلۆپیدیا)بە (١٠) جنیە زیاترە، دانراوە بۆ منداڵی تا تەمەن (١٦) ساڵ، لە چەند بەرگێکدایە پڕە لە وێنەی رەنگاورەنگ و بەرگێکی داپرشراوەی قەشەنگی هەیە، بەڕای من منداڵێك ئەوەی هەبێت، لەژیاندا بەرەو رێگای زانست و فەلسەفە دەڕوات، بەپێچەوانەوە منداڵێکی تر گەر ئەم فەرهەنگەی نەبێت،



بۆئەو زەحمەتترە، لەبەرئەوەی پێکهاتەی کەسییەتییەکەی پڕ نەبووە لەم هەموو زانیارییانە و گرنگی نەداوە بە ئاسۆی دوور و هەمەجۆر.

گۆڤاری منداڵانی ئەوها هەیە لەئەوروپادا، من خۆم لەتەمەنی(٥٠) ساڵیدا خوێندومنەوە، وسوودم لێوەرگرتوون، ئەوەندەش بەئاسانی نوسراون، منداڵێکی تەمەن(١٠) ساڵی زەحمەتی تێدا نابینێت.

ئەم جۆرە نوسراوە و فەرهەنگ و گۆڤارانە بیری منداڵان گەشەپێدەدەن، وئاسۆی رۆشنبیرییان فراوان دەکەن، ولێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان لا خۆشەویست دەکەن، وخەریکە بڵێم زیرەکیشیان زیاتر دەکەن.

ئێستاش کە منداڵیم بەبیردێتەوە، دەبینم نوسراوەی(الفوائد الفکریە) و(کلیلەو دمنە) نە حەزی خوێندنەوەی زۆر کردین ونە ئاسۆمانیشی فراوانکرد، نوسراوەی بێ وێنە، وبەتایبەت نوسراوەی(کلیلە و دمنە) دەیتوانی دەیەها وێنەی پێکەنین و خۆشی لە خۆی بگرێت کە تائێستاش تیایدا نییە.

فێرکردنی پیتەکان و رێسای زمان تا ئەم چرکەیەش زەحمەتە و منداڵ لێی بێزار دەبێت، تائێستاش بەیەکەم پیت دەڵێن (ألف) وەك فینیقییەکانی پێش (٣٠٠٠) ساڵ، کەچی ئەوروپاییەکان کردوییانە بە (أ) بۆئەوەی دەنگی پیتی (ل)و (ف) تێکەڵ بە (أ) نەبێت، وئەمەش لەرێسای زمانی عەرەبیدا نییە.

بۆچی ئەوها ئەزیەتی منداڵانمان بدەین؟!...

مامۆستا(حسنى العرابى) پێی وتم: ڕۆژهەڵاتناسە ئەڵمانییەکان، هەموو ڕێساکانی زمانی عەرەبییان، کە خوێنەرو نوسەر پێویستیان پێی هەیە، لە (١٢) وانەدا کۆ کردۆوتەوە. باشە.... بۆچی ئێمە ناگەڕێن بەشوێن ئەم ڕێبازە سووك و ئاسانە؟؟...

مامۆستا(احمد جمعه) ڕێبازێکی هەیە، بەیاری منداڵان فێرە خوێندنەوە دەکات، خستییە بەردەم وەزارەتی پەروەردە، منیش لێکۆڵینەوەم کرد و ئامۆژگاریم کردن کەلەسەری بڕۆن، بەڵام نەکرا...!!

دەبێت ڕاژەی منداڵەکانمان بکەین، و ڕۆشنبیری یان خۆشبوێت، وزانیارییان لەسەر جیهان و مرۆڤ و سروشت هەبێت، ولەتەمەنی(٤-٥) ساڵیدا، نوسراوەی خۆشیان بۆ دابنێن، وشە و خوێندنەوەی ئاسانیان فێر بکەین، ئەمە مافیانە و ئەرکی ئێمەشە، منداڵ وەك لاو وایە، چەند نەریتی چاکی فێر بکەی و پەروەردەی چاکی بکەی ئەوەندە کەسییەتی و پەروەردەی ڕێك و پێك دەبێت.

بەرێککەوت کە ئەم بەندەم دەنوسی، ڕۆژژنامەی(تایمس)م لە (١٩٥٥/١١/٢٧) بەرچاکەوت ، پاشکۆی ئەم ڕۆژنامەیە(١٠) لاپەرەی گەورەبوو ناوی(٣٠٠) نوسراوەی بەوێنەوە تێدابوو لەتەمەنی(٦-١٥) ساڵ و زیاتر سوودی لێوەردەگرن، ئەم نوسراوانە هەموو ئەو بابەتانە دەگرنە خۆ کە جێی بایەخی مرۆڤن، بەشێوازێکی ئاسان و وشەی باو نوسراون ، جگە لە هەزارەها وێنەی ڕەنگاورەنگ.



لەنێو ئەم نوسراوانەدا، چیرۆك و شیعر، سەیرو سەمەرەی نێو دەریا و ئەستێرەو هەسارە، وباڵندە و دڕندە و ژیانی جوتیار و ژیاننامەی داهێنەرەکان و چیرۆکی زۆرڕەوی دۆزینەوەی دەریا و چیاکان و گیانلەبەرەکانی ڕۆخ و قوڵایی دەریا و مێژووی کۆن و گەشتو گوزارە مەزنەکان دەبینیەوە.

ئەمانە وادەکەن منداڵ لەبیرکردنەوەو پرسیارکردن بن، نوسراوەو زانست و مرۆڤایەتییان خۆش بوێت.

هەمان ڕۆژنامە دەڵێت: ئینگلتەرا ساڵی بڕی(٢) ملیۆن جنبە لەم نوسراوە دەفرۆشێتە وڵاتانی بیانی.

ئەمەیە پیشەسازی ڕۆشنبیری منداڵ ، گەر ئەم پارەی لە وڵاتانی بیانی دەستکەوێت، دەبێت لە وڵاتەکەی خۆی چەندی دەسکەوێت؟!..

کەی ڕۆشنبیری منداڵمان دەبێت، و فێرە خوێندن و خوێندنەوەیان دەکەین؟! وکەی ئەم ڕۆشنبیرییە دەنێرینە وڵاتانی تر؟!.

(٢٠)

## با ئەسكلۆبيد بين...

وشەی (فەرهەنگ)مانای فەرهەنگی زانیارییە، ئەمەش ناونان نییە، بەڵكو پێناسەیەتی، كەئەڵێن ئەم نوسەرە فەرهەنگییە، واتا نوسینەكانی پڕە لەبابەتی هەمەجۆر و جیاواز، زۆربەی نوسەرەكانی ئەم چەرخە گەیشتوونەتە ئەم ئاستە، نوسەری وێژە لەسەر زانست دەنوسێت، وزاناش لەسەر وێژەو فەلسەفە دەنوسێت، هەروەك چۆن لەسەر زانستی نوسیوە.

ئەو لاوەی بەرەو رۆشنبیری بڕوات، دەبێت لێكۆڵینەوەی هەموو زانیاری مرۆڤایەتیبكات، مەبەستمان ئەوە نییە، هەر هەموو نوسراوەكان بخوێنێتەوە، یان لێكۆڵینەوەیان لەسەر بكات، مۆزەخانەی ئینگلتەرا(٤) ملیۆن نوسراوەی تێدایە، راست نییە ئامۆژگاری بكەین هەر هەمووی بخوێندرێتەوە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە لێكۆڵینەوەمان هەر پسپۆڕی و تەسك نەبێ، بەڵكو گشتی و فراوان بێت، هەموو زانیارییە مرۆڤایەتییەكان پێكەوە هاوبەندن، وناتوانین لە شارستانییەتی هاوچەرخ تێبگەین گەر ئەو زانیارییانەمان نەبێت، و دەبێت ئاشنای ئەو رێسایانە بین كە بناغەی سەرەتاكانی ئەو شارستانییەتەن، لەوانەیە یەكێك دژی ئەم ئاڕاستەیە بێت؟!... وبڵێیت ئێمە قووڵ



بیرناكەینەوە و لێرەو لەوێ شت كۆدەكەینەوە، بەڵام نازانێت بیری مرۆڤ ئامێرێكی میكانیێكی نییە هەر وەرگرێت، بەڵكو جەستەیەكی زیندووە شت پەسەند دەكات و نایكات، وپەیوەندییەكی فسیۆلۆجی نێوان بیركردنەوە و زانیاری پەیدا دەبێت، وەك پەیوەندی نێوان گەدە و خواردن، بۆیە بەپسپۆڕی و فراوانكردنی چەند زانیارییەك كۆتایی دێت، دواتریش چەند زانیارییەك دەناسێت بۆ ئەوەی قوول ببێتەوە تیایدا، بەڵام پەیوەندیەكی هەیە بە لێهاتوویی و ئاڕاستەكانی و بایەخەكانی.

لە كۆمەڵی دیموكراسیدا كەمیللەتە پێشكەوتوەكان تێدا دەژین و ئاواتمانە لای ئێمەش وای لێبێت، میللەت پێویستی بە هەماهەنگی بیری هەیە، نابێت (نەزانین و گێلییەتی) بەتەنشیت (زانیاری و دانایی) ەوە بێت،ئەنجامی ئەم جیاوازییە دەبێتە هۆی ئەوەی هەندێكی ئەم میللەتە ببنە تەگەرە بەرامبەر ئەو چاكسازی و گۆڕانانەی كە هەندەكەی دیكە دەیكەن و لەبەر نەزانینیان لە بەهای تێناگەن . لەوانەیە وەزیرێك پێشنیازێك بكات و داوا بكات كە: ئەو مرۆڤانەی لەش و مێشكیان تەواو نییە، دەرزییان لێبدرێت بۆئەوەی منداڵی وەك خۆیانیان لێنەكەوێتەوە ، یان یەكێكی دیكە داوا دەكات كە شیر بە خۆڕایی بدرێتە خوێندكاران ، لەسیستمی دیكتاتۆریدا بڕیاردان لای دیكتاتۆرەكەیە، ولە سیستمی دیموكراسیدا پێویستی بەڕای میللەتە، باشە گەر میللەت بیری رۆشن نەكرابێتەوە بە زانستی بایەلۆجیو پزیشكی و سودەكانی ، ئەوا نەیار دەوەستێت بەرامبەر ئەم چاكسازییانە.

فراوانکردنی رۆشنبیری بەهایەکی گشتی دەداتە میللەت، بەڵام بەهای کەسییەتی تاکیش هەرهەیە، ئەویش ئەوەیە کە شارستانییەت تێبگاتو پێوەی بنوسێت، وبەرەنگاری نامۆش نەبێت و نەڵێت ئەمە زەرەرمەندەو زیادە.

ئوتۆمبیل و پۆستە وتەلەفۆن و رادیۆ و شەمەندەفەر و فرۆکە و پاس بەکاردەهێنین و لەتەلاری گەورەو بچووکدا دەژین، وچێژ لە مۆزەخانە و پەیکەر و تابلۆ دەبنین... کەلوپەلی چاكو نایابمان حەز لێیە، وپزیشکیش چارەسەرمان دەکات، راست نییە لێکۆڵینەوەی زانستی کیمیا و بایەلۆجی ومیکانیك و فیزیا بکەین، کە ئەو شتانەی سەرەوەی بۆ دابینکردووین، وراستیش نییە لە یەکێکمان بپرسن کە پسپۆر نەبێت وبڵێن زانست و هونەری نەشتەگەری چییە؟!...

بەڵام راست و بەجێیە سەرەتاکانی زانستییەکانی پزیشکی و ئەندازیاری و داد بزانین ، و دەبێت هەریەك لە ئێمە نوسەر و هونەرمەند بێت گەر هاتوو ئەو بوارەش هی ئەو نەبوو..

بۆنموونە گەر هاتوو چووینە لای دارتاشێك بۆ دروستکردنی کەلو پەلی ناومال، دەبێت شتێك دەربارەی تەختەی چاك و نایاب و یان خراپ و چرووك بزانین، دەنا هەڵماندەخەڵەتێنن، ودەبێت تۆزێکیش چێژی هونەریمان هەبێت وئاگاداری مۆدێلی نوێ و هاوچەرخی کەلوپەلی ببین،بۆئەوەی شتێکی ناشرین و بێ کەڵك و بێپێزمان بۆ دروست نەکەن. هەموو ئەو زانیارییانەش نامانکەنە دارتاش..

ئێمە کە لێکۆڵینەوەی سەرەتاکانی پزیشکی و ئەندازیاری



و تەلاسازی و کیمیا و کشتوکاڵ دەکەین، نابێتە پیشەمان ، بەڵام زانینیان ناسینی شارستانییەتیمان بۆ ئاسان دەکات، بەها بۆ هەڵسەنگاندنی کۆمەڵایەتی و گیانی دادەنێن، ئەوسا دەتوانین ڕای راست و بەجێ لەسەر هەر چ پرۆژەیەك بدەین کەلە بەرژەوەندی نەتەوە یان تیرەدا بێت و دەتوانین لەوەش بگەین کە کام سیستەم مرۆڤ بەختەوەر دەکات، وکامیانیش چەواشەی دەکات و ئازاری دەدات، و لەوانەشە خۆمانیش ئازار بدات، ئەوساکە کێشەکانمان تایبەت نابن، بەڵکو گشتی دەبن ، و بۆمیللەت دەبن...

بۆیە، بائەنسکلۆبیدیخواز بین، لێکۆڵینەوەی مێژوو و وێژەو فەلسەفە بکەین، وەك لێکۆڵینەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کیمیا وئەو زانستانەی دیکە، کە شارستانییەتی و پیشەسازی ئێستای دروستکردووە.

ئەو مرۆڤەی مەبەستی لە رۆشنبیری ئەوە بێت کە ببێتە ئەنسکلۆبیدیخواز،پاش چەند ساڵێك لە لێکۆڵینەوە، لەسستییەوە دەگوازێتەوە بۆ پەرەسەندن، لەبەرئەوەی گەر هاتوو ئەو زانیارییانەی ئێستا لەراژەی مرۆڤایەتیدابوو ئەوا جیهان دەگۆڕێت ، زانیاری هێزێکە ناتوانێت بەند بێت، لێرەدا قین و دژایەتی حکومەتە دیکتاتۆرەکان و کۆنەپەرستەکان بۆ فێرکردن سەریهەڵداوە.

کە ئەنسکلوبیدیخواز دەبین جیهانی دەبین، تەنها هەوڵی پێشکەوتنی وڵاتی خۆمان نادەین، بەڵکو داوای پێشکەوتنی هەموو جیهان دەکەین، بەمەش گیانمان دەحەسێنینەوە،

ودەبینە كەسیەتییەكی تێكۆشەری پەرەسەندوو.

( ٢١ )

# ئارەزوو لە رۆشنبیریدایە

گەر رۆشنبیری ئارەزوو بێت، منداڵ لە خوێندنگەوە حەزی لێدەكات، ولەلاویشدا بەردەوام دەبێتو تا پیری لەگەڵیدا دەبێت، زۆربەی ئەوروپاییەكان لەئینگلتەرا و روسیا و ئەڵمانیا و فەرەنسادا ئەوها پێدەگەن و حەزیان دەچێتە رۆشنبیری، لەبەرئەوەی لە منداڵییەوە لایان باوە، بەڵام لەمیسردا ئەوها نییە، لەبەرئەوەی منداڵ نوسراوەی خۆشی بەدڵی خۆی دەست ناكەوێت، تاكو لە لاویدا ببێتە ئارەزووی ،بۆیە دەبێت لێرەدا هانی ئەو نوسەرە پسپۆڕانە بدەین كە منداڵەكانمان فێرە خوێندنەوە و بیركردنەوە دەكەن، ودەبێت ژمارەی ئەو نوسەرانەش(١٠٠)جار لە ژمارەی ئیستامان زیاتر بێت.

دەبێت باوكانو دایكان، منداڵیان هان بدەن بۆ خوێندنەوە و بەشداریكردن لە گۆڤار و رۆژنامەدا، تا ببێتە ئامرازێك ژیانیان لەم شارستانییەتە ئاسان بكات، وهەست بكەن كە لەئایندەدا ناتوانین بی رۆشنبیری بژین.

دەبێت فێریان بكەن ، پارە بۆئەم بوارانە سەرف بكەن، لەبەرئەوەی زیرەكتریان دەكاتو چالاكی بیركردنەوەیان زێتر



دەبێت، هەندێك باوك هەن لەم بوارەدا دردۆنگ دەبن، واش تێدەگەن كە منداڵەكانیان كاتیان بەسەر نەبەن بۆ رۆشنبیری، لەبەرئەوەی لە تاقیكردنەوەوە وبڕوانامەی خوێندنگە و زانكۆ سوودی نییە، نازانن كە ئەم خوێندنەوانە لەگەڵیاندا دەژین، تا گەورە دەبن و پیر دەبن، ئەمەش دەیانكاتە مرۆڤێكی مرۆڤانە، و وانەكانی خوێندنگەو زانكۆیان لەبیر دەچێتەوە، لەبەرئەوەی مەبەستەكەی تەنها بۆ بژێوی بووە.

خۆێنەر هەیە دەڵێت: من بە منداڵی هان نەدراوم و ئێستاش حەزم لە رۆشنبیری نییە، ئەم نەخوێندەوارییە چارەسەری هەیە، لەبەرئەوەی هەر لاوێك زیرەكییەكەی مامناوەندی بێت، یان تۆزێك كەمتر لە مامناوەندی هەبێت، بایەخدانێكی بۆ رۆشنبیری جۆراوجۆر دەبێت، وەك خوێندنەوەی رۆژنامەو گوێڕاكرتن لە رادیۆ، وهەڵبەتە كونێك بۆ چالاكی و بەئاگای خۆی لەناودا دەدۆزێتەوە، ولەم كونەوەش لقی دیكەی لێدەپێتەوە، وئەوسا حەزی دەچێتە لێكۆڵینەوە.

ئەوەی حەزی لەرۆشنبیرییە، با هاوڕێی رۆشنبیر هەڵبژێرێت تا راوێژی باشی بكەن، وشتی چاكی بۆ هەڵبژێرن و دوور بكەوێتەوە لەئەوانەی پاش خوێندنگە و زانكۆ قینیان لە خوێندنەوەیە، ودوور بكەوێتەوە لەئەوانەی كە پارەپەیاكردنیان لا باشترە ، لەبەرئەوەی هیچ بایەخێك نادەنە چالاكی بیركردنەوە و رۆشنبیری.

لاو كە گەیشتە ئەو باوەڕەی كە چالاكییەكانی بیری كۆدەكاتەوە، با بەدەست بلاوییەوە ئەو نوسراوانە بكڕێت كە

بیری فراوانتر و قووڵتر رووندەکەنەوە، لەوانەیە هونەر بێت ، یان زانست بێت، گرنگ نییە، لەبەرئەوەی ئێستا لە جیهاندا (١٣٠) جۆری زانست و هونەر هەن، زۆر دووریشە لەنێو ئەم هەموو ژمارەیە بڵێین لاو هەیە پەیوەندی بەهیچ لەمانەوە نییە، بەپێچەوانەوە، زۆربەیان پەیوەندییان بە زیاتر لە هونەرێك یان زانستێکەوە هەیە، لەوانەیە حەزیان لە لێکۆڵینەوەی ئاژەڵ ، یان مێژوو یان کارەبا یان سایکۆلۆجی یان ئابووری یان سیاسەت یان کۆمەڵایەتی یان وێنەکێشان یان پەیکەرسازی هەبێت، یان بەو هونەرە هاوچەرخانەی کە پەیوەندییان بەرادیۆو سینەما و تەلەفزیۆنەوە هەیە.

هەر یەك لەم هونەر و زانستانە پەیوەندییان بە هونەر و زانستێکی ترەوە هەیە، لەبەر هاوبەندبوونی زانیارییەکان، وێنەکێش نییە لێکۆڵینەوەی مێژوو و ئەو جولانەوە کۆمەڵایەتیانەی کە جۆرو ئاراستەی گۆڕیبێ نەکردبێت، مێژوونوس نییە بێ ئاگابێت لەسیاسەتی جیهان، لەبەرئەوەی سیاسەت و مێژوو هاوبەندن. بایەلۆجی نییە کۆمەڵایەتی نەبێت، وبگرە لێکۆڵینەوەی ئاینو رەوشت و دەروونزانیش دەکات، لەبەرئەوەی بۆچوونە بایۆلۆجییەکانی بینین و ئاسۆیکی تری خستۆتە بیری.

لاو لە ئارەزووەوە دەست بە رۆشنبیریی دەکات، هەروەك ئەوەی بییەوێت پسپۆڕ بێت تیایدا، بۆیە یەك بایەخی هەیە، کە تەواو دەبێت بایەخی تری لا پەیدا دەبێت، لێرەدا بە خێرایی دەردەکەوێت ، لەبەرئەوەی بە حەز و ئارەزووی خۆی



هەڵیبژاردووە، سۆز لێرەدا لەگەڵ مێشکە و راژەی دەکات کاتیش بۆئەم ئارەزووە بەکاردەهێنێت.

لە هەموو کۆمەڵێکی پێشکەوتوودا کات زێترە لە کارکردن ، و بەکارهێنانی بۆ رۆشنبیری دەبێتە باشترین هەل بۆ خۆ پەروەردە کردن، وبەکارنەهێنانی بۆ رۆشنبیری دەرگای گەندەڵی دەکاتەوە، تاشارستانییەتی فراوان بێت کات بۆ چینی کرێکاران زیاتر دەبێت، وەك ئەو کرێکارانەی کە لە کارگەی گەورە و زەبەلاح کار دەکەن، کرێکاری زیرەك کە ئەم کاتانە بە پەروەردەکردنی خۆی پڕدەکاتەوە، هەست بە پەرەسەندن دەکات ، و لەوانەیە بگاتە رادەیەك لە رۆشنبیریدا هەر چ خوێندنێکی لە کیس چووبێت کاتی خۆی ، قەرەبووی بکاتەوە و لەرۆشنبیریش پێش ئەوانە دەکەوێتەوە کە توانای ئابوورییان هەلی رەخساندبوو بۆ تەواو کردنی خوێندنگە و زانکۆیان.

( ٢٢ )

## رۆژنامە و گۆڤار

رۆژنامەو گۆڤار مەزنترین ترسناکی رۆشنبیریین لە کۆمەڵدا، لەبەرئەوەی رۆژانە یان حەفتانە بانگەشە و ئاراستەی بەسوودو زەرەرمەندی خوێنەر دەکەن، رۆژنامە هەزرانە و دەگاتە هەموو ماڵێك و خوێنەر رادەکێشێت، لەبەر ئەوەی هەموو بابەتێکی

سیاسی و کۆمەڵایەتی و چیرۆکی سەیرو سەمەرەی تێدایە. بەدەست بازرگانانەوەیە، هەروەك بازرگانی کۆیلەتی و کاری نزم؟!.. بازرگانی رۆژنامە قبوڵیەتی هەر کەسێك بۆ هەموو کەسێك بنوسێت، قسە لەگەڵ سووکترین کەس دەکات، ورۆژنامەکەشی دەکاتە بانگەشە، وبەهۆیەوە چەند هەواڵێك بەوێنە بڵاوەدەکاتەوە،ئەو رۆژنامەی بانگەشە بۆ جگەرە و مەی بکات، هیچ وتارێك دژیان بڵاو ناکاتەوە.

رۆژنامەو گۆڤاری بازرگانی ، چۆن ملکەچی بانگەشەی بازرگانەکانە، ئەوهاش ملکەچی بانگەشەی پارتەکانە، بۆیە کە رۆژنامە و گۆڤار دەخوێنینەوە دەبێت بە تێگەیشتن و ئاگایی بێت، هەموو هەواڵێك و وتارێك و وێنەیەك بەپێی ئەم هۆکارە شاراوانەی سەرەوە هەڵسەنگێنین، وبزانین مەبەستیان چییە.

پێش چەند ساڵێك کۆمپانیایەکی سیگورتە(تأمین) لات بوو ئەم هەواڵە لە رۆژنامەکانی میسردا بڵاونەبووە، و چەندین خوێنەری ئەو رۆژنامانە پشکیان(سهم) لەو کۆمپانیانەدا هەبوو ، لەبەر نەزانینی هەواڵەکە زەرەرێکی زۆریان کرد، وبەشێکی خاوەن ئەم پشکانە خۆیان رزگارکرد و ئەمانەشیان تووشی زەرەرێکی زۆر کرد. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمپانیایەکی تر کە لەپشت ئەم کۆمپانیای سیگورتەوە بووە، سوودی لەبڵاوکردنەوی بانگەشە لەرۆژنامەکانی میسردا وەردەگرت!!...

چەواشەیەکی زۆر لەنێو گۆڤارەکانماندا هەن، وخراپەی هەیە بۆ خوێنەرێك گەر بییەوێت خۆی رۆشنبیر و خۆی پەروەرد بکات، ئەم گۆڤارانە دووجۆرن:-



یەکەمیان: باسی قسە و قسەڵۆکی کەنار دەریا و رابواردنی دەوڵەمەندەکان دەکات.

دووەمیشیان :خۆی تەرخانکردووە بۆ رۆشنبیری کۆنی عەرەب، هەردووکیان زەرەرمەندن، لەبەرئەوەی یەکەمیان بیرکردنەوە گەندەڵ دەکات و ئاراستەی بایەخدانی تەڕۆ دەکات... دووەمیانیش نوسینەکانیان داوای گەڕانەوە دەکەن بۆ کۆمەڵێکی رۆژهەڵاتی لێڵ و دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵی رۆژئاوای راپەڕیوە. تاگەیشتە رادەیەك، نوسەرێکی بەناوبانگ لەساڵی(١٩٤٢)دا وتارێکی بڵاوکردبووە و تیایدا نوسیبووی:( خوا لێت خۆش بێت باوکە، قەت پێڵاوت نەکڕیوە، گەر بەسەری ژنەکانت تاقیت نەکردبێتەوە؟!)ئەوها، بەبیرکردنەوەی رۆژهەڵاتی بەباوکی خۆیدا هەڵدەدات.

ئەمە مانای کۆمەڵی رۆژهەڵاتییە کە من لەم نوسراوەدا هەوڵی نەهێشتنی دەدەم، ودەبێت هەموو پیاوێکی پیاوانە بەهۆی ژن و دایکایەتییەوە هەوڵبدات ئەم داب و نەریتە کۆنانە نەهێڵێت لەسەر ئەم زەوییە. شتێك نییە پێی بوترێت رۆژهەڵات و رۆژئاوا... تەنها نەتەوەی (سووك و نزم)و( ئاست بەرزو پێشکەتوو) هەیە.

رۆژنامەی چاك و گۆڤاری باش بەرەو فەلسەفە دەڕوات، وێژدان بەئاگا دەهێنێتەوە،بیر دەوروژێنێت بۆ بیرکردنەوە گەر هاتوو لەگەڵ راشمان نەگونجێت گەر خوێنەر بییەوێت سوود وەربگرێت و ئاستی بەرزبێتەوە بەهۆی رۆژنامەوە. ئەوا دەبێت چاوی لە زۆر شتی نێو رۆژنامەکان بپۆشێت، وگەر زمانێکی

بیانی بزانێت، دەبێت بەشداری لە رۆژنامەو گۆڤاری ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانیدا بکات، بۆ ئەوەی ئاگاداری (بیری گشتی) بێت، سەرەڕای ئەم رۆژنامە و گۆڤارە بیانییانە پێویستی بەرۆژنامەیەکی عەرەبیش هەیە، وبەوردی هەڵبژێرێت و بزانێت مەبەستە شاراوەکان و ئاشکراکانی چین، ناوبەناویش خۆی تاقیبکاتەوە، وبزانێت ئاڕاستەکانی ئەم رۆژنامەو گۆڤارانە چەند کاریان تێکردووە، و دەبێت ئاگاداری درۆ و دەلەسە نەرییەکان بێت، بۆچی ئەو هەواڵانە بڵاوناکاتەوە وەك ئەو هەواڵەی کۆمپانیاکە کە ئاماژەمان پێدابوو.

**چۆن رۆژنامە هەڵدەبژێرین؟...**

پێش هەموو شتێك، وەك خوێندنگەیەك، یان کتێبخانەیەکی بەسوود سەیری دەکەین، بزانین ئایا ئاستی بیرکردنەوەمان بەرزدەکاتەوە، یان نا، خۆ دەبێت نوسەرێکی هاوچەرخی تێدا بێت کە لە تەزووی جووڵانەوە کۆمەڵایەتییەکان وئابوورییەکانی جیهان تێبگات، ودەبێت ئەو رۆژنامەیەش هەواڵی رەسەنمان بۆ بگوازێتەوە بۆئەوەی بەرێكوپێکی ئاگاداری گۆڕانکاری و پەرەسەندنی جیهان بین.

لەرۆژنامەشدا، هەروەك لە نوسراوەدا، دەبێت بەپێنوس بیخوێنینەوە، چۆن نوسراوە بەوردی دەیخوێنینەوە، دەبێت رۆژنامەش ئەوها بخوێندرێتەوە. هەواڵی ترسناك بەهێمایەك زەق بکەینەوە، وشوێنەکەش بەنەخشە ببینین، لاپەڕەی ئابووری گرنگە، بۆئەوەی بزانین کە گۆڕانکارییەکانی ئابووری بەهۆی سیاسەتەوەیە، ودەبێت بزانین بۆچی ئەم یان ئەو هەواڵە



تیایدا بڵاونەکراوەتەوە.

لەکاتی جەنگدا رۆژنامە گرنگە، لەبەرئەوەی جەنگ هەروەك (مارکس ) وتوویەتی( شەمەندەفەری مێژووە) لەبەر خێرایی رووداوەکانی، ئێمە مێژوویەکی زیندووی هاوچەرخ لەرۆژنامەکاندا دەخوێنینەوە، بەهێزیی رووداوەکانی رامانەدەکێشێت، وهەر جەنگیشە گشتمانی راکێشاوە بۆ خوێندنەوەی رۆژنامە و کڕینی بە بەردەوامی.

رۆژنامە و گۆڤار کەلوپەلی ماڵی پێشکەوتوون، با وا بکەین منداڵەکانمان حەزیان لێبێت، دایکی رۆشنبیر چۆن مەسرەف بۆ ماڵ دەکات، ئەوهاش رۆژنامە و گۆڤاری چاك دەکڕێت بۆ رۆشنبیرکردنی منداڵەکانی، لەبەرئەوەی باش دەزانێت کە هەواڵێك یان وتارێك یان وێنەیەك کاریگەری زۆری دەبێت بۆ داب و نەریتی چاك یان خراپ و پەروەردەی کەسییەتی بەهێز یان لاواز لەسەر دەروونی منداڵەکانی.

**بۆیە پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە رەچاو بکرێن،:**

١- دەبێت فێری خوێندنەوەی خێرا بین،ویەکەم شتیش ئەوەیە کە لێومان و زمانمان لەکاتی خوێندنەوەدا نەجوڵێنینەوە، ئەوسا رۆژنامەیەك لە(١٠) خولکە زیاتر ناخایێنێت.

٢- نابێت هەر ئەو رۆژنامانە بخوێنینەوە کە ڕای لەگەڵ ڕای ئێمەدا دەگونجێت، بەڵکو دەبێت بزانین رای دیکەش چییەوچۆنە!!.. بۆیە دوو رۆژنامەی جیاواز لە ڕا باشترە.

٣- بابەتەکانی رۆژنامە بۆ ئەندامانی خێزانەکە باس

بکرێت، بۆئەوەی دووریان بخەینەوە لە چەنەبازی بێ سوود، ونزیکییان بکەینەوە لەسیاسەت و کۆمەڵایەتی، و لەوانەیە بەمەش رۆشنبیری ئەندامانی خێزانەکە یەکسانی بکەین.

٤- وا باشە خۆمان فێرە بڕینی چەند هەواڵێکی گرنگ، یان بایەتێکی چاك بکەین و بخرێنە نێو فایلێکەوە و دوا رۆژ پێویستیمان پێدەبێت، چاکتر وایە هەر بابەتە و فایلێکی هەبێت.

٥- نابێت رۆژنامە وگۆڤار ببنە هۆی دابڕانمان لە نوسراوە، لەبەرئەوەی نوسراوە سەرچاوە و بناغەی رۆشنبیرییە.

با لەبیرشیمان نەچێت ، خراپەکاری لەرۆژنامەو گۆڤاردا هەیە، ودەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پەروەردەی رۆشنبیریمان لەوانە:-

أ- زۆر پەیوەندار نین بە بیری گشتییەوە، ودوورن لە تەزووی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی جیهانەوە، وجیاوازیشن لەگەڵ رۆژنامە ئەوروپاییەکان.

ب- نوسەری پەورەردکاری چاکی وەك (لطفی السید)ی پێش (٥٠) ساڵ لەنێو رۆژنامە و گۆڤاری ئێستادا نابینین، واتا رۆژنامەگەری بگەیەنێتە ئاستی وێژە.

ج- گۆڤار زۆر باو بووە، بەلام ئاستی نزم بۆتەوە لەجیاتی ئەوەی بەرزببێتەوە، گۆڤارێك نییە، بیری گشتی بگرێتەوە، باسی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی چین و هیند و کێشەکانی ئەمەریکا بکات، وامان لێبکات هەست بکەین کە میسر بەشێکە لە گۆی ئەم زەوییە، و لەمێژوو نەکشاوەتەوە.

د-پێویستمان بە گۆڤاری حەفتانە یان مانگانە هەیە، بۆ لێکۆڵینەوەی سیاسەتی جیهانی، وپەرەسەندنی کۆمەڵایەتی،



و ئاراستەی زانستی، بێ ئەم گۆڤارانە پەروەردەمان بە کەمی دەمێنێتەوە.

هـ-هەموو گۆڤارەکانی میسر بەباسکردنی سێکس دەژین، جا بەوێنە بێت یان بەوشە و خراپەی بۆسەر دەروونمان زۆرە.

ئەمانەی کە باسم لێکردن بۆ خوێنەر بوون، قسەیەکیشم بۆ حکومەتی میسر هەیە:-

نابێت ئێمە لەسەدەی بیستدا سزا بخەینە سەر گۆڤارو رۆژنامە بەناوی بارمتە یان گرەنتی، ئێستا حکومەت رێگادەدات، بۆ رۆژنامەیەك بە (٣٠٠) جنیەو بۆ گۆڤارێك بە (١٥٠) جنیە دەربچێت؟!...

جێگای خەم ونیگەرانییە، میللەتێکی بچووکی وەك(فنلەندا) کە (٣,٨) ملیۆن کەسن(٢٠٩) رۆژنامەیان هەیە لەگەڵ (٥٥٠) گۆڤار... هەموو رۆژنامەیەك وگۆڤارێك وەك کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری یان سیاسییە، وچەندین خوێنەری جیاوازی لە خۆی کۆکردۆتەوە، ئێمەش لەمیسردا کە (٤) بەقەد (فنلەندا)ین (٧بۆ٨) رۆژنامەو (١٠) گۆڤارمان هەیە؟؟...

بەڵێ ... دەبێت رۆژنامەو گۆڤار بێ مەرج، وزۆر ئازاد و بێ بارمتە بن، لەبەرئەوەی لەراستیدا ،ئەمە سزادانی ئازادی بیرکدنەوەیە، ونەتەوەش بەرەو دواوە دەبات.

زۆریی رۆژنامەو گۆڤار ، رای نەتەوە فرە دەکات و بیرکردنەوەی چاکتر دەکات.

( ٢٣ )

## پەروەردە بۆ ژیانە

جاران باوەڕ وابوو کە ئێمە منداڵمان فێرە خوێندن دەکەین بۆئەوەی لەئایندەدا بژێوییان دابین بکەن، پزیشکی و ئەندازیاری و بازرگانی بخوێنن، دواتر کار بکەن و پوول پەیدا بکەن و لەژیاندا سەرکەوتوو بن،ئەم سەرکەوتنەش تەنها سەرکەوتنی پوول پەیداکردنە.

بێگومان پەیداکردنی بژێوی لە کۆمەڵدا بەپێشبرکێی ئابووری دەبێت و خوێندنیش پایەی یەکەمییەتی، بەڵام ئێمە پوول پەیدادەکەین بۆئەوەی بژین، نەك بژین بۆئەوەی پوول پەیدا بکەین، بۆیە دەبێت ژیان لەپیشە گەورەتر بێت. سەرکەوتن لەژیاندا زۆر گرنگترە لەسەرکەوتنی پوول پەیداکردن.

دەبێت لەژیاندا سەرکەوتووبین، واتا لە خێزاندا سەرکەوتووبین، بەپەیوەندی هاوسەری چاك و پەیوەندی باوکایەتی بەرز، لەکۆمەڵدا سەرکەوتووبین، بەوەی کۆمەڵایەتی بین، هاوڕێیەتی هەڵسەنگێنین، ومیوانداریەتی بکەین، ئاگامان لەسیاسەت هەبێت، وبزانین کێشە کۆمەڵایەتییەکانمان چین،وئاوات و ئامانجمان چاکی بێت بۆ کۆمەڵ.

چەند دەبێت کۆمەڵایەتی بین، دەبێت ئەوهاش بتوانین بە



تەنها بین. ژیانی سەربەخۆی خۆمان هەبێت، ولەگەڵیدا بژین، تەنهاییمان دەبێت بۆ لێکۆڵینەوە و رامان وتێگەیشتن بێت، هەیە دەڵێت :( **بەختەوەری مەبەستی ژیانە، وتێگەیشتنیش دەدەگەیینێتە بەختەوەری**). گەر هاتوو وامان دانا کەزۆرکردنی ویژدان و ئاگابوون بەختەوەرییە، نەك زۆرکردنی سۆز،لەبەرئەوەی سۆز تەنها بۆ خۆشییە ، چێژ لەخواردن و هاوسەرییەتی و یاری و سەربەخۆیی و شانازییەتی وەردەگرین،وئەم چێژانەش بە نەمانی هۆیەکانی، و پاڵنەرەکانی نامێنن.

ئێمە مەزنترین بەختەوەریمان لە زیاد بوونی ویژدانمانە، لەئاگابوونمانە لەژیان و سروشت، بەوەش زێتر تێدەگەین. ئەم تێگەیشتنەش بەردەوام دەبێت،وبەوەش بەختەوەریمان بەردەوام دەبێت، بۆیە دەبێت پەروەردەکردنمان بۆ تێگەیشتن بێت، بۆئەوەی ژیانێکی بەختەوەر بژین، وتاکە رێگاش بۆ تێگەیشتن رۆشنبیرییە.

بەڵام رۆشنبیری لەم رۆژانەدا کشتی نییە، وهۆیەکانیشی زۆرن لەوانە، زۆربوونی لقەکانی زانیارییە کە بە زەحمەت پێی دەگەین، وزۆر بوونی زانیاری پسپۆریی داهێناوە، وگەر هاتوو نوسراوەی (طبقات الاطباء) ی(أبن ابی أصیبعة) بخوێنینەوە، دەبینین پێش (١٠٠٠) ساڵ پزیشك (دانا)بووە، واتا هەر پزیشکی نەزانیوە، بەڵکو فەلسەفەو زمان و ویژە و مێژوو وئاینشی زانیوە.

باشە، هەیە دەڵێت: ئەم داناییە سوودی بۆ چارەسەرکردن

نەبووە؟ ئێمەش گومانمان لەسەرئەوە هەیە، لەبەرئەوەی لەو ڕۆژگارەدا دەبینین ژینگەی كۆمەڵایەتی و باری دەروونی پەیوەندار بووە لەگەڵ نەخۆشییەك ، و كە دەڵێن(باری دەروونی) وەك ئەوە وایە، كە بڵێن(باری فەلسەفە) بۆیە لە كۆتاییدا پزیشك دانایە، هەر بەچاوی سەیری نەخۆش ناكات، بەڵكو بیر لە باری كۆمەڵایەتی و دەروونیشی دەكاتەوە.

گریمان دەبێت پزیشكی بەش بەش بكرێت، ودەبێت پزیشك لە هونەرەكەیدا پسپۆڕ بێت بۆ ئاسانیی چارەسەركردن، ئەوجاش ناتوانین بڵێین ئەم پسپۆڕانە لە پزیشكی یان لە هەر چ زانستێكی تردا پسپۆڕ بوون، ئەمانە گەیشتوونەتە پەروەردەیەك بۆ ژیانیان، ئەوەی بتوانین پێیان بڵێین ئەوەندەیە كە لەپیشەكانیادا كارا بوون، و گەر هاتوو هەر پسپۆڕییەكەیان هەبوو ئەوا نەخوێندەوارن لە هونەری ژیاندا.

گواستنەوە لە داناییەوە بەرەو پسپۆڕی ، بازدانێكە لە روناكییەوە بۆ تاریكی بەپێی نوسراوەكەی (أبن ابی أصیبعة)كە باسی ژیانی خۆی دەكات، لەنێو پزیشكەكاندا رایەك هەیە ، ئەویش ئەوەیە كە قینیان لە پسپۆڕی زۆرە، ئەم چیرۆكەش نمونەیەتی، وەك لە فەرمانگە پزیشكییەكانی ئینگلتەرا باسدەكرێت:-

دەرچوویكی كۆلێژی پزیشكی، پزیشكێكی گەورەی دیت،و پێ ووت: دەمەوێت پسپۆڕی بخوێنم.. پزیشكە گەورەگە لێی پرسی، لە چ بەشێكدا دەتەوێ ببیە پسپۆڕ؟.. پزیشكەكە وەڵامی دایەوەو ووتی: دەمەوێ تەنها لە (لووت)دا پسپۆڕ ببم... واش



باوە كە پسپۆڕی لە (لووت و گوێ و قورگ) هەیە،وئەم پزیشكە نوێیەش هەریەك لەم سێیانەی پی باش بوو كە چارەسەری بكات، پزیشكە گەورەكە بە گاڵتە پێكردنەوە پێی ووت: دەتەوەی لە كونە لووتی راست یان چەپدا ببیتە پسپۆڕ!!؟.

هەرچەندە ئەم چیرۆكە تایبەتە بە پزیشكەكان، بەڵام بەهای هێماكەی لەوان دردەچێت و دێتە نێو ژیانی هەموومانەوە، لەبەرئەوەی ئێمە كە دەبینە پسپۆڕ، سنوور بۆ بایەخە دەروونییەكانمان و بیركردنەوەمان دادەنێین، جاریش هەیە وا هەست دەكەین كە پیشەكەمان ئامانجی ژیانمانە و ڕێبازی نییە، هەروەك ئەو دوكاندارەی كە هەموو ژیانی خۆی بۆ دوكاندارییەتی تەرخانكردبوو كە مرد لەسەر كێڵی گۆڕەكەیان نوسیبوو:- **وەك مرۆڤێك لەدایكبوو وەك دوكانداریش مرد؟!...**

زۆربەمان وەك ئەو دوكاندارە واین، یان لێی نزیكین، و زۆر كەممان ئەم پسپۆڕییەی ناوێت، و بایەخ بەباری كۆمەڵایەتی و هونەری دەدات، پزیشك ئەندازیاری ناخوێنێت،و نوسەریش لە كیمیادا نەزانە، ئەوانەی زانست دەخوێننەوە شیعر ناخوێننەوە و ڕۆشنبیر نین، لەبەرئەوەی رۆشنبیری گشتییە، سروشت و مرۆڤمان تێدەگەێنێت، واتا دەبێت ودەبێت هەمووی بزانین،بۆئەوەی بزانین چی هاوبەندیان دەكات، وچۆن ئاراستەیان بكەین بۆ راژەكردنی مرۆڤایەتی. كە سەیری ئەو پرۆژە ئاودێرییانەی میسر دەكەم، دەبینم چەندە خاك و رووەك و تەندروستی و ئاژەڵ و مرۆڤیان وێرانكردووە، هەست بەخەم و نێگەرانی دەكەم، لەبەرئەوەی ئەندازیارەكانمان زانیارییان

لەبارەی پزیشکی و بایەلۆجییەوە نەبووە. گەر زانیارییان هەبوایە، ئەو ئاوانەیان کۆنەدەکردەوە و تەندروستی جوتیاران وای لێنەدەهات وکرم گۆشتییانی نەدەخوارد، جگە لەو هەموو زەرەر و زیانەی بەخاك کەوتووە.

پەیوەندی لەنێوان پزیشکی و ئەندازیاریدا هەیە، گەر بمانزانیبا و کارمان پێ کردبا، تەندەروستیمان دەپاراست لە (بەلهازریا)و( ئینگلۆستۆما)و( ئەرسکارس).

ئەوانەی کە لە (گەردیلە)دا کاریان دەکرد، گەر فەلسەفە و کۆمەڵایەتی و ئاینیان بخوێندبا، ئەو بۆمبە گەردیلەییە، هەڕەشەی لە نەمانی شارستانییەتی نەدەکرد.

ئەوەی بتوانم بیڵێم ئەوەیە :ئەم زانایانەی کە گەردیلەیان دۆزییەوە و کردیانە بۆمب، پەروەردە نەکرابوون بۆ ژیان ، بەڵکو بۆ پیشە پەرەوەرد کرابوون ، دواتر بوونە پسپۆڕ و ئەم پسپۆڕییەش بو بەمایەی ئەوەی وەك ئەسپی عەرەبانەیان لێبێت، هەرپێش خۆیان ببینن، ونەزانن چی لە دەوروبەریانە...

من لێرەدا ناڵێم رۆشنبیری گشتی تەنها سوودی کۆمەڵی هەیە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە رۆشنبیری پێویستییەکی گرنگە بۆ هەموو مرۆڤێك، بۆئەوەی لە مەبستی ژیان تێبگەن، واتا ویژدانی زۆربێت، واتا بەختەوەری، و لەبەرئەوەی ژیان گەورەتر لە پیشە، دەبێت خۆرۆشنبیرکردن بۆ ژیان بێت نەك بۆ پیشە. وەك نموونەش دوو بیرمەندی مەزن دەهێنمەوە کە (جاحظ)و(داروین)ن:ـ

داروین ئاڕاستەی رۆشنبیری هەموو مرۆڤێکی گۆڕی، کاتێك



بیردۆزییە مادییەکەی خستە جێگای باوەڕی کۆن و نادیار، بەبەراورد لەگەڵ (جاحظ)دا، داروین پەروەردەی بۆ ژیانی، وەك (جاحظ) نەبوو پاش رەچاوکردنی ئەو چەرخەی کە تیایدا دەژیان، داروین پسپۆڕ بوو لەبایەلۆجیدا ، بەڵام وێژە و فەلسەفە و ئاین و شعر و هونەری پشتگۆ خستبوو ... تا لە پیریدا نوسیبووی:ـ

" تاگەیشتمە تەمەنی(٣٠) ساڵی چێژم لەشیعری (ملتون)و جیرای‌وبیرۆن و وردزۆرت‌و کۆلێردج و شیلی) دەبینni ودەروونمیان خۆشدەکرد، کە خوێندکار بووم بەشیعری (شکسپیر) خۆشحاڵ دەبووم، حەزم لە تابلۆ و وێنە هونەرییەکان بوو، بە مۆسیقاش دڵخۆش دەبووم، بەڵام چەند ساڵێکە، ناتوانم یەك دێر شیعر بخوێنمەوە، ویستم(شکسپیر) بخەێنمەوە، دیتم ئەوەندە بێ پێزە رشانەوەم دەهات، نەمانی بەختەوەرییە، ولەوانەیە بۆ بیرکردنەوە و بۆ رەوشت زەرەرمەند بێت ، لەبەرئەوەی سۆز لە سروشتماندا لاواز دەکات".

داروین خۆی باس لەمانە دەکات، و باسی زەرەرو و زیانی پسپۆڕی دەکات و هەمووشمان لەوانیە تووشی ببین‌و داروینیش دەیتوانی بڵێت: گەر رۆشنبیریم فراوانتربا و بیرکردنەوەم بۆ بواری تر بچووبا تێگەیشتنم لە بوارەکەی خۆمدا و لەپەرەسەندندا زێتر دەبوو.

لێرەدا نموونەیەك دەهێنمەوە کە پەیوەندی بەباتەکەمانەوە هەیە:ـ

کۆمپانیای(شێڵ) کە خاوەنی سەرچاوەی نەوتە لە هەموو

کیشوەرکاندا، ساڵی (٢٠٠) جنیە دەداتە پسپۆڕەکانی نەوت بۆ لێکۆڵینەوەی بوارێك دوور بێت لە نەوت. ئەم کۆمپانیایە ئەو پارەیە بە خۆڕایی نادات، بەڵکو دەبینێت پسپۆڕی بیرکردنەوە تەسك دەکات و ئاسۆ سنووردار دەکات، ورۆشنبیری گشتی پسپۆڕ رادەکێشێتە بواری ترەوە، وزیرەکیەکەشی بە تەسکی نامێنێتەوە.

ئەم نموونەیە بەهای خۆی هەیە لەژیانـدا و دەبێت پەروەردەکردنمان بۆ ژیان بێت، نەك بۆ پیشە و بژێو ورۆشنبیری گشتیش بۆ هەر هەموومان گرنگە.

رۆشنبیری گشتی دروشمی(جاحظ)بوو کە نوسەر و زانا و گەردووناس بوو، لێکۆڵینەوەی دەربارەی رووەك وئاژەڵو ئەستێرەو سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئاین وپزیشکی دەکرد، بۆیە رێبازی ژیانی لە داروین چاکتر بوو، ولەپیریدا سکاڵای داروینی نەبوو.

لێرەدا بەئەرکی دەزانم، بەبیرتان بهێنمەوە کە (ڤۆلتێر) چی لەسەر (نیوتن) نوسیوە، کە نیوتن بناغەی فیزیای دانابوو هەروەك چۆن داروین بناغەی بایەلۆجی دانابوو، ، ڤۆڵیتر زۆر نیوتنی بەدڵ بوو و دەشیزانی رۆشنبیرییەکەی سنورداره ، بۆیە ڤۆڵێتر دەڵێت:-

(( من حەزم دەکرد نیوتن چیرۆکێکی شانۆیی وەك (فۆدفێل)ی دانابا، کە پڕە لە گاڵتە و پێکەنین و سەماو مۆسیقا، گەر ئەمەی کردبا، لای من بەهای زێتر دەبوو ، لەبەرئەوەی گەر مرۆڤێك لە هونەریکدا داهێنەر بێت، لەوانەیە ببێتە بلیمەت،



بەڵام گەر هاتوو هونەری زۆربوو دەبێتە کەسیەتییەکی خۆشەویست، و دەبێت هەریەك لەئێمە خۆی لەسەر هەموو بوارێك رابهێنێت، لەبەر ئەوەی دەروون ئەو ئاگرەیە کە خودا داویەتی بە ئێمە، دەبێت بە هەموو شتێکی چاك تێری بکەین، و بۆهەموو لقەکانی زانیاری و رەنگەکانی هەستکراوە بین، بەمەرجێك لەنێوانیاندا چەواشە نەبین و هەموو جیهانیش لە دروونماندا جێگای دەبێتەوە)).

ڤۆڵێتر بە پسپۆڕییەکەی نیوتن خەمبار بوو، وحەزی دەکرد نیوتن نوسەر و شاعیرو هونەرمەند بوایە لە تەك پسپۆڕییەکەی لە بیرکاری و فیزیادا.

بە کورتی، ئێمە دەبێت پسپۆڕی سنووردارمان نەکات ، لەبەرئەوەی پەروەردە پێش هەموو شتێك بۆ ژیانە، تەنها بۆ زانستێك یان هونەرێك نییە، ورێبازەکەشی رۆشنبیری گشتییە.

( ٢٤ )

## سایکۆلۆجییەتی لێکۆڵینەوە

لەبەرئەوەی گەیشتینە ئەم قۆناغە، پێویستە بزانین کام ڕێگا لە هەموو ڕێگاکان بۆ لێکۆڵینەوەی بابەتەکان سەرکەتووترە، پێویستیمان بە ئاڕاستەکردنێکی سایکۆلۆجییە بۆ ئاسانکردنی لێکۆڵینەوە.

هەموو لێکۆڵینەوەیەك پێویستی بە هاندان و زیرەکی هەیە، لێرەدا مانای (هاندان) سۆزە، کەویست و ئارەزوو زۆر دەکات بۆ لێکۆڵینەوە، هەر وەك حەزکردنە لە خواردن، ئێمە خواردن ناخۆین گەر حەزمان لێنەبێت، گەر خەمبار یان تووڕە بووین حەزمان ناچێتە خواردن، گەر هاتوو گەدەیەکی باشیشمان هەبێت وئامادەش بێت بۆ هەرسکردن. لە لێکۆڵینەوەشدا ئەوهایە.

گرنگ نییە زیرەکین و توانای تێگەیشتنمان هەیە بۆ لێکۆڵینەوە، بەڵام دەروونمان قینی لێیە ودوور دەکەوێتەوە لێی، هەزارەها لاو هەن کەم زیرەك نین، بەڵام هاندانیان نییە، ئەمانە پێویستییان بە دروون گۆڕینە، و دەبێت هەست بەم گۆڕینە بکەن لەبەر ئەوەی لە گۆڕینی ئاینی کەمتر نییەو کەسیەتییەکەیان ئامانجی نوێ دەخاتە ژیانیانەوە.



لە یەکەم جەنگی جیهانیدا، چەند لاوێکی ئەمەریکییان کردە سەرباز و بۆ فەرەنسایان گۆاستنەوە، باوکی ئەو لاوانە لە کۆچکەرەکان بوون، نەیاندەزانی بە ئینگلیزی بنوسن، هەندێکیان سەرووی (٦٠) سالان بوون، دەستیان کرد بە فێربوونی نوسینی ئینگلیزی بۆ ئەوەی نامە بۆ کوڕەکانیان بنێرن. دەرکەوت زۆر بە خێرایی فێربوون، لەبەرئەوەی هاندەرکەیان بەهێز بوو، ویست و سۆزیانی زیندووکردەوە و خۆشەویستی باوکایەتیشی نوێکردنەوە.

ڕووداوێکی تر هەیە ئەم سایکۆلۆجییە ڕووندەکاتەوە... لەسالانی قاتو قڕی و بی ئێشی لە نەمسادا، لەیەك لە شارە بچووکەکانی ، پاش ئامارکردنی ژمارەی خوێنەر لە کتێبخانە گشتییەکاندا، دەرکەوت کە سەرەڕای کاتی زۆر لەبەربێ ئیشی (یەك لەسەر چواری) خوێنەر نوسراوەیان دەخوێندەوە گەر بەراورد بکرابا لەگەڵخوینەرانیان لە کاتی ئیشکردن و پارەپەیاکردنیاندا. لەبەرئەوەی کرێکاری بێکار لەبەر بێ ئیشی خەمبارو سارد بوون، دەروونیان چالاك نەدەبوو بۆ خوێندنەوە، کەچی لە کاتی ئیش و کەمی کاتدا، لەبەرئەوەی بەختەوەر بوو و دڵخۆش بوو دەیخوێندەوە..

ئەم دوو نمونەیە هێزی (هاندان) دەردەخەن لە لێکۆڵینەوەدا. پەککەوتەیی لەپیریدا بەهای نییە گەر هاتوو هاندەر بە هێزبوو، وکاتی ڕۆژانەش هیچ نییە گەر هاتوو دەروون خەمباری بێ ئیشی بوو.

ئەوەی حەزی لە خوێندنەوە بێت، بیانوو بۆ خۆی

دەدۆزێتەوە بەوەی ئامانجی ژیان دەستنیشان بکات، بۆ نموونە لەرۆژێکدا بە تەنها دادەنیشێت و دەپرسێت:-

بۆچی دەژیم؟؟

بەجێ نییە(٧٠-٨٠) ساڵ بژیت و نەزانی لەم جیهانەدا چ باسە؟؟.

دەبێت هەر رۆژێك بێت و بێتە سەر ئەو باوەڕەی کە دەبێت خۆی رۆشنبیربکات، ئەوسا هەست بە (هاندان) دەکات و سۆز پەیدا دەبێت، و ئەمەش سەرەتاکەیەتی ، واتا حەز بەلێکۆڵینەوە دەکات، وبەپسپۆڕی لە بوارێکدا کۆتایی دێت،ئەمەش ویستە.

هەندێ کات هاندەر سروشتییە، هەر لە سروشتەوە لە کاتی لە دایکبوونییەوە لەگەڵیدایە ،وەك ناشرینیەکی جەستەیی هەمیشەیی کە هانی دەدات بۆئەوەی سەرکەوتوو بێت، لەوانەیە گاڵتەپێکردنی هاوڕێکانی لەبەر زلی لووتی ، یان خوارێیەك لەلەشیدا یان ناشرینی دەموچاوی، ئەمانە لێرەدا رۆشنبیری دەکەنە رێبازی، بۆئەوەی کەس شان لەشانی نەدات، وئەوسا توانایەکی زۆر بەگەڕ دەخات بۆ رۆشنبیری و سەرکەوتنەکەی ،ئەو کچەی زۆر جوان و نایاب بێت، وخەڵکیش زۆری پێداهەڵدەن توانایەکی ئەوتۆ بەگڕ ناخات بۆ خۆرۆشنبیرکردنی، کەچی ئەوەی جوانی لەو کەمترە ، هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر دەدات بۆ خۆرۆشنبیرکردنی.

لێرەدا هاندەر جۆرێکە لە هەستکردن بەکەمی ، کەمییەکەی هانی دەدات بۆ پڕکردنەوەی، پێویستییێکە پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەوەی چالاکتر و سەرکەوتووتر بێت، ئەمەش مانای ئەوە نییە



کە هەر هەمووومان دەبێت نیمچە کەم ئەندامێك بین بۆئەوەی سەرکەوتوو بین!!...

لێرەدا مەبەست لە لێکۆڵینەوە، فێربوونە، واتا گواستنەوەی زانیاری بۆ ژیانمان، بۆئەوەی لە تێگەیشتن و رەفتار و ئاراستەوحەز و رەوشتی تایبەت و گشتیمان سوودی لێوەرگرین، زۆر روونە کە لێکۆڵینەوە گەر کارلێك لەگەڵ ژیانماندا نەکات بێ سوود و بەهایە، واتا ئەرکێکی ئەندامی نییە لەنێو پێکهاتەی دەروونیماندا...

گەر هەست بە(هاندان) بکەین. گوێنادەینە ئەوەی چەند زیرەکین، لەبەرئەوەی زیرەکییەکی کەم لەتەك حەزێکی زۆر لەلێکۆڵینەوەدا هەزار جار باشترە لە زیرەکی بلیمەتێك بەبێ ئارەزووو حەز لەلێکۆڵینەوە.

<u>ئەمانەی خوارەوە لە لێکۆڵینەوەدا رەچاو بکرێن باشن:-</u>

١- لاپەرەکانی نوسراوەکە هەڵدەینەوە و بزانین پێرستەکەی چی تێدایە، ئایا دانەر بابەتەکانی بەپێی گرنگییان رست کردوو یان نا؟ ئەمەش چەند خولەکێك دەخایەنێت.

٢- دواتر نوسراوەکە بەزریزەی دانەر دەخوێنینەوە، بێ پێشخستن و دواخستنی بابەتەکانی.

٣- دەبێت ژەمی بیرمان وەك ژەمی خواردنی لێبکەین، واتا ئەوەندە زۆر نەبێت ئینتەلای پێ بکەین، چۆن ناتوانین خواردنی حەفتەیەك بەژەمێك بخوێن، ئەوهاش ناتوانین لە پێویست زۆرتر بخوێنینەوە،بۆئەوەی تێیبگەین و هەرسی بکەین.

٤- دەبێت خوێندنەوەمان بە نوسینیش بێت، واتا گەر بابەتێکمان تەواوکرد کورتی بکەینەوە بە نوسین و تێبینی و رەخنەی خۆشمان دیاری بکەین، باشترین رێگا بۆ تێگەیشتنی نوسراوە ئەوەیە، کەوانەیەکی لەبارەوە بلێینەوە ئەوسا بەشداری دارنەر دەکەین لە دانانەکەیدا و زۆر شتیشمان بیردەخاتەوە... خوێنەر ئەوەشی لەبیر نەچێتەوە کەوا دەتوانێت بە ئینگلیزی و فەرنسیش بخوێنیتەوە، بەڵام ناتوانێت بەو دوو زمانە بنوسێت، لەبەرئەوەی خوێندنەوە لە نوسین ئاسانترە و ئێمە لە بابەتێك زێتر تێدەگەین گەر هاتوو بەخوێندنەوەو نوسین بوو.

٥- گەر هاتوو خوێنەر لە کاتی لێکۆڵینەوەدا بیری پەرت بوو ئەوە مانای ئەوەیە کە پێش لێکۆڵینەوە کارێك هەبووە و تەواوی نەکردووە، ولەدەروونییەوە دەیەوێت تەواوی بکات، لەوانەیە پێش لێکۆڵینەوە چیرۆکێك هەبوو بێت و تەواوی نەکردبێت، یان نامەیەك هەبووبێت و وەڵامی نەدابێتەوە، یان پەیمانێکی لەگەڵ هاورێیەکیدا نەبردبێتەسەر.. هتد.. هەتا ئەم کارانە تەواو نەکات، ئەوا بیری پەرت وبڵاو دەبێت، بۆیە دەبێت پێش لێکۆڵینەوە کارەکانت هەر هەمووی تەواو کردبێت. .

٦- باشترین کات بۆ لێکۆڵینەوە بەیانیانە، لەبەرئەوەی خەوتن وئەو خەونانەی کەلە بیرمانە وئەوانەی بەبیرمان نایەنەوە، سۆزە خراپەکانی دوێنێیان سڕیوەتەوە، ئەم سۆزانە بیرت بەم لاو ئەولادا دەبەن، لەبەرئەوەی رووداو هەن یان ناخۆش



بوون، یان جارێ تەواو نەبوون، بۆیە بەشەوان لێکۆلێنەوە باش نییە.

٧- گەر ئاراستەکردنمان بە رۆژ لە هەموو لایەنێکەوە باش بووبێت، ئەوا بەشەویش لێکۆڵینەوە باشە.

٨- دەبێت کات و شوێن بۆ لێکۆڵینەوە تەرخان بکەین، بۆئەوەی ببێتە نەریت، ئەوسا دەروونمان بە ئاگا دێت و کە دەچیتە ئەو ژوورەوە، ئەوا کەش و هەوایەك بانگمان دەکات بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە.

دەبێت خۆمان لە دوا هەناسە دوور بخەینەوە، واتا خۆمان دووربخەینەوە لە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی بەردەوام و دووردرێژ، و دەبێت تۆزێك بوەستین بۆ حەسانەوە و خەوتن و پیاسەکردن ،بۆئەوەی بە گوڕ دەستبکەینەوە بە لێکۆڵینەوە.

( ٢٥ )

## چۆن نوسراوە دەخوێنینەوە؟

گەر رۆژنامە ترسناکییەکی گەورەی هەبێت لەنێو کۆمەڵی ئێمەدا، بەهۆی هێزی ئاراستەکردنییەوە، بە دووبارەکردنەوەی هەواڵ و بۆچوون، و ئەم ترسناکییە لە کاتی جەنگدا زێتر دەبێت بەهۆی ئەوەی جیهان لە گۆڕان و پەرەسەندندا خێرا تر دەبێت . ئەوا نوسراوە هەرگیز هۆیەکی بەهێزە بۆ خۆڕۆشنبیرکردن، و

کاریگەرییەکەی زۆر زێترە لە ڕۆژنامە.

ئەو لاوەی ئاواتی ڕۆشنبیرییە، دەبێت هەموو کاتی بۆ ئیشی ترەخان بکات بۆ لێکۆڵینەوەی نوسراوە، نەك تەنها خوێندنەوەی، لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوە نەریتی ڕۆشنبیرە، واتا بەپێنوس دەخوێنێتەوە، توانج لەم دێرە دەدات و ئەو دێرە ڕووندەکاتەوە، بەمەش بەشداری دانەر دەکات لە دانانەکەیدا، وکەسییەتی خۆی لەسەر ئەو نوسراوەیە ڕووندەکاتەوە، لەوەش باشتر ئەوەیە کە کورتەیەکی ئەم نوسراوەیە بنوسێت، بۆئەوەی بزانین چەند بەسوودە.

وەك چۆن باشترین خورادن هەڵدەبژێرین، وچۆن چاکترین کۆتاڵ بۆ جلو بەرگ دەکڕین، ئەوهاش دەبێت باشترین نوسراوە هەڵبژێرین بۆ ڕۆشنبیرکردنمان، چاکترین نوسەرو دانەر کە سوودمان لێوەرگرتبێ نوسراوەکانیان دەکڕین.

پلان دانان بۆ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە باشترە لە خوێندنەوەی هەڕەمەکی، ودەبێت ئەو ئامانجەش دیاری بکەی کە بە لێکۆڵینەوە دەتەوێت بگەی پێی، ئەوەندەش زەحمەت نییە، لاوێك دەتوانێت(٣-٤) جار بەتەنها دانیشێت و بزانێت پێداویستییە ڕۆشنبیرییەکانی چییە، بەرنامەیەکی یەك دوو ساڵی بۆ بابەتەکان دادەنێت، و لەو کاتەشدا دەبێت تەواوی بکات، لاو خۆی دەزانیت پێویستی بە چ لێکۆڵینەوەیەك هەیە، پێویستییە دەروونییەکانی لەم تاقیکردنەوەیە دەردەکەوێت، و لێرەدا پێویستی بەیەکێك هەیە ناوی ئەو نوسراوانەی بداتێ کە سوودی لێوەردەگرێت.



لەجیهانی ڕۆشنبیریدا نوسراوە هەن بە دایك دادەندرێن، هەموو ڕۆشنبیری جیهان دەبێت بیزانن بۆئەوەی بگەینە(بیری گشتی). هەندێك لیستێکی (١٠٠) نوسراوەی داناوە و بەگرنگی دەزانێت بۆ هەموو خوینەرێك، ئەم بابەتەش دواتر باسی لێوەدەکەین.

پێویستە خوێنەر بایەخ بە کتێبخانەکەی بدات ، جوانترین و نایابترین کەل‌وپەلی بۆ دەکڕێت، نوسراوەکان لەبەرگ دەگرێت،بۆئەوەی لێیان بێزار نەبێت. دەبێت ئەو ژوورە بەردەوام ڕایبکێشێت بەهۆی خۆشی هەوای و جوانی کەل‌وپەلی کتێبخانەکەی.

ئەو لاوەی حەزی لەڕۆشنبیری بێت، لاوێکی بەختەوەرە، واتا لە منداڵییەوە حەزی لێکردووە و لەگەڵیدا بووە و پەیوەندییەکی فسیۆلۆجی لەنێوانیاندا هەیە، وبەپێی پێویستی دەروونی خۆی نوسراوە هەڵدەبژێرێت، دەروونیش بە نوسراوە پێدەگات وەك لەش کە بەخواردن پێدەگات.

وا باشە ئەولاوە لەتەك یەك لەو دانەرە جیهانیانەدا بێت کە خۆشی ویستوون و کاریگەرییان هەبووە لەسەر ئەم چەرخە، هەموو نوسراوەکانی دەخوێنێتەوە و لێیاندەکۆڵێتەوە، لەبەرئەوەی ئەو لاوە هەموو تاقیکردنەوەکانی خۆی دەهاوێتە سەر تاقیکردنەوەکانی ئەو دانەرە و بۆچوونەکانی لەجیهانەدا، و کە ئاشنای پەرەسەندنی ئەو دانەرە دەبێت، و چۆن لە ماوەی ئەو (٤٠-٥٠) ساڵەدا ئەوها گۆڕاوە، ئەوساش ئاشنای پەرەسەندنی ئەو چەرخە دەبێت.

گریمان خوێنەر (طه حسین)ی خۆشویست، ئەوسا خوێنەر دەبێت خۆشەویستییەکەی دەربڕێت بە لێکۆڵینەوەی هەموو نوسراوەکان و نوسینەکانی (طه حسین). نابێت هەر بەوەوە بوەسێت، بەڵکو دەبێت هەموو ئەو رەخنانەش بخوێنێتەوە کە لەبارەیەوە نوسراوە، بەمەش سوود لە هەموو تاقیکردنەوەکان و بۆچوونەکانی(طه حسین)دەبینێت، هەروەك ئەوە وایە ژیانی ئەو ژیابێت و بەشداری لە نوسینەکانی کردبێت، ئەوهاش بۆ نوسەرەکانی‌تر ، بۆیە دەبێت یەك یان دوو نوسەر هەڵبژێرین و ئاگاداری هەموو ژیان و نوسینەکانیان بین، نوسراوەکانیان کۆبکەینەوە بۆئەوەی چاومان بە پەرەسەندنی بیریان بکرێتەوە کەچۆن کات لەدوای کات لە ژیانیاندا روویداوە.

زۆرڕەوی نییە گەر بڵێین پوختە و تێبینەکان بەهای خۆیان هەیە، ئەو خوێنەرەی دەیەوێت لێکۆڵێنەوە و وتوێژینەوە ووردبینی بکات، دەبێت ئەو نامیلکە بچوکەی هەبێت بۆ هەموو نوسراوەیەك ، و لەهەمان کاتیشدا دەبێت هەنگاوەکانی پەرەسەندنی بیری خۆی بپێوێت وبینوسێتەوە، گوێنەداتە ئەم یان ئەو نوسراوەیە، واتا نامیلکەیەکی بۆ هەڵسەنگاندنی نوسراوەکان هەبێت. ونامیلکەیەکیش بۆ هەڵسەنگاندنی کەسیەتی وبیری خۆی هەبێت.

نابێت خوێنەر لەپرسیارکردن بێزار بێت، نابێت لەوە بێزار بێت کە ئایا ئەم نوسراوەیە پەرەی پێ سەند و بیری بەرزکردەوە یان نا؟.. ئایا لەماوەی ئەم (٣) ساڵی رابردووە چەند ئاستی بیرم بەرزبۆتەوە؟



گەر ئەم پرسیارانە دوورت دەخەنەوە لە نوسراوە قەیناکات ، لەبەرئەوەی ئەم دوورکەوتنەوەیە گوێنەدانی گیانییە، وقسەکردنە لەگەڵ خۆ، ئەمە زێتر رۆشنبیرت دەکات و زیاتر توێژینەوە ووردبینی دەکەیت، زۆرجاریش ماوەی دابڕان هەلێکە بۆ گۆڕینی بەهای رۆشنبیری.

خوێنەر پاش ئەم دووربوونەوەیە دەگەڕێتەوە سەر رێگایەکی نوێی رۆشنبیری کە پێشتر پێنەگەیشتبوو، ولەوانەیە بگاتە ئاسۆیەکی روونتر و گەردوونێکی دوورتر، و ئاشنای نوسەری باشتر ببێت، و پەروەردەی نوێی، دەروونی دەوڵەمەندتر بکات، و لەوانەشە ئامانجەکانی بگۆڕێت.

( ٢٦ )

## لێکۆڵینەوەی زمانی عەرەبی

زمانی عەرەبی زمانی رۆشنبیری هەموو وڵاتانی عەرەبییە، نوسراوە و رۆژنامەو گۆڤاری پێ دەخوێنینەوە، بەزاراوەکانی ئەم کۆمەڵەی کە تیایدا دەژین دروستکراوە، بۆیە دەبێت لێکۆڵینەوەی لەسەربکەین، وبزانین مانای وشەکانی چین؟.. زۆر لە دەروونناسەکان دەڵێن، بێ زمان ناتوانین بیربکەینەوە، وبیرکردنەوەشمان قسەکردنێکی بێ دەنگە.

زۆر کەس ئەم بۆچوونەیان لا راستە، نوسەریش یەکەم

کەسە کە هەست بەوە دەکات ، کاتێك دەزانێت کە مانا پاش وتنی وشە دێت، کەمی وشە لای مرۆڤی کێوییەکان، گەورەترین هۆی کێویەتییانە، مانای بەرز و جوانیان نییە لەبەر ئەوەی وشەیان نییە ئەو مانا جوانانە بدات، ئەو زمانەی وشەی وردی تێدا بێت، لەتێگەیشتندا مانای سنووردارت دەداتی و یارمەتی پێشکەوتنی نەتەوە دەدات، بەپێچەوانەوە، ئەو زمانەی کە هاوواتاکانی زۆرە، و چەندین مانا دەدات، جاریش هەیە بەپێچەوانەیە ، نەتەوە دوا دەخات لەبەرئەوەی بیرسازدان گەندەڵ دەکات و بیرکردنەوە رادەگرێت، ئەم جۆرە وشانەش وەك پارەی قەڵبیان لێدێت و بەهایان کەم دەبێتەوە.

زمانی عەرەبی ، گەر بە وردی بەکارمان هێنا، وشەی جوانمان هەڵبژارد و ناشرینەکانیشمان بەلاوە نا، باشترین زمانە، بەرێکی بەکارهێنانی دەمانگەیەنێتە شێوازی ئابووری ، یان شێوازی بروسکە ئاسا لە دەربڕیندا، ئێستا نەریتی نوسینی کۆنمان بۆ ماوەتەوە، زمانی عەرەبی لای نەتەوە عەرەبەکان وەك زمانی لاتینی ئەوروپاییەکانە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا... واتا چەند نەخشێکی وتنی تڕۆیە، و خۆهەڵکیشانە بەهاوواتەکانی و چڕکردنەوەی وتنی یاری منداڵانەیە، تاگەیشتە رادەیەك کارلێککردنی لەگەڵ کۆمەڵدا نەما.

کۆمەڵ بی زمانی عەرەبیش پێشدەکەوێت ، زمانی عەرەبی ئێستا لاڵە بەرامبەر زیاتر لە (١٠٠) زانست و هونەرەی هاوچەرخ، کە هەموو نەتەوە پیشکەوتووەکان چێژ و سوودی لێوەردەگرن جگە لەنەتەوەی عەرەب.



بەهۆی ئەم دابڕانەی نێوان زمان و کۆمەڵ، وێژە لە درووونی میسریدا دواکەوتووە،وایلێهاتووە نازانین هونەری (دراما) چییە؟! هەیە دەڵێت بەزمانی گشتیمان و باومان دەنوسین،و دەبێت هەوڵی بۆ بدەین، تێکەڵ بوون لەم کێشەدا زۆرە، وەك نوسەر رای خۆمی لەسەر دەڵێم:-

کێشەی زمانی عەرەبی کێشەی بیرکردنەوە و رۆشنبیرییە بۆ میسرییەکان، زمان لە پێشبرکێدایە ئەو زمانەی نەتوانێت رۆشنبیرت بکات و راژەت بکات، دەکەوێت. ئێستا جولانەوەی بیری نوێ هەیە، وەك جووڵانەوەی سیمائییە.

واتا رەوانبێژی نوێ هەیە، وشەی نەخشاوی راودەنێت، و وشەی نوێش دەهێنێتەکایەوە.

(الانگلیزیة الاساسیة) هەیە، کە بە (٩٤٦) وشەی سەرەکی لێکۆڵینەوەی ئەو زمانە دەکەیت، مەبەستیش گشتاندنی ئەو زمانانەیە لە جیهاندا، بە ئاسانکردنی تا ڕادەیەك ، بیانێیك بەچەند حەفتەیەك فێری دەبێت.

بۆچاکسازی زمانمان لەمیسردا، پێویستیمان بەوە هەیە کە هەموو وشەیەك هەڵە لەدەربریندا بکات، وەك هەڵەی رێزمانی ژمێرەی بکەین، داواکاری رۆشبیری لەمیسردا، یان لەهەرچ ولاتێکی عەرەبی تردا، پێویستی بە زانینی زمانی عەرەبی هەیە بە ووردی و پڕوچڕی.... بۆئەوەی کاتێك (الاغانی) ونوسینەکانی (المعری) و(ابن الخلدون) دەخوێنێتەوە خۆی بە نامۆ نەزانێت. لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتانەی کە بایەخی دەدەنی، باشترین شێواز و رێگایە بۆ فێربوونی زمان، بەوەش زمان

دەگوازینەوە بۆئەو کەش‌وهەوایەی کە وشەکانی تێدا بەکارهاتوون.

ئەو پزیشکە هاوچەرخەی کە بەچێژەوە نوسراوەی (طبقات الاطباء)ی (ابن ابی اصیبعە) بخوێنێتەوە، زۆر گوێناداتە ئەو وشە نامۆیانەی کە دێتە ڕێی، لەبەرئەوەی لەنێو کەش‌وهەوای ماناکاندا لە نامۆکانیش دەگات.

لێکۆڵەری فەلسەفە دەتوانێت بەشێوەیەك دوای (ابن الرشد) و(ابن سینا) بکەوێت، کەلەتوانای پسپۆڕی زمانی عەرەبیدا نییە، واتا ڕاستەوخۆ لێکۆڵێنەوەی زمان نەکەین ، واتا زمان بەمادەیەکی سەربەخۆ دانەنێین، لەبەرئەوەی لەڕاستیدا زمان شێوازی دەربڕینە، دەربڕینیش لە کۆتاییدا چارەسەری بابەتەکانە.

مەبەستم ئەوە نییە کە پێویستیمان بە فەرهەنگ نییە، ڕاوێژمان بکات گەر هاتوو تووشی زەحمەتی بووین. بەپێچەوانەوە، داوکاری ڕۆشنبیری بێ فەرهەنگ‌و ڕاوێژ ناتوانێت، ودەبێت بزانێت کە وردی تێگەیشتن و جیاکاری، مانای تێگەیشتنە لە وردی دەربڕین، ئەو نوسەرەی ئەوها نەبێت . خوێنەر زەرەرمەند دەکات.

نابێت لێکۆڵینەوەی زمان بۆ پسپۆڕان بەلاوە نێین... لەبەرئەوەی گەر وامان کرد، گەورەترین شێوازی بیرکردنەوە بەلاوە دەنێین، ئێمە بە زمان بیردەکەینەوە، واباشترە هەموو ڕۆشنبیرێك بنوسێت، بنوسێت بۆ ڕۆژنامە ویان نامیلکەیەك دانێت کە جێگەی بایەخییەتی، لەبەئەوەی بە نوسین، وردبینی



لە هەڵبژاردن و چۆنیەتی بەکارهێنانی وشە کاردەکات، لە کۆتاییدا سوودیش هەر بۆ خۆیەتی، لەبەرئەوەی لەلێکۆڵینەوەو خۆ پەرەوەردەکردندا فێرە وردبینی دەبێت.

دەبێت جیاکاری نێوان تێگەیشتنی ئەری و نەری بکەین، ئێمە کە زمانی ئینگلیزی فێردەبین، مەبەستمان فێربوونی خوێندنەوەیەتی، واتا کە نوسراوەیەکی ئینگلیزی دەخوێنینەوە، تێگەیشتنمان نەری دەبێت، بەڵام کە هەمان نوسراوە دەخوێنینەوە و بە نوسینی کورت چارەسەری دەکەین، ئەوسا تێگەیشتنەکەمان ئەریَ دەبێت.

توانای خوێندنەوە، تێگەیشتنێکی نەرییە، بەڵام توانای نوسین لەسەری تێگەیشتنێکی ئەرییە، با ئەوە لە نێوانماندا ببێتە باو گەر نوسراوەیەکی بیانیمان خوێندەوە.

گەر هاتوو هەموو نوسراوەیەك کورتەیەکی لەسەر بنوسین ، یان وانەیەکیان لەسەر بڵێینەوە، ئەوە دەبێتە هاندەرێك بۆئەوەی لێکۆڵینەوەی بابەتەکە زیاتر بکەین ، و هەروەها لە زمانیشدا ئەوهایە....

نوسراوەی(البلاغة العصرية و اللغة العربية) ی خۆم ، خوێنەر لەو بابەتەدا زۆر قوولتر دەکاتەوە.

( ٢٧ )

## ویژەی کۆنی عەرەب

ئـەم کۆمەڵـەی میسـرە، بـەڵکو هـەموو کۆمـەڵێکی عـەرەبی ، لەباوەشی رۆشنبیری عەرەبیدا دەستپێکردووە، وبەشیری دابی ئیسـلام بـەخێوکراوە، لەبەرئـەم هۆیــە، هــیچ میســرییەك ، یــان عــەرەبێك ناتوانێـت رۆشـنبیری عـەرەب پشـتگوێ بخـات، لاوی رۆشـــنبیری مۆســـڵمان‌و غـــەیرە موســـڵمان، پێویســـتی بەلێکۆڵینـەوەی رۆشـنبیری عـەرەب هەیـە، بـۆ تێگەیشـتنی ئـەو بنەمایانەی کە کۆمەڵەکەمانی لەسەر دامەزراوە، پێویستیشی بە لێکۆڵینەوەی ویژەی عەرەبە و بەڵکو بەرۆشنبیری عەرەبیشـە... چۆن دەستپێکرد و پێگەیی، و چۆن گەندەڵ بوو و هەرەسی هێنـا، و دەبێـت بزانێـت ئـەو نەخۆشییانە چین، کـە نەیانهێشـت عـــەرەب پـــێش ئەوروپاییـــەکان راپـــەڕینی نـــوێ بکـــات، کـــە لەسـەدەکانی ناوەڕاستدا عـەرەب ئاسـۆی ئەوەنـدە تاریـك نـەبوو وەك ئەوروپاییـەکان، ودەشبێت بزانێت راپـەڕینی کۆنی عـەرەب سنووری تا کوێ بووە.

لـەپاڵ هـەموو پێشـکەوتنێکی ویـژەیی یـان زانسـتی یـان ئاینیدا، باری ئابووری هەیە، و هەر ئـەو جولاندنەیـە گۆڕیویـەتی و پەرەیپێسـەندووە و نابێـت بڵـێین کۆمـەڵی عـەرەب دەرەبـەگ



بوون لـە چـەند چـەرخێکدا، وشـەڕانی بوون لـە چـەند چـەرخێکی تـــردا و رۆشـــنبیری عـــەرەب بـــەم بارودۆخـــە ئابوورییـــە وایلێهاتووە؟!.

<u>گەر بمانەوێت بە کورتی باسی بکەین ئەتوانین بڵێین:-</u>

١- ویژەی عەرەب لە خزمەتی چینی بەرزی نەتەوەکەدا بووە کـە (خلیفـە)و(امیر) و دەوڵەمەنـدەکان بـوون و بـەس، بەدەگمـەن لەمیســـــردا دیموکراســــــی هـــــەبووە، لـــــەرۆژگاری (الفـاطمـین)و(الممالیـك)دا ، بـەهۆی گواسـتنەوەی بازرگانییـەوە لەنێوان ئەوروپا و ئاسیادا نوسـەرەکان دەستیانکرد بەنوسین بۆ میللەتیان وەك چیرۆکی (الف لیلەولیلە)و(ابی‌زید)و(بیبرس).

٢- تێڕوانینی تاك بوو، جیهانی نەکردبوو بەبابەت، وبایەخی نەدەدا بەکێشەی مرۆڤایەتی.

٣- جیاکردنـەوەی نێـرو مـێ کـارێکی زۆر خراپـی کردبـووە سەر ویژەی عەرەب.

٤- روانگەی جیهانی لەویژەی عەرەبدا وەك روانگـەی ویـژەی ئەوروپا بوو لە سـەدەکانی ناوەڕاستدا. روانگەیـەکی ئەفسـانەیی نادیار بوو، نەك ویژەیەکی مرۆڤایەتی جیهانی بێت.

٥- خەریك بوو عەرەب لە فەلسەفەدا راپـەڕێت، بـەڵام (الغزالی) وئەوانـەی بـەو دەچـوون ئـەو راپەرینـەیان کوشـت، لەبەرئـەوەی فەلسەفەیان بە (کفر) دادەنا.

باشە، بۆچی عەرەب لەسەدەی (١٥)دا رانەپەرێن؟؟. (کرۆثـەر) ئەم هۆیانە دەستنیشاندەکات لە :-

أ-کۆیلـەتی کە کاری دەسـتیدەکات، وای لـە کۆمـەڵی عـەرەب

کرد کە پێویستی بە داهێنانی ئامێر نەبێت بۆئەوەی کارەکان ئاسان بکات.

ب-حەرامکردنی سوو، دامەزراندنی بانکی زەحمەت و قورس کرد، کە بۆ بازرگانی دەریایی زۆر پێویست بوو بگرە بۆ نێوان دوو شاریش هەر گرنگ بوو.

ج- قەدەغەکردنی توێ کاریی ، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە پزیشکی و بایەلۆجی نەبنە زانستی تاقیکردنەوە.

د- قەدەغەکردنی وێنەکێشان، ئەم قەدەغەکردنە پەیوەندی بە پزیشکی و بایەلۆجی و بیناسازی و پەیکەسازییەوە هەبوو.

هـ- کەمی دار و خەڵوز، لەبەرئەوەی دورستکردنی پاپۆر و کارگە و بەکارهێنانی ئاسن پێویستییان بەو دوو مادەیە هەبوو.

ئەم هۆیانە بەڕای (کرۆثەر) بوونەتە تەگەرە بۆ راپەڕینی عەرەب، و هۆی بەجێن، بەڵام ئەم بابەتە جارێ نوێیە، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زۆر هەیە. لەبەرئەوەی تا ئێستا ئێمە نازانین بۆچی عەرەب پەرلەمان وئەنجومەنی شارەوانی نەبووە؟؟... وەك ئەوروپاییەکان کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هەیانبوو. لەوانەیە داگیرکەرانی تورك‌و فارس و تەتەر مەزنترین هۆی دواکەوتنی عەرەب بووبن، سەرەڕای ئەوەش عەرەب بە لێکدابڕاوی مانەوەو تەنها مەبەستیان سەروەری ئایینی بوو.

تاریکی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ عەرەب کەمتر تاریك بوو وەك لەئەوروپا ، رۆشنبیری عەرەب نێوان سالانی(٧٠٠-١٤٠٠) دا زۆر پێشکەوتووتر بوو لە رۆشنبیری ئەوروپای ئەوکاتەدا.

لەوانەیە ئەم هۆیانەی خوارەوە بەجێ بن:-



١- عەرەب ئاخوندیان نەبوو دژی رۆشنبیری بن، وئازدای بیرسنوودار بکەن، وایە زۆربەی خەلیفەی عەباسییەکان هەمان مافی ئاخوندەکانیان بۆ خۆیان دروستکردبوو، بەڵام وەك ئەوروپا نەبوو کە پەیوەندی نێوان بیرکردنەوە و میللەتیان پچڕاندبوو.

٢- سادەیی ئیسلام و خۆ خەریك نەکردن بە نادیار، وای لە موسڵمانان کردبوو لەبیرکردنەوەدا لەئەوروپاییەکان ئازادترین.

٣- داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی لە سنوری چینەوە تا دەگاتە زەریای ئەتڵەسی و سەربەستی عەرەب بۆ گەیشتنە ئەوپەڕی رۆژهەلات ، کارێکی وایکرد کە شاری گەوەرە دامەزرێت، وشاری گەورەش بەهۆی فراوانییەوە، بازرگانی دەگاتە ولاتی دوور، ئەمەش بناغەی رۆشنبیرییە، کەچی لە ئەوروپادا رۆشنبیرییەکان لادێیانە مایەوە، لەبەرنەبوونی رێگاوبان لەنێوان ئەفریکا و ئاسیا((عەرەب هەرخۆی ئەو رێگایەی گرتبوو)).

٤- دەریا رێگای گەیاندن بوو لەنێو عەرەبدا کەچی لای ئەوروپاییەکان وانەبوو.

ئێستا لەوانەیە خوێنەر بپرسێت و بڵێت:

ئەم هەموو درێژەدانە بە وێژەی عەرەب و رۆشنبیرییە کۆنەکەی چییە؟؟ومەبەستی ئەم بەشەش تەنها ناسینی ئەو رێبازەیە تا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت!!.

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە دەبێت هەڵسەنگاندن و راستکردنەوە هەبێت، زۆربەی ئەوانەی لەمیسردا حەزیان لە

لێکۆڵینەوە و رۆشنبیرییە، وا دەزانن کە وێژەی عەرەب چاکترین و باشترین وێژەیە لەنێو مرۆڤایەتیدا، هەروەك بڵێی لەم جیهانەدا، بەرهەمی بیری چینییەکان و هیندییەکان و ئەڵمانەکان و ئینگلیزەکان وهتد.. بەهای نەبێت بەرامبەر بەرۆشنبیری کۆنی عەرەب.

زۆر پێویستە لەوێژەی عەرەب بکۆڵینەوە، بەڵام بە مەرجێك بزانین پلەوپایەی چەندە لەنێو وێژەی جیهانیدا، هەر لەبەرئەوەی لکاوە بە سەدەکانی ناوەڕاستەوە و لەراپەڕینی مرۆڤایەتی هاوچەرخیشەوە دوورە.

**باشە... ئەی چی بخوێنینەوە لە وێژەی کۆنی عەرەب؟..**

ئەمە دوو بەشە .. بەشێکیان نوسراوەی دایکن، دەبێت هەمان بێت بۆ خوێندنەوە و راوێژ پێکردنی، بەشەکەی تریش دەکرێت هەتبێت یان نەتبێت و دەکرێت هەندێکیان فراوانتر و قوولتر بخوێندرێنەوە لە وانیتر.

لای من، هەموو لاوێك ئاواتی رۆشنبیری بێت، وبیەوێت زانیاری گشتی رۆشنبیری کۆنی عەرەب مسۆگەر بکات، پێویستی بەم (٦) نوسراوەی خوارەوە هەیە، کە (٧٠-٨٠) بەرگ دەبن:-

أ- قورئان:- کە بناغەی دامەزراندنی کۆمەڵی عەرەبە، وئەمەش تەنها ئەرکی موسڵمان نییە، بەڵکو ئەرکی فەلەو جولەکە و کافریشە.

ب- (تأريخ الطبري):- لەوەوە هەموو راستییەکان وئەو چیرۆکانە دەناسین کە بیرکردنەوەی عەرەبی دروستکردووە،



وبەڕاستیش مێژووی سێ سەدەی عەرەبە.

ج- (معجم الادباء)ی(یاقوت):- فەرهەنگێکی وێژەی بەرزە، وژیاننامەی نوسەرکانی تێدایە ، لەگەڵ توانج لەسەر کەسیەتییەکەیان و نوسراوەکانیان بەپێنوسی خودی(یاقوت) خۆی، کە چاوی خوێنەر دەکاتەوە و ژینگەکانی وێژەی کۆنی عەرەب دەردەخات.

د- (ألاغانی)ی (ابی الفرج الاصبهانی): فەرهەنگێکی وێژەیی مەزنە و باسی چینە بەرزەکانی کۆمەڵی عەرەبی دەکات.

هـ- (لسان العربی)ی (أبن منظور):- ئەویش فەرهەنگێکی چاکە، بەرێبازێکی کۆنی عەرەب نوسراوە.

و- (نفح الطیب) ی (المقریزی) :باسی مێژووی ئەندەلوس دەکات، کە چەند باری پێشکەوتووو دواکەتوو لەنێو خەونەکانی عەرەبدا هەبووە، و خەریك بووە ئەو خەونانە ببنە راستی: گەر ئەوە لە ئەوروپادا بکرابا ، مێژوومان دەگۆڕا.

ئەم (٦) نوسراوەیە دەبێت هەتبێت و بیپارێزی و بناغەی رۆشنبیری کۆنی عەرەبن .

**چاکترین نوسراوە بۆ لێکۆڵینەوەی وێژەی کۆنی عەرەب دووانن:-**

(وعاظ السلاطین ) ی (دکتۆر علی الوردی)

(أسطورة الادب الرفیع)ی (دکتۆر علی الوردی)یە

ئەم دوو نوسراوەیە ، چاو و مێشك پێکەوە دەکاتەوە، لەسەر ئەو راستییانەی کە لێمان شاردرا بۆوە، وبێ ئەو دوو نوسراوەیە لەوێژەی عەرەب ناگەین.

( ٢٨ )

## نوسراوە کۆنەکانی عەرەب

لەبەندی رابردوودا باسی ئەو (٦) نوسراوەیەمان کرد کە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەن، و هەر هەمووشیان پێویستن، لەم بەندەشدا باسی چەند نوسراوەیەکی کۆنی عەرەب دەکەین، کە بابەتەکانی وێژەیی و گەشتوگوزار ومێژوو و زانستن. خوینەر خۆی دەزانێت چەندی لەمانە پێوستە، ولەکامیان خۆی قوولتر دەکات، هەیە مێژووی لەوێژە پێ باشترە، وهەیشە بەپێچەوانەیە، وهەیە حەز لە لێکۆڵینەوەی فەلسەفە دەکات، وهەیشە وا نییە.

ئەو لاوەی لەرۆشنبیری عەرەب بکۆڵێتەوە، وئارەزووی لەیەك لە هونەرەکانیان هەبێت، پاش هەندێك لێکۆڵینەوە دەتوانێت لەو هونەرە سەربەخۆ بێت، وەدەشتوانێت بازدا بۆ هونەرێکیتر کە پەیوەنداره بەو هونەرەوە.

پێش هەموو شتێك رۆشنبیریی کۆنی عەرەب، رۆشنبیری وێژەییە، ولەمەشدا دەوڵەمەندە، و بۆئەوەی بەچاکی وتێرو تەسەلی وێژەی عەرەب بخوێنینەوە، لە(الجاحظ) هوە دەستپێدەکەین، ویەك وشەشی لەکیس خۆمان نادەین، مەزنترین نوسەری عەرەبە، مرۆڤێکە بیرکردنەوەی فەرهەنگی و مرۆڤانەیە،



لەگەڵ هەرچ نوسەرێکی ئەوروپایی بەراوردی بکەی، لەئەنجامدا زۆرکات (الجاحظ) سەردەکەوێت، (الفصل البدیع) و(البیان والتبین) وا دادەندرێت کە باشترین نوسینی (الجاحظ)ە، بەڵام وا نییە، نوسینەکانی(الجاحظ) پلە یەك و دوو سێی تێدا نییە، هەر هەمووی پلە یەکن، گواستنەوە لە (الجاحظ)ەوە بۆهەر چ نوسەرێکی تر بەرەو لێژییەکی گەورەیە، لەرۆژگاری ئەمەوییەکان و عەباسیەکاندا وێنەی وەکو ئەوی تێدا نەبوو.

لە هەموو نوسینەکانیدا، بایەخی زۆری بەبیری زیندوو دەدا، وژیرانە چارەسەری دەکرد، بوێرانە و بلیمەتانە وتووێژی ئاینی دەکرد، بگرە بەهەمان شێوەش لە لێکۆڵینەوەی ئاژەڵیشدا هەر وابوو. دەتوانین بڵێین، ئەو لاوەی هیچ نەزانێت لەبارەی(لجاحظ)ەوە ئەوا شتی زۆر گرنگی وێژەی کۆنی عەرەبیش نازانێت.

پاش (لجاحظ) یش ئەم شاعیرانە دێن:

(المنتبی)و(ابن الرومی) و(ابی تمام) و(ابن العتاهیة)و(الاخطل) و(ابوعلاء المعری). واباشە نوسینەکەی (طە حسین)لەسەر (المعری) و( رسالة الغفران) لەنوسینی (کامیل کیلانی) بخوێنیتەوە.

ئامۆژگاری خوێنەر دەکەم لێکۆڵینەوە لەسەر یەك لە نوسەرەکان بکات، هەموو شتێکی بخوێنیتەوە، دواتر ئاوڕ لە نوسەری تر بداتەوە ، بۆیە روونکردنەوەی(ابن ابی الحدید) لەسەر نوسراوەی (نهج البلاغە) لە نوسراوە دەگمەنەکانە، کەپێویستمان پێی هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر (الجاحظ) و

نوسەری تر.

هەروەها پێویستیمان بە نوسراوەی تر هەیە کە جیاوازی لەنێو هەواڵەکان و نوسینەکانیاندا هەیە، نوسینەکانی (احمد امین) لەبارەی پەرەسەندنی بیر لەسێ سەدەی یەکەمی کۆچیدا، ونوسراوەی (عصر المأمون) ی (فرید الرفاعی) چاکن بۆ لێکۆڵینەوە.

لای من (الجاحظ)و (المعری) دووکەسیەتی بەرزی وێژەی کۆنی عەرەبن ، جگە لەم دووانە ، ئەوانی تر، لە نوسەر و شاعیر دەتوانرێت لەسەرەخۆ نوسینەکانیان بکۆڵینەوە لەبەر رۆشنایی ئەو دوو کەسایەتییەدا.

هەیە(المتنبی) گەورە دەکات ، و بەهای ئەویش لای من سنوردارە، ململانێی نێوان رۆم و عەرەبو(الدولە الحمدانیە) سەنتەری ئەم ململانێیە بوون، نوسینەکانی (الهمذانی)و(الحریری)یش دەخوێندرێتەوە، بەهای مێژوویيان هەیە، بەڵام بەهای هونەرییەکەیان زۆر کەمە، گوڕی(ابی تمام) و هەڵبژاردەی (البارودی) لەشیعردا راوێژیان پێدەکرێت و هەردووکیان دەرگای فراوانبوون دەکەنەوە.

پێویستە گەشتەنامەکانی عەرەب بخوێندرێتەوە، وەك نوسراوەکانی(ابن بطوطة)و(ابن جبیر)... (ابن بطوطة) لەتەنجەی سەر رۆخی زەریای ئەتڵەسیەوە بەرەو رۆخی زەریای هادی لەچیندا گوزەری کردووە، و جیهانێکی مەزنی بۆ ئاشکرا کردوین کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هیچمان لەبارەوە نەدەزانی.

و(ابن جبیر)یش باسی هەموو وڵاتانی دەریای ناوڕاست



دەکات.

سەرباری ئەوانەش ، پێویستە نوسراوەکانی جوگرافی زانەکان بخوێنینەوە وەك (الادریسی) ... نوسراوەی (یاقوت فی البلدان) کە فەرهەنگێکە و سەرچاوەییکە بۆ خوێنەر.

لە زانستە کۆنەکاندا، عەرەب دەوڵەمەندە نییە، (حیاة الحیوان)ی(الدمیری)و (طبقات الاطباء)ی(ابن ابی أصیبعە) و نوسراوەی(الانطاکی ) ی لە دەرماندا و (البیروتی) لەبیرکاریدا و(ابن سینا). هەموو ئەو زانستانە چارەسەری پزیشکی و بیرکاری و ئاژەڵ دەکەن، لەگەڵ داستان و راستیدا تیکەڵبوون، بەهایەکەشیان مێژووییە، باشتریش وایە(تراث العرب العلمی)ی (قدری حافظ طوقان) بخوێنینەوە لەو بارەیەوە.

زمانی عەرەب پڕە لە نوسراوەی مێژوویی، و (الطبری)یمان لەبەندی پێشوودا بەسەرچاوە دانا، و وتمان راوێژی پێدەکرێت، لەوێش بترازێ (ابن الاثیر)و(المسعودی) و(ابن خلدون) و( ابن خلکان) هەن و نوسراوەی چاکیان هەیە.

لەفەلسەفەشدا، نوسینەکانی(ابن سینا) و(الفارابی)و(الرازی) (ابن رشد) مان هەیە و کۆمەڵی (أخوان الصفا)شی لەگەڵ بێت. هەموو نوسینەکانیان سوودێکی مێژوویيان هەیە، لەبەرئەوەی هیچ بایەخێکی فەلسەفی لەم چەرخەدا نییە، وا باشە نوسراوەی (الفلسفة فی السلام)ی (ج.دی بۆر) وەرگێڕانی (م. ع. ابوریدە) راوێژی پێبکرێت.

( ٢٩ )

## میسر لەوێژەی کۆنی عەرەبدا

پێویستیمان بە لێکۆڵینەوەی وێژەی کۆنی عەرەب هەیە ، و بەتایبەتیش بەشێکی زۆری بۆ میسر دادەنێن، میسر بەشێکی جیهانی عەرەبییە لە کۆنەوە تائێستا. چەندین سەدە لەژێر دەسەڵاتی خەلافەتدا بووە، چەندین سەدەش سەربەخۆ بووە و دوور بووە لە خەلافەتەوە.

جوانترین وێژەی میسر لەرۆژگاری سەربەخۆییەکەیدا بووە، لەبەرئەوەی خەلافەتی دیمەشق و بەغدا و قوستەنتنیە وێرانکارییان تیادا دەکردو سەرو ماڵیان لێوەردەگرتن، تەنها لەسەردەمی(هارون الرشید)دا(٢٢) والی حوکمڕانی میسریان کردوە، و خەمی هەر هەموویان پارەپەیداکردن بووە، بۆئەوەی لە گەڕانەوەیاندا بۆ بەغدا بەتێر و تەسەلی بژین.

لەوالییەکی بیانی چاوەڕی ناکرێت دەزگا دابمەزرێنێت و ئاوەدانی تێدا بکات. لەبەرئەوەی دەیزانی لەساڵێك زیاتر نامێنێتەوە. میسر لەکاتی والییەکاندا هەر دۆشراوە، و کەسیەتیشی لەدەستدا بوو. لەسەردەمی تورکەکاندا ئاستی گەیشتە ئاستێکی مێژوویی مرۆڤایەتی زۆر نزم ، ئێمە لەرۆژگارەکانی ئەو والییانەدا بی مێژوو بووین.



پاش سەربەخۆ بوون و لەچەرخی (الطولونین) و(الآخشیدین) و(الفاطمین)و(المماليك)دا، میسر بووژایەوە ، والی دەمایەوە و هەستی دەکرد کە میسر تاکە نیشتیمانییەتی، دەبێت هەوڵ و تەقەلای بۆ بدات و خۆش و رێك‌وپێکی بکات، بەڵام ئەم بووژانەوەیە هەر رووکەش بوو لەبەرئەوەی جەستەی نەتەوەکە برینداربوو لەژێر ستەمدابوو تاگەیشتە رادەیەك لە (٦) ملیۆن دۆنم تەنها(یەك لەسەر چواری) ملیۆن دۆنم کشتوکاڵی تیادادەکرا.

لە نوسراوەی (المجمل فی التأريخ المصری)ی مامۆستا (حسن ابراهيم حسن) و لەماوەی (الفاطمين) دا، و لەلاپەڕە (١٦٩)دا دەڵێت:

لەرۆژانی خەلیفەی (فاطمی)،(المعز)(٢٨٥,٧١٤) دۆنم زەوی دەچێنرا و لەوەزارتەکەی (بدر الجمالی) یش هەرئەوەندە بووە، بەڵام لە (خەلافەتی المستنصر)دا زۆر کەمتر بۆتەوە، بەهۆی نەخۆشییەوە یان هاتنەخوارەوەی ئاستی ئاوەوە لەزێی نیلدا نەبووە، بەڵکو هۆیەکەی گەندەڵی وخراپی حوکمڕانی بووە، **ئەمەش لیستێکە بەو زانیارییانە:-**

| ناوی والی | ساڵی وکۆچی | رووبەرووی زەوی چێندراو |
| --- | --- | --- |
| عمر بن العاص | ٢٠ | ٦ملیۆن دۆنم |
| هشام | ١٢٥ | ٢ملیۆن دۆنم |
| المأمون | ٢١٨ | ٢,١٢٨ملیۆن دۆنم |

| | | |
|---|---|---|
| ابن طولون | ٢٧٠ | ؟ |
| الاخشيد | ٣٣٤ | ٠,٥ مليۆن دۆنم |
| المعز | ٣٥٨ | ٠,٢٨٥ مليۆن دۆنم |

قسەی مامۆستا (حسن ابراهيم حسن) تەواو بوو، وئامۆژگاری خوێنەر دەکەم نوسراوەی (فی الادب المصری الاسلامی)ی( محمد کامل حسين) بخوێنێتەوە، کەباسی ئەو وێژەیەمان بۆ دەکات لەسەرەتايەوە تا دەگاتە دامەزراندنی دەوڵەتی (الفاطمين). پێويستيمان بە(١٠) نوسراوەی لەوجۆرە هەيە، بۆئەوەی مێژووی وێژەمان لە هاتنی عەرەبەوە تا سەرەتای سەدەی رابردوومان بۆ روونبکاتەوە، و ئەمەش بە چەندساڵێکی تر دەبێت، لەبەرئەوەی قورس و زەحمەتە.

ميسر لەوێژەی عەرەبيدا وەك عيراقی پايتەختی خەلافەت پێش نەکەوت، ئەوعيراقەی کە پارە و داهاتی چاکی بۆ دەهات لە هەموو ئەو دەوڵەتانەوە کەلە ژێرسێبەری خەلافەتدا بوون،هەموو نوسەر و بيرمەندە سەرکەوتووەکان روويان تێدەکرد، لەميسردا شاعيرێکی وەك (البحتری)و (ابن الرومی)و(ابی نواس)ی تێدا هەڵنەکەوت و فەرهەنگی نايابی وەك (الاغانی) يش نابينين، مەگەر (لسان العرب) بەوە دابنێين!!

لێکوڵينەوەی وێژەی عەرەب لەميسردا تا ئەم چرکەيە لێڵە، نوسراوەش لەسەر ئەم بابەتە کەمە، و گەر هەبێتيش ئەوە نييە پێی بڵێين باشترين نوسراوەيە کەخوێندوومانەتەوە!!لەدانەرە بەناوبانگەکان(القريزی)يە، کە مێژوونوسێکی لێهاتووبوو، و



نوسراوەی (النجوم الزاهرە)ی(ابن تغری) باشترينيانە و مێژووی ميسری تێدايە تادەگاتە (٧٥٠)ی کۆچی.

نوسراوەی(المکافأة)ی( ابن الدايە)و نوسراوەی (الولاة والقضاة)ی( الکندی) تيشکی تەواو دەخاتە سەر مێژووی ميسر لەسێ سەدەی يەکەمی ئيسلامدا، و نوسراوەی (البغداد)يش نوسراوەيەکی چاکە، و گەشتنامەيەکە لەنێو ميسردا، و نوسراوەی (حياة أبن خلدون بقلمە)زۆر چاکە و باسی باری وڵاتمان دەکات کاتێك هاتبوو و تيايدا مابووە.

شاعيرە ئيسلامييەکانی ميسر پلە يەك نەبوون، بەڵام شيعرەکانی(ابن نباتە)و (البوحتری) و(البهاء زهير) شايەنی خوێندنەوەن، لێکۆڵەری بابەتی ميسری ئيسلامی دەبێت نوسراوە زانستييەکان بخوێنێتەوە، وەك چيرۆکی (الظاهر بيبرس) کە باسی کۆمەڵايەتی نيو ميللەت دەکات، و ئەوەندەش پەلی بۆ وێژە و شيعر نەهاويشتوە.

**بۆ خوێندنەوەی مێژووی ئيسلامی ميسر ئەم نوسراوانە باشن:-**

١- (البهاء زهير) ی (مصطفی عبد الرزاق).

٢- (المماليك فی مصر) وليەم مۆيەر. وەرگێڕانی (محمود عابدين) و( سليم حسن).

٣- (کنوز الفاطمين) ی( زکی محمد حسن)

٤- (تأريخ الاسلام السياسی)ی ( دکتۆر حسن ابراهيم حسن)

**بۆخوێندنەوەی کۆتایی سەدەی رابردوو ئەم نوسراوانە چاکن.**

أ- (تأريخ الجبرتى).

ب- (فتح مصر الحديث)ى ( حافظ عوض بك).

ج- (السيد عمر مكرم)ى( فريد أبو حديد)

د- (محمد على)ى(كريم ثابت)

هـ- (علم الاقتصاد للمصرين)ى( محمد فهمى لهيطة) كەباس لە مێژوو دەكات.

و- (من عهد المماليك الى نهايه حكم اسماعيل) ى يۆنگ. وەرگێرانى(على احمد شكرى).

ز- (المجمل فى التأريخ المصرى) ى( حسن ابراهيم حسن).

سەرەڕاى ئەم نوسراوانەى سەرەوە، هەموو نوسراوەكانى(عبدالرحمن الراقص بك) چاكن و هيچ كاميشيان پشتگۆى نەخرێت، و چەند پێيدا هەڵدەم هێشتا هەر كەمەوئەوەى نەيخوێنێتەوە لەمێژووى ميسر وبناغەى مێژووى نوێى هاوچەخدا نەزانە.....



( ٣٠ )

## رۆشنبیری نوێی عەرەب

هەر كات خوێنەر پێویستی بەم بابەتە بوو ئەوا چەندین نوسراوەی جۆراوجۆر لە كتێبخانەكان دەدۆزێتەوە ، جاریش هەیە لەنێو رۆژنامەكاندا بانگەشەی بۆ دەكرێت، ولەبەرئەم هۆیەش خوێنەر پێویستی بە رێنماییە.

جەماوەری خوێنەر لەمیسردا دوو بەشن، بەشێكیان خوێندنی تەواو كردووە بە چاكیش فێرە زمانێكی ئەوروپایی بووە،ئەوانەش بەدەگمەن نوسراوەیەكی عەرەبی دەخوێننەوە، لەبەرئەوەی ئەوروپاییەكان نوسراوەی چاكیان هەیەو رۆشنبیری هەمەجۆری تیدایە، و ئەو خوێنەرانە دەتسیان دەكەوێت، زۆر بەكەمیش یەك لەو خوێنەرانە نوسراوەیەكی عەرەبی بەدەستەوەیە، یان باسی نوسەرێكی میسری دەكات، لەبەرئەوەی چاوگەی وێژەیی ئەو فەرەنسی یان ئینگلیزی یان ئەڵمانییە.

ئەمە جێگای نیگەرانی دانەرەكانە لەمیسردا، ناشتوانین بەبچووكی سەیری ئەم جەماوەرە بكەین، و دەبێت دان بەوە دانێین كە جەماوەرێكی پێشكەوتووی بەرزە، شیلەیەك دەخواتەوە خوێنەرەكانی عەرەب نازانن پێكهاتەكەی چییە!! گەر

هاتوو توانييان هەمان شيله بخۆنەوە لەنێو كەش و هەوای وێژەی عەرەبيدا كە تيايدا دەژين، ئەوا ئەو چێژەی لێنابينن.

<u>بەشی دووەميان</u> ، بريتيين لەئەوانەی كەفێرە زمانێكی ئەوروپايی نەبوون، ئەوانە هيچ نوسراوەيەكی فەرنسی و ئينگليزی و ئەڵمانی ناخوێننەوە، ئەوانەش جەماوەری گەورەی خوينەرن لەميسر و وڵاتانی عەرەبيدا، ئاستی ئەم جەماوەرەش بەداخەوە بەرز نييە، و توانای كڕينيان زۆر نييە، بۆيە ئەو نوسەرانەی كە خۆيان بۆ ئەوان تەرخانكردووە، ئەو خوێنەرانە هانيان نادەن.

داگيركەرانی جيهانی عەرەب، لەماوەی ئەم(٥٠-٦٠) ساڵەی دواييدا، جەماوەريان لەفێربوون بێبەش كردبوو يان تەگەرەيان لەپێش خوێندن و فێربوونياندا دانابوو، تاوای لێهات ئەو جەماوەرە خوێنەرەی كە حەزيان لەرۆشنبيری جيهانی دەكرد گچكە بوونەوە، ونوسراوەی زانستی و كۆمەڵايەتی پێشكەوتوويان لا نەكرابوو بە باو.

ئەگەر داگيركەر بەلاوە بنێين ، تەگەرەيەكی تر هەيە، ئەويش ئەو زۆررانبازييە ئاشكراييە لەنێوان رۆشنبيری هاوچەرخ و رۆشنبيری كۆنی عەرەبدا، بێگومان دامەزراندنی زانكۆی ميسرو زانكۆی ئەزهەر لە قاهيرەدا، هێمای ئەو زۆرانبازييە. لەو دوو زانكۆيە كە (٤٠) هەزار خوێندكاری تێدايە، دوای دەرچوونيان لە وڵاتدا بلاودەبنەوە و رای گشتيش لە ميسردا دەكەنە دوو بەش ، جا يان لەسياسەت يان كۆمەڵايەتی يان ئابووری يان لەئەفسانە و خەياڵدا، ئەو دووبەشە لە رۆشنبيرييدا تەريب نين،



ميللەتی ميسری لەبەرئەم جياوازييە، بە كەسيەتييەكی دووانی دەچێت.

ئەم دووبەرەكييە لەنێو نوسەرەكانماندا بە روونی ديارە. ئەوانە، يان روو لە عەرەب دەكەن، يان روو لە ئەوروپا دەكەن. جار هەيە دەمارگيری لای يەك لەو دوو لايەنە ئەوەندە بەهێز دەبێت، لەتۆ وابێت شەڕی ناوخۆيە، ئەمەش خراپەكاری زۆری هەيە، لەڕای گشتيشدا خراپەكارييەكەی زۆر زياتر دەبێت.

بەڵگەنەويستە كە ئێمە بۆ جيهان دەژين نەك تەنها بۆ عەرەب، و دەبێت لەسەر ئەم زەوييە پەيوەنديمان بەبيری گشتييەوە هەبێت، لەگەڵ هەموو مرۆڤێكدا بەتەواوی هاوبەندبين، وهاوبەنديمان لەگەڵ عەرەبدا بەشە، گەر هاتوو زانينی مێژووی عەرەب و رۆشنبيرييەكەی ئەرك بێت، ئەوا زانينی مێژووی جيهانی و رۆشنبيرييەكەی (١٠٠) جار ئەركێكی گرنگترە. ئێمە نابينە نەتەوەيەكی پێشكەوتووی هاوچەرخ گەر رۆشنبيريمان فراوان نەكەين، پێوانەی كۆمەڵ و ئابووريمان بەپێوانەی جيهانی نەكەين.

پاش ئەم پێشەكييە كورتە، بەو خوێنەرە دەڵێين كە دەيەوێت بيری خۆی بە نوسراوەی هاوچەرخ پێشبخات، دەبێت خۆی تاقيبكاتەوە بەوەی كە چەند سوودی وەرگرتووە لە خوێندنەوە و چەنديش پێشيخستوە...

بۆيە دەبێت بپرسێت و بڵێت:-

* ئايا ئەم نوسراوەيە رۆشنبيری و گيانی وكۆمەڵايەتی منی بەرەو كوێ ئاڕاستەكردووە؟

*ئایا ئەم نوسراوەیە راژەی پەرەسەندنی منی کرد؟

*ئایا من کەسێکی دیکەم و بەوکەسەی پێش خوێندنەوەی ئەم نوسراوەیە ناچم؟

*ئایا ئەم نوسەرە ، ئاراستەی جەماوەر دەکاتو رابەری دەکات؟ یان جەماوەر رابەری دەکەن و ئەویش رووبازییان بۆ دەکات بۆئەوەی نوسراوەکانی بکڕن؟

*ئایا بە جەماوەر رادەبوێرێت یان دەیەوێت سوود وەربگرن؟

*ئایا ئەم نوسەرە بیرکردنەوەی راستە و دەروونی نەخۆش نییە؟

*ئایا دەتوانێت هەموو جیهان ببینێت؟

*ئایا منداڵانە رەفتار دەکات وبیرکردنەوەکانی پوچ و بی کەڵکن؟

هەموو ئەم پرسیارانە، و لەمانەش زیاتر، دەبێت خوێنەر ناوبەناو لەخۆی بپرسێت،ئەم پرسیارانەش دەیگەێنێتە وێژدانێکی نوێ، ولەبەر پەروەردەکردنی خۆی هەست بەترس دەکات.

بۆ خوێنەر وا باشە دوای نوسەرێك بکەوێت کە خۆشی دەوێت، هەموو شتێکی بخوێنێتەوە و لێکۆڵینەوەشی لەبارەوە بکات، ئەم خوێنەرە کە وا دەکات سوود لە ژیانی نوسەرەکە وەردەگرێتو وا هەستدەکات کە ژیانی نوسەرەکەی بەسەربردووە نەك ژیانی خۆی، لەبەرئەوەی بەدوای پەرەسەندنی دەڕوات، هەر لەباوڕەوە تادەگاتە ڕا..یان لە هەڵچوونەوە تا



دەگاتە وێژدان، یان لەوێژدانی عەرەبی میسرەوە تادەگاتە وێژدانێکی جیهانی مرۆڤانە، خوێنەریش یەك لەو دانەرانە هەر دەدۆزێتەوە.

با ئەو نوسەرە بکاتە سەنتەری رۆشنبیرییەکەی .. با هەموو نوسراوەکانی بناسێت. با هەموو ژیانی بزانێت. لەبەرئەوەی ئەو ژیانەی کە دەژین چاکترین نوسینمانە. باشترین رێباز بە شوێنی بکەوین، رێبازی نوسینی نوسەرەکە نییە، بەڵکو رێبازی ژیانییەتی و ناشتوانین لێکیان بکەینەوە، گەر وێژە ژیانێکی خۆشی بۆ نوسەر نەرەخساندبێت، ئەوا نوسەریش ناتوانێت ژیانێکی خۆش بۆ خوێنەر بڕەخسێنێت...

نوسەرمان هەن، لەباوەشی پارتە سیاسییەکاندا پەروەردە بوون، لەسیاسەت و وێژە کاریان کردووە، لەسیاسەتیش وشەی ناشرین و نزم فێربوون، بەفێڵ و فەرەج فێرە خۆهەڵواسین بوون، وهەمووشی دەگوازنەوە نێو وێژە، ئەو نوسەرانە دەبێت پشتگوێ بخرێن، لەبەرئەوەی گڵاون، مەبەستیان پیسە، پوول پەیداکردن ئامانجیانە...ئەوانە راژەی داگیرکەر دەکەن ... پێنوسەکانیان پێدفرۆشن ...ئەوانە کەش وهەوای وێژەی میسر بۆگەن دەکەن بەوشەی ناشرین و جوێندان ، لەبەرئەوەی لەنێو ململانێی پارتایەتیدا فێربوون، و لە مەیدانی سیاسەتیشدا بەکاریان هێناوە.

( ٣١ )

## کێشەی رۆشنبیری لەمیسردا

لەبەندی پیشوودا،هەندێك بەلای ئەم بابەتەدا چووین ، بەڵام لێرەدا پێویستیمان بەوە هەیە، کە دەست لەهەموو لایەنەکانی وەردەین، بۆئەوەی بگەینە رێگاکانی وێژەی جیهانی. یان بە واتایەکی تر، بزانین ئەو هۆیانە چین وێژەی ئێمەی لە هەموو وێژەکانی جیهان دواخست، گومانی تێدا نییە کە ئێمە لەمێژووی نزیکماندا واتا پیش (٦٠) ساڵ لەمەوبەر داگیرکەر کێشەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری زۆری بۆ دروست کردووین. راپەرینی وێژەییش لەمە بێبەش نەبوو. دەستیان کرد بە نەهێشتنی فێربوون؟!...بەتایبەتیش فێربوونی ئافرەت ، سزای بیرکدنەوەیاندا بۆماوەی (٥٠) ساڵ رێگەی دامەزراندنی زانکۆیەکان نەدا، گەر یەکێك ویستبای گۆڤارێك یان رۆژنامەیەك دەربکات دەبوو بارمتە دابنێت، لەراستیدا بارمتە نەبوو بەڵکو سزا بوو.

بەمشێوازە، ئێمەیان دوورخستەوە لە بۆچوونە جیهانییە نوێیەکان، بۆیە هەموو بیرکردنەوەی ئێستامان بیرکردنەوەی سەدەی (١٩)و پێشتریشیەتی، نەك بیرکدنەوەی سەدەی بیست. جیهان گۆڕاوە، و هەست بەم گۆڕانکارییە ناکەین، لەبەرئەو



تەگەرانەی کە لەنێوان ئێمە و بیرکردنەوەی نوێدا هەیە.

لەوە گەڕێ، ئێمە ئێستا نازانین بیرکردنەوەی کۆنمان چۆن بووە!! نازانین سەرەتاکانی رۆشنبیری گشتی چین بۆدەست پێشکەرییەکی نوێ، ئێستا هیچ نوسراوەیەکی هاوچەرخمان بە زمانی عەرەبی لەسەر چین و هیند ومێژووی ئەڵمانیا و ئەمەریکای باشوور نییە، بەهۆی نەخوێندەوارییەوە کە میللەتی گرتۆتەوە، گەر نوسراوەیەکی بیردۆزی پەرەسەندن یان جولانەوەی هاوبەشییەتی ویان ململانێی هونەری نوێ و یان شیکردنەوەی دەروونی بکەینە زمانی عەرەبی، ئەوا مانای ورد و تەواومان ناداتێ، لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەو بابەتە رانەهاتووین، بۆیە ئێمە لەمیسردا لە بواری بیرکردنەوەی هاوچەرخدا نەزان و بێ هۆشین...

قاهیرە سەنتەری درەوشاوەی وێژەی عەرەبیە لەم کاتەدا، و سەنتەری بچووکی دیکەش لەبەغدا و بەیروت و دیمەشق هەیە، سەنتەرەکەی قاهیرە نوێکردنەوەی زیاترە. بەیروت چارەسەری کێشەکانی بەسەربەستی دەکات، وێنەی لەمیسردا نییە، جار بەجار لە بەغداش هەرئەو هایە، بەڵام دیمەشق تائێستاش خوێندنی مێژووی کۆنی عەرەب و دابەکانیان بەپێویست دەزانێت!؟...

بەیروت جیاوازە، لەبەرئەوەی(٨٠) ساڵە سەنتەری دوو زانکۆی فەرەنسی و ئەمەریکی بووە، جگە لە دەیەها خوێندنگەی مژدەبەران کە لەشار و دێهاتە بچوکەکانن. لەبەرئەوەی لوبنانییەکان نەیاری مژدەبەرەکان نەبوون، بەمەش

سـودیان لـەو خوێندنگەیانـە وەرگرتـوە، و پـیش ئێمـە فێـری چەندەها زانست بوون‌و چەندەها ساڵ بوو لە هەردوو زانگۆکەی بـەیروت، پزیشکمان بۆ سوپای میسری و فەرمانبەریشیان بـۆ سـودان دەهێنـا، بێگومـان ئەمـەش هـۆی خـۆی هەیـە، بـەڵام لوبنانییەکان سوودێکی زۆریان لـەو دوو زانکۆیـە و خوێندنگەی مژدەبەرانـە وەرگـرت، ودەتـوانین بڵـێن ، نەخوێنـدەواریی لـە لوبناندا(٣٠) ساڵە نەماوە، کەچی لەنێو ئێمەدا تا ئێستاش هـەر باوە؟!..

خوێندنگـەی مژدەبـەران(تبشـیری) سـەرەڕای ئـەوەی پێچـەوانەی بـاوەڕە، بـەڵام ڕاژەی ئـەو نەتەوەیـە دەکـات کـە فێرکردنـی ڕۆڵـەکانی لا ئەرکـە، ئەمـەش هۆیـەکی سـەرەکی ڕاپەڕینەکـەی چـینە، کەچـی هینـد سـوودی لەمـە وەرنـەگرت، لەبەرئـەوەی حوکمڕانـەکانی هینـد چـالاکی مژدەبـەرەکانیان قەدەغـەکرد، نەیاندەهێشـت لـە کـەناری دەریاکانیـان لـە (٥) میـل زیّتر بڕۆن، زۆر درێژەی ناوی، داگیرکەرەکانی ئینگلیز سڵیان لەم جۆرە خوێندنگەیانە دەکردەوە لەبەرئەوەی خـەڵکی فێردەکات، ئەوانیش نەزانینیان بۆ ژێردەستان دەویست.

ئەوەی حکومـەتی هینـد لەگـەل مژدەبەرەکانی کـرد، ئێمـەش لەمیسـردا ئـەوهامان کـرد، ئێمـە وەك میللـەت و حکومـەت ، و ئێمە گەر وەك لوبنانییەکان لێبوردنمان هەبوایە، ئێستا هەزارەها خوێندنگـەی پیشـکەوتوومان دەبـوو ئەوسـا وەك لوبنانییـەکان دەبووینـە میللـەتێکی فێربـوو. ئێمـە وەك حوکمڕانـانی هینـد ڕەفتارمان کرد،بۆیە ئێمە و هیندییەکان وەك یەکین!!..



سوریا بەپێچەوانەی لوبنانەوە. بیرکردنەوەی دواکەتووە، و لەبەرئـەم هۆیەیە،ئێمـە لەمیسـردا دەزانـین کـە چـینە ڕۆشـنبیرییەکەی نەتـەوە، ئـەو چـینەیە کـە منداڵـەکانیان لـە خوێندنگـەی مژدەبـەرانی فەرەنسـیدا فێرکردووە،بەداخـەوە ژمارەیان کەمە، بەڵام لەرێگای زمانی فەرەنسییەوە پەیوەندییان هەیـە بـە بیری گشـتییەوە، ئاگایـان لـە پەرەسـەندنی جیهانـە و نوسـراوەو ڕۆژنامـەی فەرەنسـی دەخوێننـەوە، و لاوەکـانی جوولەکـەو لوبنـان‌و ئیتاڵیـاو یۆنـان لەگـەل لاوەکـانی ئێمـەدا جیاوازن، لەبەرئەوەی لە خیوّندنگەی مژدەبەرە فەرنسییەکانیان خوێنـدووە، ئەوانـەش بێگومـان ، نوسـراوە بـە زمـانی عـەرەبی ناخوێننەوە، بەڵام ڕۆشنبیرییان هاوچەرخە و هـەموو ڕۆژێکیش پەنجـەیان دەخەنـە سـەر ترپـەی دڵـی جیهـان، و دەزانـن چـۆن دەگۆڕێت‌و پەرەدەسێنێت.

ئـەوەی لـەو خویندنگەیانـە لەدەسـتمان چـووە، زانکـۆ هاوچـەرخەکانی قـاهیرە و ئەسـکەندەرییە خـەریکن قـەرەبووی دەکەنـەوە، لێرەدا لێکۆڵینـەوەی بچووك و هاوچەرخ هـەن، بـەڵام گـەورە دەبـن، بڵاودەبنـەوە،و ڕۆشـنبیرییەکی نوێمـان دەبێـت، وامان لێدەکات بەبیرو دەروونمان لەسەدەی بیستەمدا بژیین .

مەبەستم بوو ئەوانە بۆ لاوەکانمان ڕوونبکەمەوە، بۆئەوەی بـزانن ئەو هۆکارە نهێنیانـە چین، کە بوونەتـە هـۆی دواخسـتنی ڕۆشنبیری هاوچەرخمان.

لەبـەر ئـەو هۆیانـە، ویـژەی عـەرەب ئیفلیجـە، و ناتوانیـت گیـانی میسـری پێشـبخات. ئـەو ژیانـەی لای ئێمـە هـیچ نییـە و

ئاواتمانە پێشبکەوێت، ئێمە ئێستا رووبەرووی کێشەین، و هیواداریین ئەو کێشانە چارەسەربکرێن،و چارەسەرکردنی بە خوێندنگەو زانکۆو نوسراوە دەکرێن، با جەماوەرێکی زیندووی هاوچەرخ پەروەردە بکەین بۆئەوەی لەگەڵ دانەرو نوسەری هاوچەرخ کارلەیەك بکەن.

( ٣٢ )

## شارستانییەتی کۆنی میسر

سێ هۆ هەن وامان لێدەکەن مێژووی کۆنی میسر بخوێنینەوە:

١- مێژووی میسر، و ئێمەش میسرین، لەنێو ئەو باوەڕ و نەریتانە دەژین کە زۆربەی دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگاری فرعەونییەکان، لەوانەیە بڵێین هەموو ئەو باوەڕانە ئەفسانەن، ئەفسانەش بەهای خۆی هەیە لەپەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا، زۆر وشەی فرعەونی هەیە تائێستا لە ژینگەی خێزانی و لادێکاندا هەر زیندووە. دەبێت نەژادەی رۆشنبیری میسری بزانیت.

٢- لێکۆڵینەوی مێژووی فرعەونی هۆی دووەمە، لەراستیدا تەنها مێژووی میسری نییە، بەڵکو مێژووی یەکەم شارستانییەتە لەجیهاندا. بەلێکۆڵینەوەی، تێدەگەین ئەو هۆیانە چین مرۆڤیان پاڵناوە بۆ رۆشنبیرییەکی کشتوکاڵی، و چۆن ئاین



و میری و یاسا و رەوشت دامەزران... ئینگلیزێك یان بەرازیلییەك یان چینییەك بۆی نییە خۆی بە رۆشنبیر دابنێت گەر لە مێژووی میسری کۆنی نەکۆڵێبێتەوە، لەبەرئەوەی بۆ یەکەمجار لە جیهاندا ، لەمیسردا مرۆڤ خۆی لە مەترسی سروشت و دارستان گواستەوە بۆ کشتوکاڵ و شارستانییەتی. لەمیسرەوە زانیاری و باوەڕ بڵاوبووە و دنیای گرت و یەکەم شارستانییەتی لە نێو(٥) کیشوەردا دامەزراند.

چیرۆکە کۆنە ئەفسانییەکانی رۆژگاری فرعەونییەکان گواسترایەوە زۆربەی وڵاتان. شێوازی گۆڕا، بەڵام رەسەنایەتی میسری هەر تێدا مایەوە، وشەی(ابن الانسان)ی نێو ئینجیل، لە دوانزەمین دەوڵەتی میسریدا هەرهەبووە، نوێژەکانی(أخناتون)بە پیتەکانیشیەوە لەتۆراتدا هەیە، لەدورگەکانی ئەوپەڕی رۆژهەڵات و ئەمەیکاردا بەهەمان شێوازی میسری مردوو لاشەخۆش دەکەن، زۆربەی باوەڕەکانی فرعەونییەکان ئێستاش لەنێو ئاینەکاندا زیندوون، (هندل هاریس)وا دەزانێت کە زۆربەی ناوی شارەکانی ئینگلتەرا ناوی میسری کۆنن، پاش ئەمە سەرسوڕهێنەر نییە لای خوێنەر کە بزانێت هەرچوار ناوە عەرەبییەکەی (القمح) ناوی میسری فرعەونین، بۆیە دەیەها گۆڤاری ئەوروپایی لێکۆڵینەوەی لەسەر چەرخەکانی فرعەونییەکان کردوو، و لاوی رۆشنبیریش ئەمە پیشتگۆی ناخات.

٣- میسر گەورەترین مۆزەخانەی شوێنەواری کۆنە لە جیهاندا، ودەبێت لێکۆڵینەوە لەبارەی فرعەونییەکانەوە بکەین،

ئێمە مۆزەخانەیەکمان هەیە لە جیهاندا نییە. خراپترین شوێنەواری، ئەنتیکەترین پارچەیە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. سەدەها شوێنەواری جۆراوجۆر لەشاری (الصعید)و شارەکانی سەربەدەریا هەن، زۆر سادە وساویلکەن و تایبەتە بە مرۆڤی پێش کشتوکاڵ.

دواتر، شوێنەواری یەکەم شارستانییەتی هەیە کە چۆن مرۆڤ دەستیکردووە بە قسەکردن وەك وشەکانی (حکومەت، ئاین، خێزان)و هتد... زۆربەی رۆڵەی نەتەوەی تر ، گەر سەردانی میسر نەکەن و دیقەتی شوێنەوارەکانی نەدەن، هەست بە کەمی رۆشبیرییان دەکەن، هەموو میسرییەکی بە توانا سەردانی ئەو شوێنەوارانە دەبێت بە حەج بزانێت، لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات، و پشکنینی نەژادی بکات، بەمەش لە بنەماکانی ئاین و رەوشت و سایکۆلۆجی دەکۆڵێتەوە.

گەر شارەزای زمانێکی بیانی بێت، ئەوا سەدەها نوسراوەی کورت و درێژو تایبەت و گشتی هەن لەسەر مێژووی فرعەونییەکان، گۆڤاری تایبەت لەسەر ئەو مێژووە هەیە، دانەرە بیانیەکان ئەمانەن(برسند، بروجس، بتری، ئەلیۆت شمس، بیری ، ماسبیرو).. جگە لە میژوونوسە کۆنەکانی وەك(هیرۆدۆتس و بلوتارك).

بەزمانی عەرەبیش نوسراوەکانی (سلیم حسن)و(انطون ذکری)و(عبدالقادر حمزە)و(سەلامە موسی) هەن بۆ خوێندنەوەیان لەسەرئەم بابەتە.

برایانی عەرەب لەعیراق و سوریا و فەلەستین و لبنان و



تونس وهتد.. ئاگادار دەکەین کە لاوی میسری، فرعەونییەکان دەخوێنێت مانای ئەوە نییە کە لایەنگری ئەو رۆشنبیرییە دەگرێت و رۆشنبیری عەرەبیش بەلاوە دەنێت، لەدەمارگیری بۆ مێژووی کۆن ترۆتر نییە، مێژووی فرعەونییەکان دەخوێنینەوە لەبەرئەوەی باپیرمانن، بەم لێکۆڵینەوەیەش نەژادی شارستانییەتیمان بەگشتی بۆ دەردەکەوێت و، دەبێت لە عیراقیشدا مێژووی بابلییەکان و سومەرییەکان و کلدانیەکان بخوێنن، لەبەر ئەوەی لە ولاتیان بوون، هەروەها فەلەستینیەکان و لوبنانییەکان و سورییەکان دەبێت مێژووی خۆیان بخوێننەوە، ئەمەش بانگەشەی دووبەرەکی و قین لە راپەڕینی رۆشنبیری عەرەب نییە.

پێشتر بەهای مەزنی لێکۆڵینەوەی رۆشنبیری کۆنی عەرەبمان روونکردەوە دەبێت ئەوهاش بایەخ بدەینە لێکۆڵینەوەی رۆشنبیری فرعەونییەکان.

( ٣٣ )

## زمانی بیانی

گەورە نوسەرێکی ئەڵمانیا وتویەتی، ئەوەی تەنها هەرزمانی خۆی بزانێت زمانی خۆشی نازانێت، لەبەرئەوەی بەراورد نەکات، ناگاتە راستیەکانی زمانەکەی، و بەم بەراوردیەش پێشدەکەوێت، و هەست بەکەمو کوڕی زمانەکەی دەکات، لەنێو هەموو زمانێکی پێشکەوتوودا جوانی و ناشرینی هەیە، ئێمە کە ئینگلیزی یان فەرەنسی یان ئەڵمانی دەخوێنینەوە، ماناو رووناکی و تاریکی دێتە پێشمان کە لەزمانی عەرەبیدا هەستی پێناکەین، ئەمە وامان لێدەکات قوولتر لە زمانەکەماندا بڕوانین، و هەستیش بەمانا شاراوەکانی بکەین.

بەهۆی زمانی بیانییەوە دەگەینە دەیەها زانست و هونەر، ناڵێم زمانی عەرەبی چاکی چارەسەرنەکردووە، بەڵام هیچ نەبێت تائێستا ناوەکانیان نەکراونەتە عەرەبی، لەبەرئەوەی زمانی ئەوروپایی لە راپەڕینە گەورەکەیدا پێش زمانمان کەوتووە و بەرزبۆتەوە. هێندەی بەرزبوونەوەی ئەو نەتەوانەی کە قسەی پێدەکەن.

لەم (٥) سەدەی دواییدا، کە تورك دەیشێلاین و مەمالیکیش دەیچەوساندینەوە ئەوروپاییەکان خۆیان بۆ شارستانییەتێکی



مرۆڤانەی جیهانی ئامادە دەکرد، و چارەسەری زمانەکەیان کرد، وایان لێکرد مانای ورد بدات، بەمەش بیرمەندەکانیان داهێنانیان زێتر بوو بەو وشە نوێیانەی کە هاتنەکایەوە ، و پێشکەوتن.

لەبواری هەوەسی ویژەییدا، زمانی عەرەبی لەگەڵ زمانی ئەوروپایی هاوچەرخ جیاوازی هەیە، زمانی ئێمە وەرگرتن و لاسایی‌کردنەوەیە، زۆرجار وەرگرتن شوێنی بیرکردنەوە دەگرێتەوە، کەچی نوسەرە ئەوروپاییەکان لە دانانی مانادا داهێنەرن و زیندوویەتی و چالاکی دەدەنی کە زمانەکەی ئێمە نایگاتێ لەم کاتەدا، وا دەزانم هۆی ئەم سیستییەش کە زۆربەی نوسەرەکانمان لاسایی و وەرگرتن دەخەنە شوێنی داهێنان‌و بیرکردنەوە، دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ، ئێمە لە نزیکەی (١٠٠) زانست و هونەر بێ بەشێن. ئەم بێبەشییە وشکایەتی خستۆتە نێو مانای داهێنراو...نوسەرەکانمان هەر بەمانا کۆنەکان دەیاننوسن، وشە کۆنە نەخشێنراوەکان کاوێژ دەکەنەوە، وا دەزانن ئەمەیە داهێنان و بیرکردنەوە!!

مرۆڤی میسری گەر دەیەوێت لەم چەرخەدا بیری رووناك بێت، دەبێت زمانێکی بیانی زیندوو بزانێت، وەك زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی‌و فەرەنسی و روسی ، و گەر یەك لەو زمانانە نەزانێت بە رۆشنبیرێکی هاوچەرخ دانادرێت، و لەوانەیە هەر ئەوها بمێنیتەوە تاکو هەوەسی نەتەوە دەگۆڕێت، وەك گۆڕانی هەوەسی نەتەوەی چین‌و هیندییەکان.. دواتر بەرەو شارستانییەتێکی هاوچەرخ دەڕۆین و بەدەروونمان تیایدا دەژین.

ئەوەندە قورس نییە لاوێکی میسری خۆی فێرە زمانێکی بیانی بکات ... گەرهاتوو هەموو رۆژێك یەك سات خۆی خەریکی خوێندنەوەی رۆژنامەیەکی ئینگلیزی یان فەرنسی بکات کە لە قاهیرە دەردەچن، لەگەڵ خوێندنەوەی نوسراوەیەك لەوێژەی بەرزی فەرەنسی. ساڵێك تێپەڕ ناکات گاڤی زۆری بڕیوە، و گەویشتۆتە قۆناغێکی چاك لەو زمانەدا. بێگومان پێش ئەمە پێویستی بە وانەی سەرەتایی مامۆستایەکی چاکە بۆ ماوەی(١-٢) مانگ بۆئەوەی تەگەرەکانی لە پێش نەهێڵێت.

دەتوانین لێکۆڵینەوەی زمانی بیانی بکەین و خۆمان دوور بخەینەوە لە رێزمانەکەی وەك زمانی ئینگلیزی، و لەزمانی دیکەش تۆزێك خۆمان لەرێزمانەکەی نزیك دەکەینەوە، رستە بکەینە یەکەی فێربوون و تێگەیشتنمان نەك وشە، ئێمە کە خۆمان لەرێزمان دوور دەخەینەوە، لەبەرئەوەیە کە نامانەوێت لەو زمانەدا ببینە نوسەر، ئێمە دەمانەوێت هەر خوێنەر بین، و زمانی ئینگلزیش ئاسانە، نێرو مێی تیدا نییە و نیشانەی نێرینە و مێینە نایگرێتەوە، ئەم خەسلەتە وای لێدەکات رۆژێك بێت وببێتە زمانێکی جیهانی... بیرمەندەکانی ئینگلیز وەك(ئۆجدن) دەڵێت:- لە زمانی ئینگلیزیدا ، زۆر وشەی زیاد هەن لە رستەدا دەتوانیت نەیاننوسیت.

کە بەراورد دەکەین لە نێوان دەرچووانی خوێندنگەی فەرەنسی و دەرچوانی خوێندنگەی میری کە زمانی ئینگلیزییان فێردەکەن، دەبینین ئەوانەی یەکەم دەتوانن نوسراوەی فەرەنسی بخوێننەوە، کەچی ئەمانەی دووەم ناتوانن نوسراوەیەکی



ئینگلیزی بخوێننەوە!!.

سەرکەوتنی زمانی فەرەنسی لە خوێندنگە فەرەنسیەکاندا لەسەر حسێبی زمانی عەرەبی بووە کە لەوێ پشتگۆێ خرابوو.. بەڕای من دەکرێت بەرنامەیەکی خوێندن بۆ خوێندنگە دواناوەندییەکان دابنێن بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی و بیانی. و زۆر بەباشیش، بەوەی واز لەچەند وانەیەکی نەزۆکی وەك جەبرو زمانی بیانی سەربار بهێنین، بۆ ئەوەی کاتی چاکمان هەبێت بۆ لێکۆڵینەوەی زمانمان ویەك زمانی بیانی تر. و دەبێت خوێندنگە دواناوەندییەکان رۆشنبیر دەرچوێنن نەك خوێندەوار.

جیاوازی نێوان خوێندەوارو رۆشنبیر ئەوەیە: خوێندەوار چەند بابەتێك دەزانێت کە تاقیکردنەوەی تێدا کردووە، فێربوونەکەی فرمانی رابردووە؟! بەڵام رۆشنبیر حەز لە فێربوون دەکات، رۆشنبیرییەکەی ئارەزوویەکی زیندووە، و لە ئایندەشدا لەگەڵی دەژیت، ئێمە کە خوێندکار لە خوێندنگەی ناوەندی و دواناوەندی فێردەکەین، بۆئەوەیە دەرگای ئەم زمانانەی لە وێژە و هونەر و زانست بۆ بکەینەوە، و ئامادەی دەکەین بۆ رۆشنبیرییەك تا وای لێبکات، تا ماوە لەژیاندا نوسراوە و گۆڤار و رۆژنامە بکرێت، و بەو زمانە بیخوێنێتەوە، ئێمە هەر فێرمان نەکردووە، بەڵکو پلان و بەرنامەمان داوەتی، بەڵام کە جەبری فێر دەکەین، لەپاش دەرچوونی گەر نەچێتە زانکۆ چیدی سوودی لێوەرناگرێت.

دەبێت بایەخێکی زۆر بدەینە خوێندنگەی دواناوەندی ،

لەبەرئەوەی خوێندنی سەرەتایی بەشی خۆرۆشنبیرکردن ناکات، و چـوونە زانکـۆش تـەنها بـۆ منـداڵی دەوڵەمەندەکانـە ... مەبەستیشـمان ئـەوە نییـە کـە دەرچـووی سـەرەتایی مـافی خۆرۆشـنبیرکردنی نییـە، باوەڕیشـمان وایـە ، لاو گـەر دەرچووی سـەرەتاییش نـەبێت دەتوانێـت خـۆی رۆشـنبیر بکـات بەمـەرجێك چالاکی و ویستی هەبێت.

خوێندنگەی دواناوەندی دەرگا بۆ لاو دەکاتـەوە و مەیدانی جۆراوجـۆری پێشـاندەدات، وزیرەکیەکـەی دەجوڵێنێـت ، بۆیـە دەبێـت لـەو قۆناغـەی خوێندنـدا کـراوە بێـت، وتێبگـەیێنین کـە مەبەست و ئامانجمان ئەوەیە خوێنـدکار خـۆی رابهێنێـت لەسـەر پەروەردەکردنی خۆی.

زانینـی زمـانێکی بیـانی بەباشـی و حـەز لێکردنـی بـۆ خوێنـدکار، زۆر باشـترە لـە فێربـوونی دوو زمـان کـە بـەخێرایی لەبیری دەچێتەوە، لەبەرئـەوەی عاشـقی وێژەکـەی نابێـت، ئـەوەی لـەبیری دەمێنێتـەوە تـەنها عەزیـەتی خوێنـدن و دەرخسـتنی وشەیە.

گـەر ویسـتمان زمـانێکی بیـانی بـۆ خوێنـەر هەڵبـژێرین، کەزمانەکـە ببێتـە کلیلێـك و دەرگـای خۆرۆشـنبیرکردن و پێگەیشتنی لێکۆڵینەوەی بۆ بکاتەوە، ئـەوا زمـانی ئینگلیـزی بۆ پێشـنیاز دەکـەین، لەبـەر ئـەوەی ئاسـانە و نوسـراوەی زۆری لێ چاپ دەکرێت کە رۆژی لـە (۲۰۰) نوسـراوە کـەمتر نییـە، زمـانی (۲۵۰) ملیـۆن مرۆڤـی پێشـکەوتووە لـە ئـەمریکا و ئـەوروپا و ئوسـتورالیادا، ئـەوروپایی پیشـکەوتوو ناتوانێـت واز لـە زمـانی



ئینگلیزی بهێنێت، وئایندەی ئەو زمانەش زۆر مـەزنتر دەبێت لـە ئێستای .

ئـەو لاوە میسـرییەی زمـانێکی بیـانی نـەزانێت و هـەموو لاویەتی خۆی تەرخانکردبێت تەنها بۆ نوسراوەی عـەرەبی .. کە فێـرە زمـانێکی بیـانی دەبێـت و ئاگـاداری وێـژەی ئـەوە زمانـە دەبێـت، و لـەناو کێشـە رۆشـنبیرییەکانی دەژیـت، هەسـت بـە پەرەسـەندنێکی بـاش دەکـات،و بگـرە هەسـت بـەرووداني کۆدەتایـەکی مـەزن لەژیانیـدا دەکـات،و لـە روانگـەی لادێکـی سنووردار دەردەچێت، و دەگاتە ئاسۆیەکی فراوانتر و دوورتر.

خوێنـدکاری زمـانێکی بیـانی پێویسـتی بـە فەرهـەنگێکی (بیـانی– عـەرەبی)و(عـەرەبی –بیـانی)یـە، بەداخـەوە هـەموو ئـەو فەرهەنگانـەی کـە بەکاردێن زۆر وورد نین،و لەمیسـردا فەرهـەنگ هەیە بە (۳)جنیە، ئەوەندەی وشـە تێدانییـە، بەقـەد فەرهـەنگێکی ئینگلیزی یان فەرەنسی نابێت کە بە(٥–١٠) قرش دەفرۆشرێت.

وەزارەتی پەروەردە گەر فەرهەنگی فراوانی راستی دەرکات و بەهەزران بیداتە خوێنەران ،ئەوا ئیشێکی زۆرباش دەکات.

( ٣٤ )

## ویژەی جیهانی

ویــژە لێکدانــەوەی ئەندیشــەی ژیانــە، وەك فەلســەفە وایــە، هەموو خوێنەرێك هەوەسی تایبەتی خۆی بەڕێوەی دەبات نەك ڕای کەسانی تر، و دەبێت لێکۆڵینەوەی ویـژە کۆن و نوێیەکان بکـەین، بۆئـەوەی ئاگـاداری بـین و تێبیگـەین و دواتـریش ڕای تایبــەتمان دەربــارەی ویــژە بڵــێین، لەوانەیــە وشــەی (چــێژ) سەرکەوتووتر بێت لـە وشـەی(ڕا)... لەبەرئـەوەی ئێمـە چـێژ لـە ویـژە و مۆسـیقا و فەلسـەفە دەبیـنین زێـتر لـەوەی ڕای لەسـەر بڵێین، ئەم چێژەش لەباوك و دایکەوە بۆمان نەماوەتەوە... بەڵکو بە لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوەی ژیانمان بووە، بەویـژەو فەلسەفە و ئاین ، دانایی فێردەبین و ژیانی پێدەبەینە سەر ، هەر یەك لەو سێیانە پێویستییان بەیەك هەیە، لە کامەیان بە قووڵی بکۆڵینەوە وامان لێدەکات لەوانی تریش بەووردی بکۆڵینەوە،و لە کۆتاییدا بــەو لێکۆڵینەوانــە دەبینــە خــاوەنی پــەیامێکی مرۆڤانــەو وێژدانێکی جیهانی. ئەمـەش تێکەڵەیەکی ماندووبوون و چێژە، کـە خۆشەویسـتی پێکـدەهێنن، وەك خۆشەویسـتی دایـك بـۆ منداڵـەکانی... ئەوساکە بایـەخ بـە هـەموو جیهـان دەدەین،وگـوێ بەپەرەســەندن و پێشــکەوتنی دەدەیــن، وچــێژ لــەو ئــازارەش



وەردەگرین کەلەپێناویدا چەشتوومانە.

پێشــتر چــەندین بەنــدمان لەســەر پێویســتی لێکۆڵینــەوەی ویــژەی عــەرەب نوســی، ئێمــەش نابینــە خــاوەن پەروەردەیــەکی ڕاستەقینە گەر هەر لەو ویژەیە بکۆڵینەوە. بۆیە دەبێت لە ویژەی جیهــانی بکۆڵینــەوە،و باشــترین نوســینەکانی (٥٠) ســەدەی ڕابردوو بخوێنینەوە، هەر لەنوێژەکانی (ئەخناتون)ەوە تا دەگاتە چیرۆکەکانی (دستوفسکی)ڕوسی.

لە جیهاندا ،سەدە پاش سەدە، نوسین هـەن جێگـای خۆیـان کردۆتـەوە، وبـەزەقیش بـەهایان دیـارە. پێویسـت ناکـات باسـیان لێوەبکــەین و بیانــژمێرین، بۆخوێنــەر ئاســانە (تولســتۆی، دستۆفسـکیو مەکسـیم گـورگیو گوتیـە وشـیللەری ئـەڵمانی و بیرۆن و برنادشۆی ئینگلیز و ڤۆڵیتر و ڕۆسۆ و ئەناتوڵ فرانسی فەرەنسی) بناسێت.

بــەزمانی ئــەڵمانی و ئینگلیــزی و فەرنســیش هــەموو نوسـراوەکانی ئـەم دانەرانـە هـەن، زۆر بـەوردی وەرگێـڕدراون،و تائێستاش بە زمانی عەرەبی بەوردی وەرنەگێڕدراوون!؟..

خوێندنـەوەی ئـەو ویژانـە، لـە خۆپەرسـتی دەرمـان دەکـاتو دەمانگەێنێتـە ئاسـۆکانی جیهـان، توانـای خۆشەویسـتیمان بـۆ مـرۆڤ زۆر دەکـات و هـیچ شـتێکیش نییـە هێنـدەی ویـژە لـەئاین نزیك بێت، مەبەستیشمان ویژەی بەرزە.

مـەقاماتی (الحریری) بە جۆرێك لە ویـژە دادەنـدرێت، بـەڵام هەستی ئاینی لەدەروونماندا ناوروژێنێت..ویـژدانمان پـەروەردە ناکات، لەبەرئەوەی ڕابواردنێکی سووکی بێ نرخە!!

کەچی چیرۆکی (الاخوە کارامازووف) ی نوسەری روسی (دۆستۆفسکی) گیانی ئاینیمان تێدا دەچێنێت، و فێرە پیاوەتیمان دەکات، بۆ چاکسازی و پیرۆزیمان رادەکێشێت. لەبیرمە، پێش (٢٠)ساڵ کە خوێندمەوە، و تاریکم لە گۆڤارێك نوسی و وتم: ((دەبێت ئەم چیرۆکە بخرێتە سەر نوسراوە پیرۆزەکان)) و لەجیهاندا نوسراوە نییە وای پێداهەڵدرابێت؟

گەورە نوسەرە کۆن و نوێیەکانی جیهان، بەو گیانە ئاینیە نوسراوە وێژەییەکانیان داناوە، لەبەرئەو هۆیە ، ژیانی هەریەك لەئەوانە ژیانی تێکۆشانی ئاینی بووە..

*گۆتە... ئاراستەی پەروەردەی کەسییەتی و پەرەسەندنی دەروونی دەکرد.

* برنادشۆ... هەموو ژیانی خۆی تەرخانکردبوو بۆ ئەوەی جیهان لە تەنیایی بگوازێتەوە بۆ هاوبەشییەتی.

*وولز... هەموو هونەرەکەی بەخشی بۆئەوەی بگەینە حکومەتێکی جیهانی ، فێربوون و ئاشتی و خۆشگوزەرانی گشتاندن بکات.

* ڤۆلتێر... بۆ نەمانی زۆرداری و پادشا و کەنیسەکان تێیدەکۆشی...

وێژە بەچەندین پێوەر پێوانە دەکرێت، یەك لەو پێوەرانە باری ئاینی نوسەرو نوسینەکانییەتی. واتا ژیانی نوسەر بابەتی نوسینەکانی. ئەو نوسەرەی هانمان نەدات بۆ چاکسازی و پیرۆزی، راستە چێژ لە هونەر و داهێنانی و زیرەکی و بلیمەتیەکەی وەردەگرین، بەڵام بە کەمی دەمێنێتەوە گەر



بەرزمان نەکاتەوە بۆ ئاستی ژیانێکی ئاینی... هەست بە سیستمی زۆردار ناکەین و شۆڕشی دژ ناکەین ... یان نامان گوازێتەوە لە روانگەی لادێیانە بۆ روانگەی جیهانی فراوان، وبەرزمان ناکاتەوە لەبەسووك سەیرکردنی ژیان بۆ راستگرتنی ژیان و راژەکردنی...

دەتوانین نوسراوە پیرۆزەکان وەك نوسراوەی وێژەیی بخوێنینەوە، و لەراستیشدا وێژە وئاین گەر بەرزبوونەوە، یەك دەگرن، تا دەگەنە رادەیەك جیاوازییان لەنێواندا نابینین..

چیرۆکی (نشید الانشاء)ی نێو تەورات بە دەقێکی وێژەیی نایاب دادەندرێت، تێماندەگەیەنێت کە خۆشەویستی ساویلکەیی پاك، بەمەرجێك بۆ دەوڵەمەندی وپایە بەکارنەهێندرێت، زۆر پیرۆزە، ئەم چیرۆکە دەکرێت بخرێتە سەر چیرۆکی (پۆل و فرجینی) ی(سان بیر). یان نوسینەکانی ( جان جاك رۆسۆ)، وتێکۆشانی (وڵز) بۆ یەکخستنی جیهان لەو چەرخەدا و لە ناوەڕۆکیدا تێکۆشانێکی ئاینیە.

جا با(وڵز) هەر خوانەناس بێت، کەواش بوو(بوزا)ش خوانەناس بوو ئێستاش (٥٠٠) ملیۆن مرۆڤ باوەڕیان پێیەتی.

زۆر نوسەری تر هەن بۆئەو خوێنەرانەی کە زمانی بیانی دەزانن، بە نوسینەکانیان پێدەگەن، و کەسییەتی خۆیان پەروەردەدەکەن و بەرزی دەکەنەوە.

لێرەدا، خوێنەر پێویستی بە ئامۆژگارییەك هەیە کە چەند بارە کراوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە دەبێت زۆر بەقوڵی لێکۆڵینەوەی یەك نوسەر بکات، لەوانەیە (تۆلستۆی)یان

(برنادشۆ) یان( گۆتە) یان (ڤۆڵتێر) بێت. بێگومان  یەك لەئەمانە هەڵدەبژێرێت، لەبەرئەوەی یەکێکیانی لەوانەی تر زیاتر دەوێت، و دەبێت بە فراوانی لێکۆڵینەوەی ژیان و نوسینەکانی ئەو نوسەرە بکات، ئەوەندە بە قوولی بێت، وا بزانێت کە لە چەرخی ئەودا دەژیت، و هەست بە کێشە هونەری و ئاینی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکەی بکات، وئەم کێشانەش بێگومان هەر دوو بارە دەبنەوە، بەڵام ئەندێشەی نوسەرێکی مەزن چاومان زیاتر دەکاتەوە، و باشتر تیماندەگەیێنێت.

بۆیە دەبێت بەشداری گۆڤارە گەورەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا بکەیت، تاکو بەگشتی ئاگات لەشنەی شەماڵی ویژەبێت، لەبەرئەوەی ئەم گۆڤارانە زۆر بایەخ بە زۆرانبازی و ناکۆکی ویژەیی دەدەن، هەڵسەنگاندنشیان دادەوەرانەیە...

( ٣٥ )

## لێکۆڵینەوی زانستەکان

مەزنترین مەبەستی خۆڕۆشنبیرکردن ئەوەیە، لەوچەرخە بگەین کەتیایدا دەژین، و لیکۆلێنەوەی ئەم چەرخەمان دەبێت یەکەمین لێکۆڵینەوە بێت و پێش چەرخەکانی تر بێتو شارستانییەتی ئێستاشمان دەبێت ببێتە پێوەر بۆ شارستانییەتیەکانی چەرخە کۆنەکان.



شارستانییەتی هاوچەرخ، واتا شارستانییەتی سەدەی(٢٠) کە رێكوپێکی وچەواشەشی تێدایە، بەو کێشانەی کەچارەسەراکراون، و ئەوکێشانەی کە جاری چارەسەرنەکراون، و ئەم شارستانییەتیە لەزۆر رووەوە لە زانستەوە هاتووە...

ئەی باشە زانست چییە؟

گۆڤاری (نتیشەر)کە پسپۆڕە لە بڵاوکردنەوەی زاستەکان، ئەم وشەیەی پێ پەسەند نییە،و دەڵێت :- زۆر بابەت هەن بۆ لێکۆڵینەوە، وەك زانستی بایەلۆجی و سایکۆلۆجی ، هیچ زانستێك نییە، رەها بێت، لەبەرئەوەی کە دەڵێین زانستی (بایەلۆجی) مەبەستمان رێکخستنی زانیارییە تایبەتەکانی ژیانە بە ووردی و بایەخ دانە بەراستیەکان،و پشتگوێ خستنی هەڵەکانە.

زانستی بایەلۆجی لەسەردەمی ئەغریقییەکاندا دەخوێندرا، و بگرە پێش ئەوانیش، بەڵام زانست نەبوو بەڵکو تەنها زانیاری کۆکراوە بوو. راست و هەڵەی تێکەڵکرابوون، پێوەری ووردییان نەبوو. کە ئەم زانیارییانە پێشکەوتن و بە ووردی و بایەخەوە رێکخران ئەوجا بوون بە زانستی (بایەلۆجی).

گومانی تێدا نییە کە زانستەکانی ئێستا و زانستی نوێ لە ئایندەدا ، جیهان دەگۆڕن، نەك هەر لەرووی بەرهەم و دابەشکردنەوە، بەڵکو لەرووی رەوشتو کۆمەڵایەتی و ئاینیشەوە ، لەبەرئەوەی هەر هەموویان پابەندن بە رێبازی بەرهەمهێنان و دابەشکردنەوە.

کێشەی بێکاری و داگیرکردن و حوکمڕانی نابەجێ و

داگیرکردنی بازاڕ و جەنگ، کە نیگەرانی کردووین،ئەمانە هەر هەموویان بەری بەرهەمی مەزنن، کە بەهۆی ئامێرە گەورەکانەوە بووە، واتا بەری جیهانی میکانیکی بووە لەگەڵ دابەشکردنێکی کەم کە تا ئێستاش زانستانە نییە.

هەموو ئەوانەی رۆشنبیرییان ئاواتە، لەبەرئەم هۆیانە، دەبێت لێکۆڵینەوەی رێبازی زانستی بکەن، بۆئەوەی چاویان بکرێتەوە، و لەکێشە جیهانییە هەنووکەییەکان تێبگەن،و لەنەزانینی سیاسەتمەدار و سەرکردەکان بی ئاوات نەبن.

**ئەی چۆن لە زانست بکۆڵینەوە؟؟**

وەڵاممان ئەوەیە کە دەبێت بکۆڵینەوە لەو زانستانە کە پەیوەندییان بەم چەرخەمانەوە هەیە، و کێشەشیان بۆ دروستکردووین، چەند پەیوەندییەکە بەتینتر بێت، ئەوەندە لێکۆڵینەوەکە سەختتر دەبێت، مەبەستی لێکۆڵینەوە تێگەیشتنە،و لە چەرخەکەمان ناگەین گەر نەزانین چین ئەو رەگانەی کێشەکانی بۆ چاندووین وکەی ئەو رەگانەمان ناسی بەئاسانی دەگەینە چارەسەرکردنیان.

گەورەترین کێشەی ئەم چەرخە ،بێکارییە، لەبەرزۆری بەرهەم هێنان. و دەبێت بزانین هۆی ئەم زۆرییە چییە... بێگومان ، داهێنانە میکانێکی و کیمیاوییەکانی ئەم(١٥٠) ساڵەی دواییە.

ئەو میسرییەی راهاتووە گوێ لەوە رابگرێت کە (لۆکە) بناغەی دەوڵەمەندی میسرە، دەبێت بای ئەوەندە لە کیمیا بزانێت، تا لە بەهای کووتاڵی کیمیاوی تێبگات کە چۆن(لۆکە)



وەدەردەنێت و کشتوکاڵی (لۆکە)ش نامێنێت، جیهان ئێستاکە زۆر گۆڕاوە بەرەو کۆتەدا دەچێت، بەهۆی دوو زانستەوە، میکانیك وکیمیا... و ئەوەی حەزی لە خۆڕۆشنبیرکردنە لەم دوو بابەتە ،با زۆر بەشوێنی بکەوێت و بزانێت چۆن پەرەی سەندووە، کە دەکرێت پێی بڵێین پەرەسەندنی شارستانییەتیە.

کێشەیەکی تر هەیە، ئەویش نەژادی مرۆڤایەتی و پێ باشبوونە، و چۆن زاوزێ سنوردار دەکەیت، و پێشی دەخەیت، (هتلەر)ئەم بابەتەی زۆر بۆ باسکردووین. بۆیە پێویستیمان بە زانستی (ئەنثرۆپۆلۆجی)و(یۆجینی)یە.

زانستی (یۆجینی) بۆ میسر زۆر پێویستە،بۆئەوەی یاسای پەیوەندار دەرکرێت بۆ قەدەغەکردنی زاوزێی نالێوەشاو بۆ باوکایەتی و دایکایەتی چاك.

زانست هەن بیر و دەروون و لەش و گیانی مرۆڤ پێشدەخەن ، زانستی بایەلۆجی بۆ هەموو رۆشنبیرێك پێویستە، لەبەرئەوەی ئاسۆی گیانی فراوان دەکات و پەیوەندی لەگەڵ ئاژەڵدا دروست دەکات و لەو هۆیانەی کە کاریگەربوون و تائێستاش هەر کاریگەرن، لەپێشخستنی مرۆڤایەتی تێدەگات.

زانستی سایکۆلۆجی هەیە و وامان لێدەکات لە رەفتار و رەوشت و جوڵانەوەی مێشکمان تێبگەین،و پێویستیمانیش بە هەندێك زانستی پزیشکی جۆراوجۆر هەیە بۆ دوورکەوتنەوە لە نەخۆشی،و بۆئەوەی لەلاوی وپیرییدا تەن دروست بین...

بۆئەوەی مێشکمان نەرم بکەین بۆ زانست، پێویستە بە قووڵی لە زانستێك بکۆڵینەوە. وەك بایەلۆجی یان گەردوون یان

هەرچ بابەتێك كە حەزی لێدەكەین، و دەبێت ئەم لێكۆڵینەوەیە بكەینە ئارەزووی ژیان، دواتر فراوان دەبینەوە بی قوولبوونەوە بۆ چەند بابەتێكی تر بەمەبەستی زانینی ، كەتوانیمان بزانین زۆربەی هاوبەندی بیر لە سیاسەت و ئاین و ئابووری و هتد... دەگەڕیتەوە بۆئەوەی كە ئێمە ئەم بابەتانە بەرێبازێكی زانستی چارەسەر ناكەین، بەڵكو وازی لێدەهێنین بۆ داب ونەریتمان، كە ناهێڵن پێشبكەوێت وپەرەبسەنێت. ئەوسا دەزانین بەهای زانست چییە؟!...

وادەزانم پێویستیمان بەبەندێكی تایبەت نییە بۆ جیاكاری نێوان وێژە و زانست ، بەڵام پێویستیمان بە وشەی كەمو كورت هەیە بۆ خۆڕۆشنبیركردن.

نوسراوەی وێژەی كۆن فولكلۆری مرۆڤایەتییە، پێویستە هەموو رۆشنبیرێك كەم یان زۆر بێزانێت. گەر هەر وێژەی كۆن بە تەنها بخوێندرێتەوە،ئەوا ئاوەڕدانەوەیەكە بۆ دواوە،و رەفتارێكی كۆنەپەرستانەیە، ئاڕاستەیەكە لاساییكەرەوەیە ... نوسەر باوكەڕۆی چەرخەكەیەتی، لەسەر ئاوازێك دەڕوات جووت نابێت لەگەل ئاوازی چەرخە كۆنەكان.

لایەنگرانی وێژەی كۆن دەفەرموون: وێژەی كۆن گەنجینەی دانایی مرۆڤایەتییە، لەوانەیە تاڕادەیەك وا بێت... بەڵام بەبیركردنەوەیەكی كەم بۆمان دەردەكەوێت كە گەنجینەی تەواوی دانایی مرۆڤایەتی ، مرۆڤ خۆیەتی، و وێژە كۆنەكانیش بەشێكن لەدانایی، و هەرهەمووی نین.

ئێمە هەست بە وێژدانێكی مرۆڤانەی نوێ دەكەین، و



زۆربەی هۆیەكانی بۆ زانست دەگەڕێتەوە ، نەك بۆ وێژە ، و زانستیش نەتەوە نوێیەكانی بەیەكەوە بەستەوە،و مرۆڤ لە نیشتمانپەروەری بەرزكردەوە بۆ جیهان پەروەری، ئەمەش وامان لێدەكات سەیری پێش خۆمان بكەین و بەرەو ئایندە بڕۆین.

لەبیریشمان نەچێت كە زانست بە تەنها دەگەڕێت بە شوێن چییەتی شت، واتا زانیارییە، یان شێوازە بۆ زانیاری، و بەگەڕهێنانی ئەم زانیارییانە پێویستیان بەدانایی هەیە كە لە وێژە و فەلسەفەو ئاینەكان وەریدەگرین.

بە بۆچوونی من، ئاینەكان چەند وێژە و فەلسەفەیەكن. وێژدانی بەرز و پێشكەوتوو بە رۆشنبیری جیهانی دروستبووە و پەروەردەكراوە، و ئاینەكانیش بەشێكن لەوان... هەستی ئاینی پێشكەوتوو و بەرز ئەو هەستە مرۆڤایەتیەیە كە باوەڕی بە نادیاری نییە.

( ٣٦ )

## لێكۆڵینەوەی رامیاری

رۆژنامە خۆراكی بیرمانە، هەموو بەیانیانێك، بە خوێندنەوەی هەواڵەكانوسەیركردنی وێنەكانی دەبوژێینەوە، بابەتمان دەستدەكەوێت بۆ قسەكردن وبیركردنەوەی ئەو رۆژە ، رۆژنامەش بایەخێكی زۆر بەسیاسەتی ناوەوە و دەرەوە دەدات، و بایەخ دانەكەش هەر بۆ هەوال و بانگەشەیە.

بۆئەوەی لەرۆژنامە بگەین، دەبێت لێكۆڵینەوەی سیاسەت بكەین، واتا ئەو بناغانەی كە سیاسەتی لەسەر دروستكراوە،ئەویش مێژوو و ئابووری و سایكۆلۆجییە، و بێ شانسی هەموو جیهانە، كە ئێستا كاروبارەكانیان بەدەست ئارەزووچییەكانەوەیە و ناتوانن كێشەكان زانستانە چارەسەربكەن، بۆیە بەردەوام بە خوتبەدانی هەڵچووناوییەوە لكاون، لە جیاتی ئەوەی پشت بە وێژدان وژیری ببەستن ، هەربۆیە ئەم ئاژاوەیە گشتییە، ژیانی ئابووری و كۆمەڵایەتی داگیركردووە.

گەر وازمان لە نەتەوە سەرەتاییەكانو دڕندەكان هێنا، و هەروەها نەتەوە رۆژهەڵاتییەكانی كە تائێستا ئازاری داگیركەر و پادشاكان وشێخە كۆنە پەرستەكان دەچێژن، دەبینین سێ



سیستم هەن شایستەن بۆئەوەی مرۆڤی رۆشنبیر لێیان بكۆڵێتەوە، ئەوانەش سیستمی دیموكراسی و فاشی و هاوبەشییەتین:-

**سیستمی دیموكراسی**: لە هەموویان باشترە، هەروەك لەسویسرا و سویدو نەرویج ودانیماركدا هەن، و پاش ئەوانیش ولایەتەیەكگرتووەكانی ئەمەریكا دێت،ئەم سیستمە باوەڕی بە ئازادی تاك هەیەو هەوڵدەدات بە (باج) قورسی جیاوازی ئابووری سووك بكاتەوە، بەم سووككردنەوەش مرۆڤ دەتوانێت بە ئازادییەكی رێژەیی بژیت، و جاریش هەیە دەتوانێت بپەڕێتەوە بەسەر دوو دڵییە ئابوورییەكاندا. گومانی تێدا نییە كە رۆژێكیش دێت دیموكراسی مەدەنی دەبێتە دیموكراسی ئابووری.

لەم چەرخەدا دیموكراسی ئابووری لەئینگلتەردا هەیە، و سیستمی هاوبەشیەتی لە زۆر لە دەزگاكانیدا پەیڕەو دەكرێت، حكومەتیش باجی(٩٥) هەزار جنیە لەو دەوڵەمەندە وەردەگرێت، گەر هاتوو داهاتی (١٠٠) هەزار جنیە بوو، و دەبێت هەموو رۆشنبیرێك، و ئەوەی رۆشنبیری سیاسی دەخوازێت لێكۆڵینەوەی ئەم سیستەمە بكات، و كاتێك كەسیستمی هاوبەشییەتی لە كۆمەڵدا پێدەگات ئەوا لەكۆتاییدا هەموو سیستەمە دیموكراسییەكان وایان لێدێت.

كەچی سیستمی فاشی دووكەڵێكی رەشی ستەمكاربوو، ئەڵمانیا و ئیتاڵیا وچەند نەتەوەیەكی دیكەی گرتەوە، ئەڵمانیاو ئیتاڵیا رزگاریان بو لێی، نەتەوەكانی تریش هەر رزگاریان

دەبێت لێی، لەبەرئەوەی نەدیموکراسیەت و نە هاوبەشییەتی ونە هۆی مانەوەی تێدایە، ئەو سیستمە بەهۆی هێزی ئامێری جەنگی گەورە دەژیت، و دەتوانێت بی ئەوەش بژیت؟!..

کلیلێك هەیە، بەهۆیەوە دەتوانین لە هەموو ئەو کودەتایانەی ئەم چەرخە لەسیاسەتی جیهانیدا بگەین، ئەویش بیردۆزی لێکدانەوەی ئابوورییە بۆ مێژوو، و گەر لەم بیردۆزییە بکۆڵینەوە ئەوا لە هۆ و بزوێنەرەکانی کۆتایی هێنان بەفاشیەت لە ئیتالیا و ئەڵمانیا دەگەین، و لە هۆ و بزوێنەرکانی ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیا و فەرەنسا و هوڵەندا بۆ داگیرکردن بە هەموو رەنگەکانیانەوە دەگەین، جیاوازییەکی ئەوەندە گەورە و ئابڕوبەر هەیە لە نێوان ئەوەی کلیلەکەی هەیە، و ئەوەی کە نییەتی، لەبەرئەوەی هەواڵێکی بچووك لەرۆژنامەیەکدا دەبارەی پێکهاتنی سیاسی دوو دەوڵەت، یان تێکەڵبوونی دوو کۆمپانیا، یان بانگەشەیەك بۆ ئاینێك، یان لایەنگیری کۆنەپەرستی لەئاسیا و ئەفریکا و ئەوروپادا، هەموو ئەم هەواڵانە، و سەدەها هەواڵی تر تێدەگەین گەر هاتوو لێکدانەوەی ئابووری بۆ مێژوومان خوێندبێتەوە.

خوێنەری میسری پێویستی بە لێکۆڵینەوەی تر هەیە جگە لە دیموکراسی و هاوبەشتییەتی و فاشیەت، خوێنەری ئەوروپایی دەتوانێت باوەڕ بە لێکۆڵینەوەی ئەو سیستەمانە بکات، لەبەرئەوەی لەو کەش و هەوا سیاسییەدا دەژیت کە لەهەموو ئەمانە پێکهاتووە، و لەسەر یەك لەو سیستەمانە ئوقرە دەگرێت، بەڵام خوێنەری میسری پێویستی بە لێکۆڵینەوەی



دەوڵەتی تورکی هەیە، کە چۆن خۆی لە رۆژهەڵات دامالی و روویکردە رۆژئاوا بەسەرکردایەتی کەمال ئەتاتورك، و نوسراوەی (بك)ی( عەزیز خانکی)، گەورەیی و زیرەکی ئەو سەرکردەیە لەراپەڕینی تورکیادا دەردەخات، وا لە خوێنەری میسری دەکات کە بزانێت هۆی دواکەوتنی میسر چییە؟!...

بەزمانی ئەوروپایی نوسراوەی زۆر هەن کە باسی راپەڕێنەکەی تورکیا دەکەن و فەلسەفەی ئەو گوڕانە رووندەکەنەوە.

هەروەها دەبێت لێکۆڵینەوەی هیندو سیستمە نوێییەکەی بکەین، پاش رۆیشتنی ئینگلیزەکان، لەبەرئەوەی بەسەکردایەتی (گاندی) بەپلەی یەکەم و (نەهرۆ) بەپلەی دووەم ئاین لە دەوڵەت جیاکرایەوە، و ئافرەت لە دەستوردا مافی تەواوی وەرگرت و لەگەڵ پیاودا یەکسان بوو بۆ دەنگدان و هەڵبژاردن، ژن بەوەزیرو سەفیر دامەزرا، و لەمیراتگەرییدا نێرومێ یەکسان بوون.

لەم بارودۆخەی ئێستادا دەبێت، لە ئیمپراتوڕییەتی هاوچەرخەکانی فەرەنسی و بەریتانی و هوڵەندی بکۆڵینەوە و بزانین سیستمەکانی حوکمڕانی لەمیسرو هیند و جاوە وتونس و دەوڵەتانی تردا کە باون چین؟؟ بزانین جۆرەکانی داگیرکردن لەنێو نەتەوە دواکەوتووەکاندا چین؟! کە ئاواتمان نەمانیانە، لەگەڵ مردنی سەرەتاکانی ئیمپراتۆڕیەتی پاش جەنگ، بەڵام ئەم ئاواتە لەم کاتەدا بەئاواتێکی ئەندێشەیی دەچێت، نەك بە ئاواتێك کە بێتەدی.

جیهان ئێستاش پێویستی بە تێکۆشانە بۆ ئازادکردنی میللەتانی ژێردەست هەروەك چۆن جاران پێویستی پێ بوو بۆ نەهێشتنی کۆیلەتی،و دەبێت ئاگامان لە ئاماری سالآنە و ئەو سەرژمێریانە بێت کە هەموو(١٠) سالّ جارێك دەکرێت، لەگەڵ ئەتڵەسێکی جوگرافی،و هەمووئەمانە بە زمانی خۆمان هەن، بەلآم ئەتڵەسی سیاسی بەزمانی ئەوروپایی هەیە، هەموو گۆڕانکارییە هەرێمیەکانی تێدایە، کە پەیمان و جەنگەکان دروستیان کردوون،،، ئەمەش پێویستە بۆ هەموو خوێنەرێك کە لێکۆڵینەوەی سیاسەت دەکات و هەواڵی ڕۆژانە دەخوێنێتەوە.

ئەوەی جێگای داخە، زۆر لە خوێنەر ئامار پشتگوێ دەخەن، لەو کاتەی ئامار:- ئەو کەرەستەیەیە، هەموو پرۆژەیەکی چاکسازی لێپێکدێت، مێشکی ئاماری مێشکێکی زانستییە،و بۆ لێکۆڵینەوەی سیاسەت و کۆمەلآیەتی چاکترین مێشکە.

بەشداریکردنی خوێنەر لە گۆڤارێکی ئەوروپایی سیاسی بە چاك دەزانم، گەر هاتوو پەرەسەندنی سیاسی ڕوونکردەوە بۆخوێنەر ...

ئەم بەندەم لەسالّی(١٩٤٥) نوسیوە،و ترسام باسی دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیت بکەم نەبا بمگرن، بۆیە باسی گرنگی لێکۆڵینەوەی ئەو سیستەمەم نەکردووە، بەلآم ئێستا کەسالّی(١٩٥٨) ە، وەبیر خوێنەر دەهێنمەوە کە هەزار ملیۆن مرۆڤ لە یەکێتی سۆڤیەت و چین لە نێو سیستەمێکی هاوبەشییەتی تەواودا دەژین، بەگێلی و گەوجەیەتی دەزانم، گەر



یەکێك بە خۆی بلێت رۆشنبیر، لێکۆڵینەوەی نەکات،و بەدوای پەرەسەندنی هاوبەشتییەتیدا نەچێت!!...

( ٣٧ )

## لێکۆڵینەوەی مێژوو

گەر لە مێژوو نەکۆڵینەوە، ناتوانین لە ئابووری و کۆمەلآیەتی و رەوشت و سیاسەت بگەین... سەرەڕای ئەوەش مێژوو بیرکردنەوەیەکی گیانی مرۆڤایەتیمان دەداتێ، لەبەر ئەوەی راڤەی تێکۆشانی مرۆڤمان بۆ دەکات کە لەپێناوی پێشکەوتن وئازادی و شارستانییەتیدا بووە، بەمەش گیانی فەڕ و چاکەیی لە دەروونماندا بەهێز دەکات، مەبەستیشمان مێژووی چاکە، کە بێ بانگەشەی نیشتمانی نوسراوە، ئەو مێژووەی کە وەك یەك نەتەوە سەیری مرۆڤ دەکات، و بۆ شارستانییەتی تێدەکۆشێت، سەرباری هەموو ئەو هەڵە دووبارەبووانەش.

جاران وەك هونەرێك لە مێژوو دەکولرایەوە، بەمەبەستی بانگەشەی نیشتمانی یان رێباوەڕی (مذهبی)، ئێستاش لەنێو نەتەوە فاشیەکاندا هەروایە،و کردوویانە بەشێوازێك بۆ دەمارگیری و رق و جەنگ، کەچی مرۆڤی رۆشنبیر کە بەپاکی و ووردی لەمێژوو دەکولێتەوە، دەبنیێت مێژوو شێوازێکە بۆ

خۆشەویستی مرۆڤایەتی وئاشتی و لێبوردن.

دەبێت وا لەپەرەسەندنی بایەلۆجی بکەین( واتا گواستنەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵییەوە بۆ مرۆڤایەتی) کە ببێتە گەورەترین بەشی لێکۆڵینەوەکەمان، واتا دەبێت پێش مێژوو لەمێژووی مرۆڤ بکۆڵینەوەو نوسراوەی (نظرية التطور وأصل الآنسان)و(الآنسان قمة التطور)ی خۆم ، سەرەڕای کورتییەکەی، لەو بارەیەوە چاوی خوێنەر دەکاتەوە و وای لێدەکات بایەخی زێتری پێبدات.

پاش ئەوەش دەبێت مێژووی شارستانییەتی میسر بکۆڵینەوە، لەبەرئەوەی لەنیشتمانی ئێمەدایە، مرۆڤی سەرەتایی لە ژیانی دارستان و کۆکردنەوەی رەگ و خواردنی سروشتی گوازرایەوە بۆ ژیانی کشتوکاڵی و بەرهەم هێنانی خواردن.کشتوکاڵیش یەکەم گاڤی شارستانییەتی کۆنە،و بەهۆیەوە حکومەت و ئاین و نوسین و رۆشنبیری و پیشەسازی سەرەتایی هاتەکایەوە... نوسراوەی(مصر أصل الحضارة)ەی خۆم لەو بارەیەوە چاکە.

نوسراوەی مێژوو بەزمانی عەرەبی، مەبەست نوسراوە کۆنەکانە، مادەی تایبەتن بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووو دانانی نوسراوەی نوێ لەسەریان ، و خوێنەری ئاسایی ناتوانێت پشتی پێببەستێت،و نوسراوەیەکی وەك (موجز في التأريخ العام)ی(ه.ج.ولز) بە هەموو عەرەب دانەدەنرا؟!و لەو بارەیەوە زۆر دواکەوتووین بە هۆی ئەو دواکەوتوییەمانەوە وێنەی مرۆڤایەتی لە بیرکردنەوەماندا لێڵ بووە،وئەوەی پشت تەنها بە



زمانی عەرەبی ببەستێت بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو ئەوا بە پەروەردەیەکی کەمەوە دەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی لەسەر زەوییەك دەژیت نازانێت مێژووی چییە، چۆن دانیشتوانی پەرەیان سەندووە!؟.

پێشتر قسەمان لەسەر وێژەی کۆنی عەرەب کرد، باسی نوسراوەی مێژوومان زۆرکرد،و هەر وەك وتمان بەکەرەسە دادەندرێن بۆ لێکۆڵینەوەی،و زۆریش سنوردارن، لەبەرئەوەی تەنها باسی عەرەب ومیسر دەکەن... باسی رووداوەکان وەك چیرۆك دەکەن، بێ جیاکاری نێوان رووداوە ترسناکەکان و بێ کەڵکەکان ... ئێمەش کە لەمێژوو دەکوڵینەوە بۆ ئەوەیە زیاتر مرۆڤانەتر بین.

بێبەشی زمانمان لە نوسراوەی مێژووییدا سنوردارکردنی بیرکردنەوەی جیهانییە لەنێو لاوەکانماندا، و نوسراوەکانی خوێندنگەکان کە باون، بەهایەکی زۆر کەمی هەیە،و بەئیسکی مێژوو دەچێت، نەك بە مێژوو خۆی.

نوسراوەی(العصور القديمة) وەرگێڕانی (داوود قربان) ونوسراوەی (التأريخ المصري القديم) ی (عبدالقادر همزە) بە نوسراوەی زۆر کەم و چاك دادەندرێن بۆ خوێندنەوەی مێژووی کۆن.

بە زمانی ئێمە هیچ نوسراوەیەك نییە سەبارەت بە مێژووی (ئەگریك)و( رۆمان)و (هیند) و(چین) و(ژاپۆن)و(ئەمەریکا) ، تائێستاش لای خوێنەری عەرەب، سەدە تاریکەکان، هەر لە تاریکی خۆیاندان و هیچ نوسراوەیەکمان نییە لەسەر راپەڕینە

مرۆڤایەتییە گەورەکەی سەدەی(١٥)ەم، کە خوێندنەوەی شۆڕشێکی بیری گەورە لە دەروونی خوێنەری عەرەبدا دروستدەکات.

لەبەرئەم هۆیە دەبێت بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی مرۆڤایەتی زمانێکی بیانی بزانین و تائێستاش (٢٥٠) هەزار جنیە بۆ کۆڕی زمانەوانی سەرفکراوە بۆ داڕشتنی وشەی نوی، و گەر ئەو پارەیە بۆ وەرگێڕانی نوسراوە ئەوروپاییەکان سەرف بکرایە، ئەوا بە نزیکی (١٠٠) نوسراوە زمانمانی دەوڵەمەند دەکرد لەمێژوو وشتی تردا، و پەروەردەکەشمان بە کەمی نەدەمایەوە.

لێکۆڵینەوەی مێژوو پێویستی بەم سیستەمەی خوارەوە هەیە، هەرچەندە دەزانین هیچ سوودێکی بۆ خوێنەرێك نییە کە زمانێکی بیانی نەزانێت:-

١- دەبێت لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەم زەوییە بکات، هەر لە دورست بوونیەوە، تا سەرهەڵدانی مرۆڤ لەسەریدا.
٢- دواتر لێکۆڵینەوەی ژیانی مرۆڤی سەرەتایی بکەین، تاگەیشتنی بە شارستانییەتی کشتوکاڵی لە میسردا.
٣- لێرەدا، دەبێت لێکۆڵینەوەی ئەو(٤) هەزار ساڵەی مێژووی میسر و فرعەونەکان بکەین، لەبەرئەوەی مێژووی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری وئاینیە بەشێوەیەکی سەرەتایی.
٤- دواتر، دەبێت لێکۆڵینەوەی نەتەوە کۆنەکان بکەین، وەك بابلییەکانو فینکیەکانو گریکەکان و رۆمانەکان و چینیەکان وهیندییەکان.



٥- لێکۆڵینەوەی عەرەب بکەین بەدوور و درێژی، لەبەرئەوەی پەیوەندییەکەمان لەگەڵیاندایە .
٦- لێکۆڵینەوەی سەدە ناوەڕاستەکان بکەین.
٧- لێکۆڵینەوەی راپەڕین بکەین.
٨- دواتر لێکۆڵینەوەی پەرەسەندنی ئابووری ئەوروپا بکەین کە پێش (١٧٠) ساڵ روویداوە، و لێرەدا پێویستیمان بە لێکۆڵینەوەی (نظریة التفسیر الاقتصادي للتأریخ)هەیە.

خوێنەر دەبێت لێکۆڵینەوەی(١٠) شۆڕشی جیهانی بکات، وەك شۆڕشی ئینگلیز دژی(چارلسی یەکەم)ی پادشا، و شۆڕشی فەرەنسییەکان دژی (بۆربۆن) و شۆڕشی ئەمەریکا، و شۆڕشەکانی روسیا و تورکیا و چین و هیند... وپێشکەوتنی مرۆڤایەتی زۆرجار پێویستی بە شۆڕش هەبووە، و لەبارەیەوە نوسراوەی (الثورات)م هەیە.

لێکۆڵینەوەی مێژووی زانستەکان و هونەرەکان ، چاکترە لە خوێندنەوەی مێژووی نەتەوەیەك، لەبەرئەوەی گەر هاتوو مێژووی کیمیا لێکۆڵینەوە بکەیت. و چۆن لەمیسرەوە گوازرایەوە بۆ ئەوروپا و چۆن کۆتایی پێهات بە دۆزینەوەی هۆکارەکانی ئابووری لەپیشەسازی و کشتوکاڵدا.

یان کە لێکۆڵینەوە مێژووی پزیشکی دەکەیت، یان مێژووی یاساکان، ئەوانە چاومان زێتر دەکەنەوە لەوەی تەنها مێژووی میسر، یان مێژووی ئینگلتەرا بخوێنیتەوە، لەبەرئەوەی رێبازی یەکەم، ئاڕاستەیەکی مرۆڤانەی جیهانیمان دەکات، کەچی ئەوەی دووەم بیرکردنەوەمان هەر لە چێوەی ئەو وڵاتەدا

دەهێڵتەوە...

( ٣٨ )

## لێکۆڵینەوەی ئابوورییەکان.

پێش(٢٠٠) ساڵ(ئابوری) زانستێك نەبوو لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت، لەبەرئەوەی ئەوسا بەهای نەدەزاندرا، و مرۆڤیش ئەوەندەی پێویست بەم زانستە نەبوو بەهۆی ئەوەی کە ڕێبازی بەرهەم هێنان کشتوکاڵی بوو،و پیشەسازیش دەستی بوو. و هەموو نەتەوەیەکیش ژیانێکی سادە دەژیا، هەربەشی خۆی بەرهەم دەهێنا و هەر خۆشی بەکاری دەهێنا.. و بازرگانی نێوان نەتەوەکانیش کەم بوو جاریش هەیە هەر نەبووە ... لەبەرخاوی گواستنەوە، یان نەبوونی.

بەوشەیەکی تر، دەڵێم، هەموو نەتەوەکان کشتوکاڵی بوون،و ئابوورییەکانیان وەستابوو،و شارستانییەتەکانیانیش لادێیانە بوو، و گۆڕانی کۆمەڵایەتییان خاو وسست بوو یان هەر نەبوو.

بەڵام پێش(١٧٠) ساڵ جیهان گۆڕا،و شێوازی بەرهەم هێنانی، لە دەستییەوە گوڕا بە ئامێر، و بەشێوازی گواستنەوە و خێراییەکەی توانی بگاتە وڵاتانی دوور،و سەرمایە جولایەوە و ئاوسا،و کۆمپانیا بەشدارییکان بوون بەهێزێکی ئابووری



گەورە،و کاریگەری زۆریان هەبوو لە قۆستنەوە و زاڵبوون لەبازاڕە ناوخۆ و دەرەکیەکاندا، داگیرکارییان دەستپێکرد،و سیاسەتیان بەکارهێنا، ئەم جوڵانەوە ئابوورییە نوێیە، ماڵوێرانی زۆری بۆ کریکار و نەتەوە کشتوکاڵییەکان لە ئەفریکا و ئاسیادا دروستکرد، لەهەمان کاتدا وێژدانێکی نوێی بۆ یەکبوونی جیهانی هێنایەکایەوە، واتا پێویستی یەکبوون،و گەر سەرمایە ئازاد بێت لە قوستنەوە، ئەوا ئاژاوە و جەنگ و خراپەکاری بەرپا دەبێت؟!...

بۆیە، لەم چەرخەدا کێشە سیاسییەکان گوڕاون، ئێستا کێشەکە جیاوازی نییە لەنێوان دوو نەتەوەدا، یان نێوان پادشا و میللەتدا، بەڵکو کێشەکە جیاوازییە لەنێوان چینی پیشەسازییەکانو داراییەکانو چینی کرێکاردا، کە هێزە داراییەکان و بازرگانییەکانو پیشەسازییەکان دەیقۆزنەوە، ئێستاش درك بەو هۆکارانە دەکەین کە پاڵ بە نەتەوە پێشکەوتووەکانەوە دەنێت بۆ داگیرکردن و جەنگ و باڵادەستی بەسەر نەتەوە کشتوکاڵییە لاوازەکاندا.

لەمەش زێتر، (کارل مارکس) توانی بەهۆی (نظریة التفسیر الاقتصادی للتاریخ)ەوە چاومان زیاتر بکاتەوە ، بێ ئەم ئامرازە مارکسییە، ناتوانین لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکانی ئەم چەرخەمان، ویان مێژووی رابردوومان بکەین، و بێ ئەویش لە گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەکانی نێو نیشتمانەکەمان ناگەین.

بەداخەوە، ناتوانم دەستنیشانی ئەو نوسراوانە بکەم کە

باسی بیردۆزی مارکس دەکات، لەبەرئەوەی بە زمانی خۆمان ئەو نوسراوانە نین... و یاساکانمان سەرەڕای لێڵییان دەرکردنی نوسراوەیەکی ئەوها، دەخەنە جێی گومان و بەر لێپرسینەوە، زۆر سەرسورهێنەرە کە حکومەتی میسرسالّی(١٩١١) کۆمەڵێکی ناردە مۆسکۆ، بۆئەوەی ڕێبازی (نیکۆلای) قەیسەری لە ڕاونانی ئازادیخوازان و ناردنیان بۆ(سیبریا) فێر بن، کە تائێستا خەڵکی (سیبریا) قینیان لە هاوبەشییەتییە، و دژی دەجەنگن ... کەچی بەریتانیا ئەو رایانە بە هەند وەردەگرێت ،و خەڵوز و گەیاندنی خۆماڵی کرد، و دەیانەوێت کارگەی پۆڵاش خۆماڵی بکەن؟!....

مێژووی میسر لەماوەی ئەم (٧٠) ساڵەی دواییدا، ئەم بۆچوونە مارکسییانەی زۆر جوان روونکردۆتەوە، و ئەو میسرییەی شیکردنەوەی ئابووری بۆ هەژاری و ماڵوێرانی و نەخۆشییەکان نەزانێت، ئەوا مێژووی میسر نازانێت، و بێ ئەو شیکردنەوە مارکسییە لەرووداوەکانی ئێستادا ناگات.

ئەو حکومەتەی لێکۆڵینەوە دەربارەی(کارل مارکس) قەدەغە بکات، هەر تەنها شایستەی تووڕەیی (ڤۆڵیتر) نییە، کە کاردەکات بۆ قەدەغەکردنی پیرۆزترین شت لە مرۆڤدا و سنوورداری دەکات، ئەویش بیکردنەوەیە... بەڵکو لەبەرئەوەی کاردەکات بۆ گشتاندنی هەژاری، واشمان لێدەکات لە میسردا هەروەك نەتەوەیەکی کشتوکاڵی بمێنینەوە و لە راژەی پارەدارەکان بین، هەروەك مەبەست لە بوونمان لەم جیهانەدا تەنها بۆ راژەکردنی ئەو پارەدارانە بێت!؟...

لێکۆڵینەوەی بەریتانیا لە چەرخی نوێیدا، لێکۆڵینەوەی



ئابوورییەکانە... لەبەرئەوەی ئەو نەتەوەیە بوو کە وردە وردە هاوبەشییەتی و خۆماڵیکردنی کردە سیستمی دەوڵەت، و هەموو ئەوانەی کە خۆڕۆشنبیرکردنیان مەبەستە دەبێت لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن، و بەهۆیەوە لە سیاسەتی جیهانی و گۆڕانکارییەکانی ئایندەش دەگەن، ئەمەش ئەوە ناگەیێنێت کە حکومەتی بەریتانی وازی لە دابی داگیرکردن هێنابێت.

چاکترین لێکۆڵینەوە لەبارەی ئابوورییەکانی جیهانەوە لێکۆڵینەوەی مارکسییەتە، کەلەسەر (١٠٠٠) ملیۆن مرۆڤ لە چین و یەکێتی سۆڤیێت پەیڕەو دەکرێت.

خوێندنەوەی هەواڵەکانی جیهانی لەرۆژنامەکاندا ، گەلێك چاکترە لە خوێندنەوەی هەر چ نوسراوەیێکی عەرەبی لەسەر ئابوورییەکان، گەرهاتوو خوێنەر هەر تەنها زمانی عەرەبی بزانێت، لەبەرئەوەی خوێنەر گەر بەدواچوون و تێگەیشتن و بۆچوونی چاك بخوێنێتەوە، دەتوانێت بزانێت، ئەو هۆکارانەی لەپاڵ جوڵانەوەی ئابوورییەکاندا دەوەستن چین؟!

( ٣٩ )

## لێکۆڵینەوەی فەلسەفە

زۆرجار لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجی وای لێکردووم بە قووڵی لێکۆڵینەوەی نەخۆشییە دەروونییەکان بکەم، لەئاسانترینیانەوە، کەدوو دڵی و خەمە، تا دەگاتە ترسناکترینیان کە شێتی و شیزوفرینیایە.

ئەوەی بە قووڵی ئەم نەخۆشییانە بخوێنییتەوە، دەتوانێت پێیان بڵێیت( نەخۆشی فەلسەفی)ین کە بە(نەخۆشی دەروونی) دادەندرێن... لەبەرئەوەی لەش ساغە و دەروون نەخۆشە، و لەوانەشە لەشیش نەخۆش بکات، بەڵام هۆی سەرەکی نەخۆشی دەروونی، ئەوەیە کە بۆچوونی فەلسەفی بۆ ژیان بەرێبازو ئامانجە خراپەکانییەوە لەگەڵ هێزی مرۆڤایەتیدا ناکۆکن، یان لەگەڵ کۆمەڵدا ناگۆنجێن... یان حەزەکانی دەروون و ئاواتەکانی تێر ناکەن.

سەرەڕای ئەوەی کە نەزانینی گشتی زاڵە بەسەر نەتەوەکاندا، تائێستاش هەر یەکێك بیردۆزی فەلسەفی خۆی هەیە، بەویژدان و تێگەیشتنەوە لە ژێری ناوەوەیەوە و بەبێ زانینی خۆی بەکاری دێنێت، و هەموو کۆمەڵێك ئاڕاستەیەکی خۆی هەیە لە ژیاندا، و داب ونەریت بەکاردێنێت، وا لە تاکەکان



دەکات بۆ گەیشتنە سەربەرزی وریز و بەرزی توانایان بەکار بهێنن.

لە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا، تاك هەوڵدەدات بۆ دەوڵەمەندی، و باوەڕیشی بەسەرکەوتنی هەیە، و گوێناداتە هەڵسانی بەیانیان زوو، و درەنگ گەڕانەوەی شەوی،ئەم رەنجەش دەبێت هەموو ئەمەریکیەك بیدات گەر ویستی بگاتە لووتکە، پێشبڕکێی گشتی وات لێدەکات، کە پەیداکردنی سامان بە توانای راکردن و راکردنی لەسەرەخۆ دەبێت.و ئەوەندە نابات، هەموو سامانەکەت سەرف دەکەیت ، و ئەوسا دەبێتە پێشبڕکێ لەسەرفکردنی ساماندا نەك لە کۆکردنەوەیدا...

ئەم بۆچوونە بۆ ژیان لەراستیدا بۆچوونێکی فەلسەفییە، بۆیە زۆر بە دڵنیایی و بەساکاری دەژین، و زۆر بەئارەزووانە سەرف دەکەن. چۆنییەتی پەیداکردنی سامان لەئەمەریکادا، خەم و دوو دڵی هەموو کوڕێك و کچێکە، چۆن بیگاتی و چۆن لەپێشبڕکییە ئابوورییە گشتییەکە سەرکەوێت؟! ئەم دوو دڵییە و خەمە ماندووبوونێکی زۆر قورسە، لەزۆر کاتدا دەبێتە هۆی هەرەسی دەروونی، بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کە نیوەی قەرەوێلەکانی نەخۆشخانەکانی ئەمەریکا بە نەخۆشی دەروونی پڕکراوەتەوە، نەك بە نەخۆشییەکانی لەش، باری فەرەنسا و ئەڵمانیا و هۆڵەندا تۆزێك لە ئەمەریکا باشترە.گەر ویستیمان چارەسەری ئەم نەخۆشییانە بکەین، لەچارەسەری فەلسەفی زیاتر هیچی تر شك نابەین، لەبەرئەوەی دڵنیایی و ساکاری لەژیاندا بەهای خۆی هەیە لەم جیهانەدا، سەرفکردن و

رابواردنیان پێ باشترە، هەر ئەوەشە دەمانگەێنێتە رابواردن و چێژ وەرگرتن لە دونیادا ، و ژیان بەئاسوودەیی و بەختیاری دوور لە دوو دڵی بەسەربەرین. قەیسەری رۆمان(مەرقس ئۆریلیۆس) دەیووت: لەژێر سێبەری دارێکدا نان و پەنیرێك بخوێت، بەختیارییە. بۆیە گەر تێڕوانینی ئەم نەخۆشە بگۆڕین، چاك دەبێتەوە، و گەر نەگۆڕا ئەوا گیانی پێشبڕکێ دەیکوژێت؟!

بەڵی دەیکوژێت، لەبەرئەوەی نەخۆشی دەروونی دەبێتە نەخۆشی لەش، خەم و خەفەت فشاری خوێن زیاد دەکات و خوێنبەرەکان دەئاوسێنی، و دواتر رەق دەبن، و دڵ لە توانای خۆی زێتر ماندوو دەبێت بۆ پاڵنانی خوێن، و لەوانەیە بوەستێت، و خاوەنەکەی بمرێت، و پێش ئەم مردنەش چەندین ساڵ ژیانێکی ناخۆش دەژێت.

ئەم زۆرڕەوییە لەپێشبڕکێ، نمونەیەکە لە بینینی فەلسەفی خراپ... ئێرەییش (غیرە) لەنێو ژناندا هەیە، و زۆر حەزی مندالانە هەیە، هەتا دەگەینە لاوی و بگرە پیریش لەگەڵماندا دەمێنێتەوە، و رەفتاری دەروونی و لەشیشمان دادەپۆشێت و ئەمانەش هەمووی مانای ئەوەن کە ئێمە پێویستیمان بە تەندروستی و بینیی فەلسەفی چاك هەیە، بۆئەوەی ژیانێکی خۆش بەسەربەرین.

مانای فەلسەفە لەم چەرخەدا زۆر جیاوازە لەگەڵ مانا کۆنەکەی کەلە ئەوروپادا باو بوو... جاران وا تێدەگەیشتین کە فەلسەفە رامانە لە دروستکەر و دروستکراو، و لێکدانەوەی گەردوونە، و لێکۆڵینەوەی رێباوەڕەکانی کۆن و نوێیەکانی



رۆژگارەکانی گریکن تا دەگاتە ئەم چەرخە؟!... تەرازوو راگرتنە لەنێو بیردۆزییە جیاوازکاندا یان هەوڵدانی سەرخستنیەتی بەکەمکردنەوە لیرە و زیادکردنی لەوێ.... وفەیلەسوفیش ئەو پیاوەیە کەوازی لە دونیا هێناوە و چاویلکەی لەسەر لووتی داناوە، و لەنێو نوسراوەکاندا خنکاوە. لاپەرەکانی هەڵدەداتەوە و چاوی لەسەر هەڵناگرێت ، تەنها بۆ کاوێژکردنی ئەفلاتوون وئاڕستۆ نەبێت... هەر بیر لە دیکارت و سپینوزا دەکاتەوە.

بیرکردنەوەی نوێ ئاڕاستەیەکی تری هەیە، مامۆستا (دیوی))، سەرکردەی جولانەوەی تازەگەری لەفەلسەفەی نوێیدا، وا دەبینێت کە: فەلسەفە شێوازێکە لەشێوازەکانی تێکۆشان وسەرکەوتن لەژیاندا، هەر وەك هەموو جۆرەکانی رۆشنبیری وایە، کە هەموو هەوڵ و تەقەلای تەرخانکردووە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵی مرۆڤایەتی ... بۆیە دەبێت بنەمای ئەو کۆمەڵە رەخنەو نوێکردنەوە بێت لەفەلسەفەدا.

لێرەدا ئەم دیاردە نوێیە دەبینین، ئەویش ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی لەپەناگەی نێو کتێبخانەکانی زاناکاندا کە دوور کەوتبوونەوە لەژیانی گشتی هاتنە دەرەوە، بۆیە بۆ نموونە دەبینین لە ئەمەریکا مامۆستا (ماکیفەر) بە مامۆستای فەلسەفە لە کولێژی کشتوکاڵدا لەتەکساس دامەزرا؟!

با رابێن لەسەر ئەم هەواڵە کە بچووکە لە پێکهاتەی و گەورەیە لەمانادا، ئەم کولێژە خوێندکارەکانی فێرە(چاندنی لۆکەو بایەخدان بە تەماتە و دۆشینی مانگا) دەکات، بەڵام لە

تەکیەوە فەلسەفەیان فێردەکات، بۆئەوەی بزانن ئاسەواری فەلسەفە لە ژیانی کشتوکاڵی ئایندەیاندا چییە... چاویان بکەنەوە لەسەر بەهای ژیان و پشت بە فەلسەفە ببەستن، بۆئەوەی وەك تاك بزانن بایەخ بە چ دەدەن و حەزیان لە چییە،و پایەی کۆمەڵایەتیان لەنێو نەتەوەکەیاندا چەندە؟!؟

فەلسەفە وای لێهات پەیوەندی بە کشتوکاڵ و پیشەسازییەوە هەبێت، دەبێت پەیوەندییەکە بەتین بێت لەگەڵ ماڵ و کارگەدا و دەبێت هەموو لاوێك نێرو مێ بپرسێت، ئایا ئەم پرۆژەیە دەگونجێت لەگەڵ بینین و بۆچوونی فەلسەفیدا یان نا؟!... ئەمەش وامان لێدەکات کە بڵێین، هەموو لاوێك پێویستی بە مەشقی فەلسەفی هەیە، واتا ، دەبێت رابێین لەگەڵ فەیلەسوفەکاندا و مەشق بەبیرمان بکەین و پەروەردەی سۆزمان بکەین بەئەوەی کێشەکانمان بە فەلسەفە چارەسەربکەین... وگەر ئەوەمان کرد ئەوسا بە شوێن شتی ترۆ ناکەوێن و کات و توانامان بەفیڕۆ ناڕوات، وەك راکردن بەدوای پایەی کۆمەڵایەتیدا، یان خۆهەڵکێشان بەپارەدارییەوە و هتد...

ئەو بیرەی بە فەلسەفە راهێنرابێت، کێشانەی ئەوە دەکات، ئایا بە (١٠٠) جنیە خانوویەك بکڕێت یان کتێبخانەیەك؟!. لەبەرئەوەی لێرەدا لەنێوان فراوانکردنی بیری و پێشخستنی کەسێیەتیدا... و فراوانکردنی موڵك و گەورەکردنی پایەی کۆمەڵایەتیدا دەوەستێت، کە بەهاو ئامانجی ژیانە....

ئاین خۆی لەنێو فەلسەفەدا شاردۆتەوە،و فەلسەفەش خۆی لەنێو ئایندا شاردۆتەوە... لەبەرئەوەی هەردووکیان ئاڕاستەی



رەفتارمان دەکەن و بەهاو رەوشتمان لەژیاندا بۆ دیاریدەکەن،و بەزمانی عەرەبیش چەند نوسراوەیەك پەیدابوون ، نەتێرمان دەکەن و نەئاڕاستەمان دەکەن، بەڵام لەوانمان باشتر نییە.

أ- (قصەالفلسفە)ی (مامۆستا احمد امین) باشترینیانەو سودێکی کەمی هەیە.

ب- زنجیرە کورتەکەی مامۆستا( عبدالرحمن بدوی).

ج- (الاخلاق)ی(ئارستۆ تالیس) وەرگێرانی (احمد لطفی)

د- (نظام الحکم) و(ئارستۆ تالیس)وەرگێڕانی دکتۆر(طە حسین).

نوسراوە فەلسەفییە کۆنەکان بەزمانی عەرەبی، نادیار و نەزۆکن... هەر هەموو کورت کراوەی بیری گریکەکانن، پاش دەرکردنی بە قەڵبی، بۆ راژەکردنی وتووێژی رێباوەڕی مەسیحیەت.

سروشتی فەلسەفە لە نوێگەریدا خاوە، بەڵام دەبێت بزانین کە هەتا بەرەو نادیار بڕوات ئەوەندە ئاستی نزم دەبێتەوە.. و بەپێچەوانەوەش هەتا بەرەو مرۆڤایەتی بڕوات، ئەوەندە ئاستی بەرز دەبێتەوە... لەبەرئەوەی بە شوێن بەهادا دەگەڕێت، کەچی زانست بەشوێن چییەتیدا دەگەڕێت. یان فەلسەفە وەك سوکانە، ئاڕاستەی بەلەمەکە دەکات،و زانستیش چارۆگەکەیەتی ، واتا هێزە... زانستیش بێ فەلسەفە وەك هێزی بێ سوکانە، لەوانەیە بەلەمەکە بەرەو بەردێکی گەورە ببات، بۆیە فەلسەفەی پێشکەوتوو ئاینێکی پێشکەوتووە. لەوانەیە دەربڕینێکی نوێ بمانگەینێتە سوود وەرگرتن لە فەلسەفەو ئاین پێکەوە، ئەویش

ئەوەیە بڵێین:

فەلسەفەی پەیڕەوکراو و ئاینێکی پەیڕەوکراو بەقەد ئامادەکاری فەلسەفەو ئاین بۆ پەیڕەوکردنی لەپێناوی ڕاژەکردنی مرۆڤایەتیدا، بەهاکەی دیاریدەکرێت... گەر وا نەبوو ئەوا نادیارێکی تڕۆن، واتا بیرکردنەوەیەك و تێکەڵبوونێکی پووچن؟!...

لەوانەیە ئەمانەی خوارەوە، فەلسەفەو زانست جیابکاتەوە وەك چییەتی:-

١- زانستەکان بەش بەشن، فەلسەفەش هەمووە، بۆیە بە شوێن زانستە سەربەخۆیەکان دەگەڕێت و کۆیان دەکاتەوە بۆئەوەی مانای گشتییان لێ پوختە بکات.

٢- زانست بە شوێن چییەتی شتدا دەگەڕێت، کەچی فەلسەفە دەگەڕێت بە شوێن بەهای ئەو شتەدا بۆ مرۆڤ ... وایە زانست وزەی گەردیلەی دۆزییەوە، بەڵام فەلسەفە دەبێت بزانێت مەبەست لە دۆزینەوەکەی چییە...

٣- بۆیە، زانست بۆی نییە باسی جوانی و بەرزی ڕەوشت و ئایندەی مرۆڤ بکات، لەبەرئەوەی هەموو ئەم شتانە پەیوەندارن بە بەهاوە نەك بەچییەتییەوە.

٤- زانست بە شوێن هۆی ڕاستەوخۆدا دەگەڕێت، کەچی فەلسەفە بەشوێن ئامانجی کۆتاییدا دەگەڕێت.

٥- زانست ڕاستییەکانمان دەداتێ، فەلسەفەش بەرنامەمان بۆ دیاریدەکات.

٦- زانست داکەوت(واقع) ڕاڤەر دەکات، فەلسەفەش ئامانج



دیاریدەکات.

٧- زانست بۆ زانیارییە، فەلسەفەش بۆ داناییە.

لەم دەستنیشانە کورتەدا دەردەکەوێت کە فەلسەفە لەگەڵ وێژە و ئایندا جیاوازی نییە، تەنها لەڕێباز ودەربڕیندا جیاوازە... بەڵام هەر سێکیان لە ئامانجدا هاوپەیمانن و... بەهاکانی مرۆڤایەتی دیاریدەکەن.

(٤٠)

## لێکۆڵینەوەی ئاین

لێکۆڵینەوەی ئاین دەبێت جێگەی بایەخێکی گەورەی ڕۆشنبیر بێت، لەبەرئەوەی ژیانێکی زیرەکانەی خۆش مەبەستی ڕۆشنبیرە، و ئەو ژیانە خۆشەش بێ ئاین نابێت.

ئێمە کە لە وێژە و فەلسەفە دەکوڵینەوە بۆئەوەیە کە بەهای لێوەرگرین، و ژیان و مەبەستەکەی پێ بپیوین، چەند جوانی و ناشرینی تێدایە، و دەستنیشانی ئەو ئامانجانە بکەین بۆ ژیانمان و هەوڵ و تەقەلای زۆری بۆ بدەین بۆ وەدیهێنانی...ئەو مەبەستانەش ئاینن.

ئێمە بە لاسایی ئاین لەباوك و دایکەوە وەردەگرین لە منداڵییەوە، و تۆزێکیش لە لاویدا هەر پشت بە ئاین دەبەستین، وەك پشت بەستنمان بە باوك و دایك وایە، ئاشکرابوونی ئاین بۆ

رۆشنبیر پێویستی بەچند ساڵ و چەندین لێکۆڵینەوە هەیە، بە گۆڕانە دەروونییە یەك لە دواییەکەکان، بەهۆی تاقیکردنەوەکانی ژیانەوە روودەدات. لە (٥٠) ساڵیدا دەبینین ئەو باوەڕانەی کە بۆمان ماوەتەوە، هیچ نییە بەرامبەر ئەو بینین و بۆچوونە ئاینییەی کە بەرهەمی تێگەیشتنی ژیانە لەسەر ئەم زەوییە بۆ ماوەی نیو سەدە، یان زێتر لەنێوسەدە..ئەم بینین و بۆچوونە جار هەیە لەگەڵ باوەڕدا دەگونجێن، و جاریش هەیە ناگونجێن ، بەڵام ناکرێت رۆشنبیر بگاتە ئەم تەمەنە و زۆر بەراستی و رۆشنبیرانە ژیابێت و چاکیش تێبگات، خۆی بەبێ ئاین بدۆزێتەوە، واتا خۆی بێ ویژدانی مرۆڤانە بدۆزێتەوە!؟.

بێگومان زۆر هەن بەو باوەڕانەی کە بۆیان ماوەتەوە، هەموو تەمەنیان بەسەر دەبەن و بێ ئەوەی رەخنەی لێبگرن ، یان وردبینی تێدابکەن، بەمەش دەوترێت ئاینی باو،و یەك لە نوسەرەکان وتوویەتی:((خوایە، باوەڕی پیرێژنێکم پێ ببەخشە)) . ئەم باوەڕە لەوانەیە بەختەوەرییەکی کۆمەڵایەتیت پێببەخشێت، ئێمە داوای ئاین ناکەین بۆ ئەم بەختەوەرییە باوە، بەڵکو داوای دەکەین بۆئەوەی هەست بە بەرپرسییەتی مرۆڤایەتی بکەین،و هاندەری ئەم بەرپرسییەتییە بدۆزینەوە بۆ بەسەربردنی ژیانێکی زیرەکانەی چاك،و دەبێت لەبەرئەم هۆیە بە وردی ئاین بکۆڵینەوە و هەموو کەرەستە رۆشنبیرییەکان بەگەڕبخەین بۆ راژەی ئەو ئاینە.

رۆشنبیری ئایندار پاش چەندین لێکۆڵینەوەی مرۆڤایەتی دوور لەشتە نادیارەکان (غیبیات) ئەو ئاینەی پەیداکردووە،



ئەوە خۆشترین بەرووبومە بۆ خۆڕۆشنبیرکردن... بەڵێ... بەدڵ بیردەکاتەوە، بەمێشکی هەست دەکات، واش رەفتار دەکات، وەك بڵێی ئەو لە پێشکەوتنی جیهان و مرۆڤایەتی بەرپرسە!!. لەوانەیە خوینەر بپرسێت و بڵێت کام ئاینت مەبەستە؟؟

دەڵێم: ئاین کورتەی ئەو رۆشنبیرییە لە تەك تاقیکردنەوەکانی ژیاندا لە ماوەی(٥٠) ساڵ تەمەن و بەرەو ژوور، بەم رۆشنبیرییە و تاقیکردنەوانە، هەڵوێست و ئاراستەمان لە ژیاندا دەبێت و دەبینە خاوەن ویژدان وبینین و بۆچوون،و ئەمەش ئاینە، ئاینیکی باشە گەر زیرەك بووین و لەدەوروبەرێکی چاکدا ژیابووین و رۆشنبیرییەکی مرۆڤانەمان هەبوو. و گەرهاتوو زیرەکیمان کەم بوو و لە دەوروبەرێکی خراپدا ژیابووین و رۆشنیرییەکی نزممان هەبوو دەبێتە ئاینێکی خراپ.

خوینەر پێویستی بە ئامۆژگاریم نییە کە پێی بڵێم لێکۆڵینەوەی ئەو نوسراوە پیرۆزانە بکات کە ئاینەکەی لێوەرگرتووە، لەبەرئەوەی کۆمەڵەکەی داوای ئەم ئەرکەی لێدەکات، بەڵام پێویستی بەلێکۆڵینەوەی نوسراوە پیرۆزە ئاینیەکانی تریشی هەیە، کۆن و نوێیەکان. خوایی و ناخواییەکان، و دەبێت خوێنەر ئەوە بزانێت کە بوزی و کۆنفۆشیۆسی دوو ئاینن(١٠٠٠) ملیۆن مرۆڤ لەئاسیا باوەڕیان پێیانە، کەچی هەردوو ئاینەکە باوەڕیان بە خودا نییە، با خۆمانیش لە لێکۆڵینەوەیان نەدزینەوە لەبەرئەم هۆیە.

لێکۆڵینەوەی ئاینەکان لەسەر بناغەی جیاوازی و ئاژاوەی

رێبـاوەڕی نیـو دەسـتەكانی مەسیحی وئیسـلامی و جوولەكـە دانەنـدراوە، لەبەرئـەوەی ئـەم جیاوازییانـە لـە سـەر نادیـاری دامـەزراوون، و نادیـاریش خـۆتی پێـوە مانـدوو نەكـەی چاكە، لەبەرئەوەی ناگەیە هیچ !! پێوەریش بۆ ئاین ئەوەیە: ئایا ئەم ئاینـە چـەند كۆمـەڵی باشـی بـەرەو چاكە و خێـرو مەردایـەتی بردووە؟!

لەبیریشـمان نەچێت كە بیرۆكـەی ئاینی زۆر بەرزكراوەتـەوە لـەنێو بـیردۆزی گەشـەكردندا. وای لێكـردووین ئاسـۆی ئـاینی هەریـــەكێكمان بۆچـــەند هـــەزار یـــان چـــەند ملیـــۆن ســـاڵ دووركەوێتەوە، ئێمەی گەیاندۆتە ئەو كاتە، وتێمادەگـەێنێت كە سروشـت چ رەنجێكـی جـوانی داوە تـا مـرۆڤ گەیشـتۆتە ئاسـتی ئێستای.

بـیردۆزی پەرەسـەندن بیرۆكەیـەكی پـێ بەخشـیوین، هـیچ ئاینێـــك نەیزانیوە،ئـــەویش رێزگرتنـــە لـــە رووەك و ئـــاژەڵ ، لەبەرئـەوەی پەیوەنـدی پەرەسـەندن هەیە لە نێوانمانـدا، و ئـەو رەنجەی سروشت داوییە تا گەیشتووینەتە ئەم ئاستە، رەنجێكـی هاوبەشـە لـەنێو هـەموو گیانلەبەرەكانـدا. ئێمـە و ئـەوان یـەك خێزانین، سروشت وای لێكردووین زاڵ ببین بەسەر مادەدا، بۆیـە وا چاكە نوسـراوەی (الغصـن الـذهبی)ی (گریـزر) كـە بەداخـەوە نـــەكراوە بـــە عـــەرەبی بخوێندرێتـــەوە، و لێكۆڵینـــەوەی نوسـراوەكانی(ئـەلیوت سمـث) لەسـەر بـاوەڕە سـەرەتاییەكانی میســـری بكرێـــت و ئـــەو نوســـراوانە، ســـەرهەڵدانی ئاینـــە سەرەتاییەكانمان بۆ ئاساندەكەن.



لەتەك نوسراوە پیرۆزەكانـدا، دەبێت لێكۆڵینـەوەی نوسـراوە مەزنـەكانی وێـژەو فەلسـەفە بكـەین، و لێكۆڵینـەوەی بـیردۆزی زانستی نوێ بكەین، و موسڵمان دەبێت لێكۆڵینەوەی ئینجیل و تـۆڕات بكـات... وجولەكـە و مەسـیحیش دەبێـت لێكۆڵینـەوەی قورئـان بكـەن، لەبەرئـەوەی ئـەم(٣) نوسـراوەیە هۆكـاری گـەورەی دروستبوونی ویـژدانی مرۆڤایـەتین، دەبێت لێكۆڵینـەوەی ئەوانـە بكـەین كـە بـەكافر ناویـان دەبـەن، و لەوانەیـە ئـەم كفـرە بـاوەڕ بسـەلمێنێت، زۆر ئـەو وتـەی (الفرێـد نوسـی)م خۆشـدەوێت كـە دەربارەی(ڤۆڵتێر) نوسیویەتی. (ئەلفریدنوسی) كاسـۆلۆكی بوو بـاوەڕی بـە مەسـیحیەت هـەبوو و رێـزی لـە كەنیسـە دەگـرت، (ڤۆڵیتر)یش دژی كەنیسەی كاسۆلۆكی بوو.(ئەلفرید) بە(ڤۆڵتێر) دەڵییـت:(( تـۆ مەسـیحییەكی باشـی)) ئەمـەش راسـتە، لەبـەر ئەوەی (ڤۆڵتێر) دژ وەستانی بەرامبـەر بە كەنیسـە لـەو چەرخەدا راژەی مەسیحییەتی كرد.

لێكۆڵینـەوە لەگـەڵ زیرەكییـەكی رەسـەن نابێـت زیانبـەخش بێت، بۆیە دەبێت میوانداری چاكی (ڕا) نوێیەكان لـەنێو بیرمانـدا بكەین، پاش هەموو ئەم لێكۆڵینەوانە، لەوانەیە وەك برناردشۆ بڵێین:(( مرۆڤی بێ ئاین ، مرۆڤێكی نامەردە)) و لێرەدا مەبەست لەئاین مرۆڤایەتییە،واتا( مرۆڤی نامرۆڤانە، مرۆڤێكی نامەردە).. هـەن لـەژێر گومبـەتی بـاوڕ و لاسـاییكردنەوەدا دەژیـن، و دوورن لەئاسۆی زانیارییەوە، و خۆیان لەنێو نادیاریدا نوقوم كردووە، و نـازانن ئـازادی مادەكـان و هـەوا خۆشـەكەی چـییەو چـۆنە!! سەرەخۆشی لە وانەدەكەم و گریانم بۆیان دێت!؟.

پێم باشە بە کورتی جیاکاری نێوان زانست و وێژەو فەلسەفەو ئاین باس بکەمەوە کە دووبارەشن:-

١- زانست بی لایەنە، بەشوێن چییەتیدا دەگەڕێت،و بەشوێن بەهادا ناگەڕێت و بابەتییە .

٢- زانست جیاکاری لەنێوان راستی و وازانیندا (وهم)دەکات، بەڵام جیاوازی لەنێوان حەق وناحەقدا ناکات، واتا لەنێوان دادەوری وستەمدا.

٣- زانست شێواز دیاریدەکات، بەڵام مەبەست دیاری ناکات، لەبەرئەوەی مەبەستی نییە.

٤- ویژە و فەلسەفە و ئاین مەبەست دیاریدەکەن.

٥- نمونەش زانست فڕۆکەی داهێنا،و چییەتی ئامێرەکانی روونکردەوە، بەڵام ئاین مەبەستی رووندەکاتەوە..ئایا بۆکوشتنی مرۆڤ و وێرانکردنی شار بەکاردێت، یان بۆ نزیککردنەوەی گەیاندن و یەکگرتنی مرۆڤایەتی لەسەر ئەم زەوییە.

٦- لە زانستدا، زانیاری دەدۆزینەوە، بەڵام لە وێژەو فەلسەفە و ئاییندا دانایی دەدۆزینەوە.

٧- وایە زانیاری دانایی رووناک دەکاتەوە، بەڵام دانایی زانیاری بەکاردەهێنێت بۆ راژەکردنی مرۆڤ.



( ٤١ )

## لێکۆڵینەوەی هونەرەکان

هەموو هونەرەکان بینینن، یان رەفتارن، بەو شتە سروشتیانە بەرزدەبنەوە کە بۆمان ماوەتەوە، رۆیشتن لەسروشتەوەیە، سەماکردن لە هونەرەوەیە، لەبەرئەوەی لە جولانەوە و رۆیشتنەوە بەرزبووینەوە بۆ لێدانی مۆسیقا لە سەماکردندا.

ئێمە باسی قسە دەکەین، بەڵام کە ئەم قسانە دەگوازینەوە بۆ شیعر، ئەوسا هەست بە جوانییەکەی دەکەین. ئەو جوانییەش هونەرە ، هونەر دەربرینی مرۆڤایەتییە لەسەر هەستپێکردنی گیانی، بۆیە فەلسەفە و ئاین بەهونەری مرۆڤایەتی دادەندرێن. بۆنموونە ئێمە دەتوانین بە ژمارە و کیمیا و فیزیا بەمادی سەیری گەردوون بکەین، ئەمە هونەر نییە. بەڵام کە بەهونەری سەیری بکەین دوور لە ژمارەو کیمیا و فیزیا،و بەمانای شیعر و موسیقا، فەلسەفەوئاین دەبینین.

هەموو مرۆڤێك ئارەزوو و حەز و سروشتە و چنوکی هەیە، دەتوانین ئامانجی مادی هەموویان بزانین، ئەوسا بۆ ئێمە هەندێك هونەری تێدایە.. ئێمە کە برسیمان دەبێت و حەزمان دەچێتە خواردن. یان کە هەست بەئارەزووی سێکس دەکەین،

یان کە حەزمان دەچێتە موڵکداری، یان کە ملکەچی ترس دەبین، لەهەموو ئەم شتانە لەوانەیە بەرەفتارێکی مادی بڕۆین و ناگەینە زانین ویژدانی گیانی.

مرۆڤ کە لەداستان هاتە دەرەوە، ئێتر باوەڕی بەمادی نەما، و دەکرێت بڵێین مێژووی شارستانییەتی مێژووی گواستنەوەیە، یان پەرەسەندنە لەبینینی مادییەوە بۆ بینینی گیانی، سفرەی رازاوە خۆشییە بۆ دەروون، وەك خۆشییەکەی بۆ گەدە، وبەئامرازە هونەرییەکان وگوڵ وگوڵزار و قاپی جوان وقسەی دانیشتووەکانی تێر دەبین، هەروەها خانوو تەنها بۆ پاراستنمان لەسەرما وگەرما نییە، بەڵکو بە شمەکە نایابەکانی نێو خانووەکە چاومان تێردەکەین، و دەروونمان چێژ وەردەگرێت.

حەز لەسێکس کردن گەر هەر لەئاستی مادیدا بمێنێتەوە، ئەوا دوورە لە هونەر... مرۆڤیش باوەڕی بەمە نەهێنا، و خۆی لەبینینی مادی بەرزکردەوە بۆ بینینی گیانی. بۆیە لە حەزەوە خۆشەویستی دروست بوە، و مێژووی مرۆڤیش پڕە لە چیرۆکی خۆشەویستی دەیخوێنینەوە و وەك شعریش دەیڵێینەوە، و وەك دوعاکانی ئاینی لێهاتووە.

لەم چەرخەدا کامێرای فوتۆگرافیمان دیت، وێنەکانمان بەشێوازێك وبینینکی مادی بۆ دەگوازێتەوە، لەو وێنانەدا مانایەکی گیانی تێدا نییە، و ئەمەش ئەو جیاوازییە لەنێوان ئەو وێنەی کە وێنەکێش دەیکات، و چ مانایەکی گیانی تێدادەکات، لەتەك وێنەی فوتۆگرافی لاڵ...



مرۆڤی زانستی مادی سەیری بیرێك دەکات، دەگەڕێت بە شوێن ئەوەی کە ئایا ئەم ئاوە سازگارە یان شۆڕە. بۆ خواردنەوە ئەشێت یان نا؟؟ کەچی مرۆڤی هونەرمەند وێنەی تیشکی رۆژی سەرئاوەکە و تێشك دانەوەی و رەنگە جوانەکان وێنە دەکێشێت.

شارستانییەتی جیهانی بریتیە لە کۆمەڵێك هونەر کە چێژ پەروەردە دەکات و هەست بە خۆشی گۆرانی دەکات بەبینینی ئامێرەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان. گەر شارستانییەتی سووك بووئەوا هونەریش سووك دەبێت، و دەبێتە جۆرێك لە پیشەسازی، کە تەنها بۆ پەیداکردنی بژێوی بەکاردێت. ئەوسا دادەبەزینە ئاستی تەنها پێویستەکان، و ژیانیش هەربۆ مانەوە دەبێت، وەك ژیانی جوتیارێکی هەژاری هەناسە ساردی لێدێت.

هونەر فولکلۆری شارە، قەتیش فولکلۆری دێ و لادێ نەبووە، فولکلۆری رۆشنبیری هونەر زۆرکەم وبچوکە، عەرەب لەبیاباندا ژیاوە ونەیزانیوە بیناسازی و پەیکەرسازی و وێنەکێشان و پیشەسازی شار چییە!! لەئەوان هەر شیعرمان بۆماوەتەوە،ئەو شیعرەی کە زۆر گوێ دەداتە دێڕو دوو نیوە دێڕ لەسەر ژمێرەی مانای شیعرەکە.

ئەو ئاڕاستە هونەرییانەی کەئێستا لە میسردا هەمانن، هەموویان دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی نوێ و بۆ ئەو نوێکارییەی کە هونەرمەندە میسرییەکان لەوێنەکێشان و تەلارسازی و پەیکەرسازیدا کردیان، و هیچ نوێکارییەکمان لە گۆرانی وتندا نییە... لەوێنەکێشان و تەلاسازی و پەیکەرسازیدا هەندێك

سەرکەوتوو بووین، لەبەرئەوەی لاسایی ئەوروپامان کردەوە، هەروەك لەم بارەیەوە فولکلۆرمان نەبێت. کەچی لە گۆرانی وتن و مۆسیقادا سەرنەکەوتین، وگەر ملکەچ باین لەئەوروپاییەکان فێرە ڕێسای ئەو دوو هونەرە دەبووین و شۆڕشمان تێدا دەکرد.

ئەوەی باسی لێوە دەکەین، ئەوە دەگەێنێت کە نوسراوە ئەوروپییەکان بکۆڵینەوە وشارو مۆزەخانەکانیان ببینین، لەبەرئەوەی مەبەستی هونەر لە کۆتاییدا ئەوەیە کە ژیانێکی هونەری بژین، و بەشتی جوان گیان و دڵمان لێبدات، بۆیە دەبێت پەروەردەی هونەری بەردەوام بۆ بەرزکردنەوەی حەزەکانمان بکەین، و خۆمان فێرە بینینی ئاینی و فەلسەفی بکەین بۆ کاروباری ئەم جیهانە، بۆئەوەی ژیانمان بکەینە قەسیدەیەکی زۆر جوان، نەك بیکەینە قسەو قسەلۆکی بێ کەڵك و بێ مانا!!..

ناتوانم ئامۆژگاری خوێنەر بکەم کە لەم بابەتە چ نوسراوەیەك بە زمانی عەرەبی بخوێنێتەوە، جگە لە نوسراوەی خۆم کە بەناوی( اشهر الصور)ە، کە زۆر بەکورتی نوسراوە و کەمی سوود لێوەردەگیرێت، وەك مشتێکە لە خەرمانێك بەرامبەر بە نوسراوە ئەوروپاییەکان.

ئەوەی حەزی لە هونەرە، باسەردانی مۆزەخانەوپێشانگەکان بکات، رامان و لێکۆڵینەوەی تێدابکات، لەمەش زیاترم پێ ناوترێت.

مەبەستی هونەر پاش هەموو شتێك ئەوەیە، کە ژیانێکی هونەری بژین، و لەژیان و زانیاری و رەفتارو رەوشتماندا با هونەرانە بژین، و لەژیانێکی بایەلۆجی پێویستەوە بەرزببینەوە



بۆچێژ لێوەرگرتنێکی شارستانییانە.

( ٤٢ )

## باتێکۆشانی رۆشنبیریمان هەبێت

هەموو رۆشنبیرێك، دەبێت تێکۆشانی هەبێت، لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوە پێویستی بە (هاندانە)لە سۆزی دیار و نادیاردا بۆ پاڵنانی بەرەو رەنج و بەردەوامبوون، ئەم هاندانە بەپێی ژینگەو خوێندن وکەس، بەهێز و لاواز دەبێت، سۆزی زانین پاڵمان پێوە دەنێت بۆ خوێندنەوەی رۆژنامە، و کە نوسراوەیەك دەکۆڵینەوە مەبەست خۆ ئامادەکردنە بۆ گەیشتن بە ئامانجێك. پزیشك نوسراوەیەك لەسەر نەخۆشییەکان دەخوێنێتەوە، من نایخوێنمەوە!! ئەو پاڵنەرەکە دەدۆزێتەوە، من ئەو پاڵنەرەم نییە، لەوانەیە ئەز نوسراوەیەك لەسەر سایکۆلۆجی بخوێنمەوە و یەکێکی تر نەیخوێنێتەوە.

هەریەکێك لە ئێمە پاڵنەرێکی هەیە بۆ لێکۆڵینەوە، جار هەیە پاڵنەرەکە ئەوەندە بەهێز دەبێت، وا لە خوێنەر دەکات کە کۆشش بکات...ئەوسا ئەم تێکۆشانە دەرگای لێکۆڵینەوەی بۆ دەکاتەوە بە درێژایی ژیانی.

ئەو لاوە میسرییەی کە لەنێوان(١٩١٨-١٩٤٣) دا ژیاوە، و ئاگای لە جووڵانەوە نیشتمانییەکە بووە و تێکەڵی بووە، بووە

بەتێکۆشەر بۆ نیشتمانەکەی و داوای سەروەری و ئازادی بۆ دەکات، ئەم تێکۆشانە وای لێکردووە لە لێکۆڵینەوەدا نەپچڕێت، بەردەوام بێت لەقسەکردن و خوێندنەوەی ڕۆژنامەو لێکۆڵێنەوەی نوسراوەی پەیوەندار بەسەروەری و ئازادی و داگیرکردن و دەستور و ئیمپراتوریەت و قۆستنەوەی میللەتە بچووکەکان و تەڕنی پادشا و ئەمیرو وەزیرەکانی کەدژ بەنیشتمانییەتی ، بۆیە بیر لە لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەمەریکا دەکاتەوە، کە چۆن سەروەری بەدەستهێنا.... لە بنەماکانی شۆڕشی سۆڤیت دەکولێتەوە، بەڵکو هەموو شۆڕشەکانی تر و سۆزی بۆ جولانەوەی هیند بەسەرکردایەتی گاندی و نەهرۆ دەجولێت،و ناچار دەبێت بچێتە نێو ئابوورییەوە، و چین ئەو فێڵە داراییانەی کە نیشتمانی ئێمەیان لەڕووی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە وێران کردووە؟... ڕۆژنامە بەوردی و تاقیکردنەوەو بەدواداچوون دەخوێنێتەوە، و جولانەوەی نیشتمانی ئاراستەی دەکات بۆ هەڵبژاردنی ئەو نوسراوانەی کە پێویستن بخوێندرێنەوە.

تێکۆشانی سیاسی ، پاڵت پێوەدەنێت لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر بکەیت بۆ ویستی سەروەری ، تێکۆشانیش جۆراوجۆرو جیاوازن، بۆنمونە ....ژن هەیە هەولی قەدەغەکردنی مەی دەدات... و ژنیش هەیە هەولی یەکسانی لە ماناکانی شارستانی و ئابووری لەگەڵپیاودا دەدات، لاو هەیە بانگەشە بۆ هاوبەشییەتی دەکات،و هەشە بۆ جوتیار تێدەکۆشێت، هەموو ئەوانە پاڵنەری خۆیان هەیە بۆ



لێکۆڵینەوەو زیادکردنی ڕۆشنبیرییەکەیان، ئەوەندەی پەیوەندار بێت لەگەڵ بابەتەکانیاندا. هیچ بابەتێك نییە سەربەخۆ بێت، بانگەشەکردن بۆ یەکسانی نێوان نێرومێ، لکاوە بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و فسیۆلۆجی و ئاینییەوە، ئەوەی هەولْ بۆ ئەمانە بدات پێویستی بە لێکۆڵینەوەی قووڵ و وورد هەیە،و لەهەمان کاتدا خۆی سوود لەو لێکۆڵینەوانە دەبینێت ، و جولانەوەکەشی سوود لەو وەردەگرێت.

بۆ نموونە سەیری لاوێك بکە کە هەولْ و تەقەلای دابێت بۆ کۆمەڵێکی هاوبەشییەتی، ئەیبینی، تێکۆشانەکەی پاڵی پێوە ناوە بۆ لێکۆڵینەوە بەدرێژایی ژیانی و بێ دابڕانیش. ئەوسا مێژووی مرۆڤ دەبێتە هەندێك لە بابەتەکانی و ئابووری پیشەسازی و کشتوکاڵ و ڕەوشت و ئاین و داگیرکەرو جەنگ وئیمپراتۆرییەت و تۆپ وجینەکان، ئەمانە هەر هەمووی دێنە نێو مەیدانی لێکۆڵینەوەکەی، ئەویش بەم لێکۆڵینەوانە پێشدەکەوێت،و بە چاوێکی زانستی و فەلسەفی سەیری کۆمەڵ دەکات.

لەم چەرخەدا جیاوازییەکی یەکجار زۆر دەبینم لەنێوان لاوێك نەزانێت هاوبەشییەتی چییە، لەگەڵ لاوێك لێکۆڵینەوەی کردبێت، لاوی یەکەم ڕووداوەکان بەبێ مانا لەپێشییەوە تێپەر دەبن، کە چی لاوی دووەم ماناکانی دەزانێت،و پاش ئەوەش چی دەبێت دەیزانێت، لاوی یەکەم بەدەگمەن کتێبخانەی هەیە،و لەوانەشە ڕۆژنامەش نەکڕێت... کەچی لاوی دووەم

دەزانێت خوێندنەوە چ کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر بیرکردنەوەکەی. لاوی یەکەم وەك بینەر سەیری رووداوەکان دەکات ... کەچی ئەوەی دووەم بە جووڵانەوەی مێژوو سەیری رووداوەکانی ئێستا و ئاینده دەکات.

ئەتوانم بڵێیم هەموو رۆشنبیرێکی باش دەبێتە هۆی جۆرێك لە جۆرەکانی تێکۆشان، و رۆشنبیری خراپیش هیچ تێکۆشانێکی بەدواوە نییە، لەبەرئەوەی رۆشنبیری چاك کە پەیوەندی بە کۆمەڵەوە هەبێت، پێش کۆمەڵ دەکەوێت بە مەودایەکی کورت یان درێژ، و لەبەر ئەم هۆیە هەوڵی گۆڕان دەدات، و نمونەی نوێمان بۆ دەهێنێتە کایەوە، وا لە حەزمان دەکات هەوڵ بدەین بۆ وەدیهێنانیان، لەئارەزووی گۆڕاندا هەست بە تێکۆشان دەکەین.

بەهایەکی تری تێکۆشان لەرۆشنبیریدا ئەوەیە، کە کەسیەتیمان گەورە دەکات، وامان لێدەکات هەست بەبەهای مێژوویی خۆمان بکەین، واتا پەیامیکمان هەیە بیگەیێنین، و داوای چاکسازییەك دەکەین، و فەلسەفەیەکی ئاراستەکەرمان پێدەبەخشێت، کە هەموو لاوێك لەم چەرخەدا پێویستی پێیەتی، ئێمەش بەم تێکۆشانە، بەسەر بەرزی دەڕۆیین، و کەسیەتیمان لە لووتکەدایە و ژیانێکی مێژوویی دەژین.

من ناتوانم کام تێکۆشان بۆ خوێنەر هەڵبژێریم، لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤێك ژینگە و بارودۆخ و ئامادەیی تایبەتی خۆی هەیە ، لەوانەیە خوینەری میسری داوای چاکسازی لە زمانی عەرەبیدا بکات، یان حەز بە گشتاندنی پیشەسازی کیمیاوی



بکات، یان سەرەتا هاوبەشییەتیەکان بڵاوبکاتەوە، یان دەستبڵاوی لەجیابوونەوە و هاوسەری نەهێڵێت، یان زاوزێ سنووردار بکات، هتد..

واتا هەر خوێنەرە خۆی دەتوانێت کام جۆرە تێکۆشان هەڵدەبژێرێت، و چەند دەگونجێت لەگەڵ ژینگەکەی، و توانای چەندە لەسەری. ئەوەی من لێرەدا بڕیاری لەسەر دەدەم ئەوەیە کە تێکۆشان هاندەرێکی مەزنە بۆ لێکۆڵینەوە، و ئەمەشم لە تاقیکردنەوەکانی خۆمدا دیت.

بیرمە ساڵی(١٩٣٠) کۆمەڵەی (المصری للمصری)یم دامەزراند، داوای ئەوەم دەکرد کە میسری کەلوپەلی میسری بکڕێت، یان هەر نەبێت بیانی نەیفرۆشێت. بۆئەوەی ئاستی ئابووری میسرییەکان بەرزبێتەوە، و هانی کارگەکانمان بدەین بۆ بەرهەم هێنان، و وامزانی هەژاری هۆی هەموو کێشەکانمانە، و ئەو نەتەوەیەی پیشەسازی هاوچەرخی نەبێت نەتەوەیەکی دواکەوتووە، زۆریش سەرم دەسوڕما کە لاوێکم دەدیت، و دەهاتەلام، و لیستی ئاماری خواردن و کۆتاڵی هاوردەی بیانی بۆ دەهێنام، کە دەتواندرا لە وڵاتی خۆماندا دروست بکرێن، ئەم تێکۆشانە بۆ پیشەسازی میسری هانی ئەو لاوە دەدات بۆ لێکۆڵینەوەی ئابووری میسری بە هەموو جۆرەکانیەوە.کە خۆم بەبیردێتەوە، دەبینم هەموو ئەو بابەتانەی کە لێمدەکۆڵینەوە شێوازی تێکۆشانی تێدابو.. ئەو لێکۆڵینەوانەی کە پەیوەنداربوون بە حەزەکان و بیرم و کێشە دەروونییەکانم...پێویستیم بەشیکردنەوەیەکی قووڵ هەیە،

بۆئــەوەی بــزانم ئــەم بایەخدانــەم بەرۆشــنبیری لــەچ کــون و کەلەبەرێکەوە دەهاتە دەرەوە...

ئێستا دوو رووداو دێنە یادم، کە کاریگەرییەکی زۆریان هەبووە لەسەر دەروونم ... تەمەنم (١٨) ساڵ بو و رووداوی (دنشواي) روویدا یەك حەفتە وەك رۆژوەوان وابووم و نانم نەخوراد... و رووداوی دووەم، کە زۆر نیگەرانی کردم، ئەوەبوو لە تەمەنی (١٩يان٢٠) ساڵیدا لەپاریس بووم، لەگەڵ چەند فەرەنسییەك دانیشتبووین بەقسەی خۆش، و خواردنەوە کاتمان بەسەردەبرد، و وتوێژمان گەیشتە سیاسەت، یەکێکیان زۆر بە تۆڕیی و سووکییەوە بە منی ووت: تۆ مافی ئەم وتووێژەت نییە، ئێوە نەتەوەیەکی نزمن و ئینگلیز گەورەتانن.

قسەکەی ئەو راست بوو دانشتوانی ئەو شوێنە زۆر لەو فەرەنسییە توڕەبوون، و منیش زۆر توڕە و خەمبار بووم، و سۆزی ئەوان بۆمن زۆر ناخۆشتربوو لە جوێنی ئەو فەرنسییە...ئەو شەوە زۆر گریام و دواتر چەندین جار چوومە لای پزیشك. بەهۆی ئازاری ریخۆڵەمەوە خوێن دائەنیشتم... نەخۆم و نەپزیشکەکە نەمانزانی هۆیەکەی ئەم نەخۆشییە چییە.... وابزانم ئەو پزیشکە لەو کاتەدا باوەڕی بەوە نەبوو کەچۆن لاوێکی وەکو من خەموخەفەتی نیشتمانییەتی ریخۆڵەی ئەوها دادەڕزێنێت؟؟

کەسەیری نوسراوەکانم دەکەم، دەبینم هەر هەموویان لە خاڵی نیشتمانپەروەری و نەهێشتنی داگیرکەردا هاتوونە دەرەوە... لێکۆڵینەوەی بایەلۆجی و لقەکانی، هەر حەز کردن



نەبوو لە زانست، بەڵکو چاکسازی بوو بۆ نەهێشتنی ئەفسانەی باوەڕی. بۆ ئەوەی میسر ببێتە نەتەوەیەکی میسری، و ئەمەش بۆ خوێنەر لە نوسراوەی (التطور)مدا زۆر روون و دیارە.

ناڵێم ئەو روونکردنەوەیە زۆر جێی باوەڕە... بەڵام ئەم دوو رووداوە هانی تێکۆشانی دام بۆ رۆشنبیریم. بەهەر حاڵ ئەڵێم.. من پادشایانە نەژیاوم و هەموو لێکۆڵینەوەکانم بە تێکۆشان بوو... و لەم تێکۆشانەش زەوی بەپیتم دۆزییەوە بۆ رۆشنبیری وبیرکردنەوەمی فراوانکرد، و پەندیش لەمە ئەوەیە:-

رۆشنبیری وەك بینەر و بێلایەن بەکارناهێنین ... بەڵکو وەك تێکۆشەر و هاوبەش بەکاریدەهێنین...

( ٤٣ )

## نوسراوەی هێمایی و نوسراوەی تۆوەکی

دانەری زۆر هەن لەسەر فەلسەفە و وێژە و زانست دەربارەی پزیشکی و کیمیا و گەردوونیان نوسیوە، و لەچەرخی جۆراوجۆردا ژیاون، (٢-٣) هەزار ساڵ لەمەوپێش. ئێمە کە نوسراوەکانیان دەخوێنینەوە بۆ سوودوەگرتن نییە، بەڵکو دەمانەوێت لەو چەرخانە بگەین کە ئەوان تێدا ژیاوون، بۆیە ئەوان هێمای چەرخەکانیانن... واتا بەهایان هێماییە.

نوسراوەی (الحيوان)ی(الدريمی) یان (الانطاکی

الطبية)و(طبقات الاطباء)ی(أبن أبی أصيبعه)، ئەو سێ نوسراوەیە سوودی پزیشکی و بایەلۆجی نییە، لەبەرئەوەی یان ڕاست نییە، یان لێڵە و پڕە لەئەفسانە، بەڵام ئەوسێ نوسراوەیە لاپەڕەکانی مێژوومان بۆ هەڵدەدەنەوە، و بەهۆیانەوە دەزانین باری ڕۆشنبیرییان و بگرە باری کۆمەڵایەتیشیان چۆن بووە.

بۆیە نابێت ئەگەر نوسراوەیەك پڕبوو لە ئەفسانە نەیخوێنینەوە، یان بڵێین زانیاری ئەو نوسراوەیە پێچەوانەی تەندروستییە، لەبەرئەوەی ئەو نوسراوەیە هێمای ئەو چەرخ و ئەو نەتەوەیەیە کە نوسەرەکە تیایدا ژیاوە، یاساکانی حامورابیو بابلیو دوعاکانی ئەخناتوونی میسری، باری کۆمەڵایەتی میسرو بابلی پێش(٣٠٠٠) ساڵ زیاترمان پێشاندەدەن...نوسراوەی(رحله أبن بطوطة) بەئەفسانە ڕازاندوویەتیەوە ، بەڵام کە ئەو نوسراوەیە لەسەدەی (١٣)ەم داندرا بێت، بەنوسراوەیەکی باشی ئەو سەردەمە دادەندرێت کە باسی نەتەوەکان دەکات. لەنێو بەندەکانی ئەو نوسراوەیەدا باری کۆمەڵایەتی مەغریب تادەگاتە ئەوپەڕی چین دەبینین... و نوسراوە کۆنەکان لەسەر مێژوو، وەك نوسراوەی (مصر)ی (البغدادی) و(هیرۆدۆنس)و(بلوتارك)و (الطبری) یش دەبێت بخوێندرێنەوە.

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا نوسەرکانی ڕۆژئاوا یان ئەوروپییەکان نوسراوەکانیان پڕن لەبابەتی کەم بەها، بەڵام ئەو بابەتانە وەك ڕێبازێکی تویژینەوە و سنوری زانیاری بەهایەکی هێمایی ئەو چەرخەیان هەیە، ئێمە لەوانەوە دەزانین ڕۆشنبیری



سەدەی(٣و٤) زایینی بایەخی بە چیداوە، و بەوەش دەزانین عەرەب چۆن پزیشکی بەکارهێناوە سەرەڕای ئەوەی کە توێکاری لاشە حەرام بووە، بەو نوسراوانەش دەزانین کە چۆن تا ئەم دواییانەش داستانیان تێکەڵ بەراستییەکان کردووە لەرووەكو ئاژەڵدا.

خوێنەر نابێتە ڕۆشنبیر گەر نەزانێت بەهای ئەم چەرخە لە زۆرانبازییە زانستییەکاندا چینو ئەو چاڵە گەورەیەی کە بیری مرۆڤایەتی کەوتبوە ناوی، هەر لەوتوویژی ئاینی نەزۆك و توێژینەوەی نادیاری ترۆ لەسەدە تاریکەکاندا، و هەروەها داستانەکانی کیمیاو فیزیا و سەرهەڵدانی مرۆڤ... و هتد.

جۆرێکی تری نوسراوە هەیە پێی دەڵێین نوسراوەی تۆوەکی، مەبەستیشمان ئەو نوسراوانەیە کە کاریگەرییان لە دەروونماندا وەك کاریگەری تۆو وایە لەنێو خاکێکی بەپیتدا، بەڵکولە تۆویەکەش زێترە، لەبەرئەوەی سەرەڕای پێگەیشتنی، هێزی ترشاندنیشی هەیە، واتا شتی دیکەش پێدەگەیێنێت..

نموونەی ئەو نوسراوانەش(أصل الانواع)ە لەبیردۆزی پەرەسەندندا... خوێنەری ئەم نوسراوەیەش هەر توێژینەوەی تێدا دەبینێت، توێژینەوەیەکی ساویلکانە لەپەروەردەی مرۆڤ بۆ ئاژەڵ، و پەیوەندی ئاژەڵیش بەو ژینگە سروشتییەوەی کە تیایدا دەژیت، دواتریش دەرئەنجامێکی روونمان دەداتێ کە هەموو ئاژەڵەکان لەیەك نەژدان، یان چەند نەژادێکی زۆر کەمن، بەڵام سەرەڕای ساویلکەیەتیەکەی، لەمیژووی مرۆڤایەتیدا نوسراوەی ئەوها دانەندراوە کە توانبێتی بەم جۆرە ئاڕاستەی

رۆشنبیری بگۆڕێت. هەموو ڕێباوەڕە فاشی و شیوعی و هاوبەشییەتی ودیموکراسییەکان لێیان وەرگرت، و کاریکردە هەموو زانستەکان، تا وای لێهات بیرۆکەی پەرەسەندن گشتی بێت، ومێژووشی لە چەند هەزار ساڵێکەوە گواستەوە بۆ هەزار ملیۆن ساڵ، بەم ئاڕاستەیە گەڕاین بەشوێن بنەماکانی مرۆڤایەتی و ڕەوشت و کۆمەڵ و ئاینەکاندا، بەچاوکراوەیی ئەگەڕێن بەشوێن ئایندەی مرۆڤدا نەك بە کوێری. لەبەرئەوەی رابردوومان بۆ روون بوە، و ئایندەشمان بۆ رووناك دەکاتەوە، ئەم بیرۆکەیە هەستی ئاینیمانی زێترکرد لەبەر هاوبەندیمان بە گەردوونەوە، هەروەها هەست بە خزمایەتیەکی پەرەسەندوو دەکەین لەگەڵ ئاژەڵو رووەکدا، جگە لەوەی کە هۆیەکی بایەلۆجی دەبینینەوە بۆ برایەتی مرۆڤایەتی. ئەم بیرۆکەیە، وەك رایەك هاتەکایەوە، ودواتریش بوو بە باوەڕو ڕێباوەڕ، و ئێستاش بۆتە لۆجێکی بیرمەندەکان بەگشتی.

لەنوسراوە تۆوەکیەکانی تر، بەرهەمەکانی(جان جاك رۆسۆ)ن... کە کورتەکەی ئەمەیە:سروشتی مرۆڤایەتی چاكو باشە، و ئەوەی لەنێوانمادا خراپ بێت، ستەمی پادشا و حکومەت و نەریتی کۆنە، ئەم بیرۆکە ساویلکەیەش هەوێنی زۆری دروستکردوو، وتائێستاش کۆمەڵەکان بەکاریدەهێنن و دەیجولێنن، و دەکرێت هۆی کودەتای روسیا بۆئەم بیرۆکەیە بگەڕێتەوە. بەگوێرەی (جودین)و(ئوین)و(یرودۆن) و هەڵگرەکانی ئالای هاوبەشتییەتی (تۆبۆی) پێش دەرکەوتنی(مارکس) کەداوای هاوبەشییەتی زانستی دەکرد.



لەم چەرخەدا، دیاردەی چالاکی کۆمەڵایەتی زۆر هەن دەگەڕێنەوە بۆ جان جاك رۆسۆ... مەلەکردن لەرۆخی دەریادا و پیاسەکردن لەلادییەکان، و جوڵانەوەی پێشکەوتووەکان و پشتبەستن بە چارەسەری سروشتی و جوڵانەوەی رووتی، ئەمانەو شتی تریش دەگەڕێنەوە بۆ بیرۆکەکەی (رۆسۆ) کە دەڵێیت: ئەوەی لە سروشتدا هەن، چاکنو نەریتی کۆمەڵایەتی خراپن...

لەنوسراوە تۆوەکیەکانی تر، نوسینەکانی(**فرۆید**)ە، کە شتە نادیارەکانی دۆزییەوە وەك بیری ناخ، و بۆی روونکردینەوە کە چالاکی بیرمان دەگەڕێتەوە بۆ بزوێنەرە شاراوەکانی حەز و ئارەزوو. سایکۆلۆجییەتی نوێ، سەرەڕای زۆر یەك لەیەك نەچووەکانی، دەگەڕێتەوە بۆئەم دۆزینەوەیە.

نوسراوەی(**رأس المال**) ی( **کارل مارکس**)، ئەو هەوێنەیە، کەکۆمەڵانی ئەوروپایی دەجولێنێتەوە لەنێو نەرمونیانی پەرەسەندن، یان توندوتیژی جەنگەکان ...ئەی خوێنەر: باوەڕ بکە، ئەو مرۆڤەی نرخ و بەهای ئەم نوسراوەیە نەزانێ مرۆڤێکی نەخوێندەوارە..واتا لە تێگەیشتنی رۆژنامەش کە هەواڵی پێدەگەێنێت نەزانە...(کارل مارکس) هەوڵی بۆ هاوبەشییەتیدا، لەوانەیە خوێنەر قینی لەم ڕێباوەڕە بێتەوە، سەرەڕای ئەم قینەش ناتوانێت واز لەشیکردنەوەی مارکس بێنێت، یان واز لە بیردۆزی لێکدانەوەی ئابووری بۆ مێژوو بهێنێت.

ئێمە لە میسردا لەوە گەیشتووین، کە سێ کووچکەی نەخۆشی و نەزانی و هەژاری بوونمانی وێرانکردووە، و کە

"کارل مارکس"مان خوێندەوە زانیمان تەگەرەی ئینگلیزەکان بۆ پیشەسازیمان دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی پیسەشازی ئینگلیز لە لێکدانەوەی مارکسییەتدا، بێ لێکدانەوەی مارکس، لەدووەم جەنگی جیهانیش ناگەین.

کورتەی ئەم بەندە ئەوەیە کە بایەخدان بەنوسراوە بدرێت. گەر بەهای هێمایی بۆ ئەو چەرخە و ژینگەیەی کە تیایدا سەریهەڵداوە هەبێت،و بگرە گەر نوسەرکەش بلیمەت نەبوو. لەبەرئەوەی نوسراوەی ئەوها، گەرهاتوو ئەفسانە وشتی هیچ وپووچیشی تێدابوو دەتباتە نێو ئەو دەوروبەرەی کە دانەرەکە تێدابووە.

لە نوسراوەی هێمایی گرنگتر، نوسراوەی تۆوەکییە کە هەوێنی چالاکی رۆشنبیری گشتییە. باسی چوار لەو دانەرەمان کرد، کە(داروین و رۆسۆوفرۆید و مارکس)ن بیری رۆشنبیرانە، کە ئاواتی پێڕەو و پاکی دەروونییە، لە تێگەیشتنی کیشەکانی مرۆڤایەتی هاوچەرخ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ئەو چوارە، وبگرە لەوانیش زیاتر هەیە...

وە بیرهێنانەوەی ناوی نوسراوە زۆر بەمانا نییە وئەو رەچێتەیەش نییە کە خوینەر سوودی لێوەردەگرێت... ئێمە داوای نوسراوە دەکەین ، وەك داواکردنمان بۆ خواردن و دەرمان، بۆیە یەك لەیەك جیاوازین، هەربۆیە، دەڵێم بنەمای رۆشنبیری بایەخدانە، کە دەتوانین بەبارێکی دەروونی دابنێین، بارودۆخی شوێنوکات پێویستی کردووە، ئەم بایەخدانەش دەبێتە هاندەرێکی رەسەن، وا لەو لاوە دەکات تێبگات و



هەوڵبدات زێتر تێبگات، و هەر ئەم بایەخدانەشە ناوی نوسراوەو بابەتەکانی بۆ دیاریدەکات.

( ٤٤ )

## تۆوی رۆشنبیریم

مافی خوینەرە بپرسێت تۆوی رۆشنبیریم چی بوو کە بایەخم پێدابوو و پێمەگەیاند و رێگای ژیانی پێشاندام. و لەوانەیە کە ئەم نوسراوەیە دەخوێننەوە، لەگەڵ خۆتان بڵێین دانەرەکەی زۆر شەیدای رۆشنبیرییەو بە رۆشنبیری هەڵدەچێت و خۆی پێ نوێ دەکاتەوەو پەرەدەسەنێت.

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستی بە نوسراوەیەکی سەربەخۆ هەیە، بۆئەوەی باسی بارودۆخی ژینگەی خێزانی منداڵیم و خوێندن و پەروەردەی هەرزەکاریو لاوییەتیم، و تا گەیشتمە پێکهاتن و پێگەیشتنی کەسییەتی و بارودۆخی ئەو(٣٠-٤٠) ساڵەی دوایم بکەم، ئەمەش لە بەندێك جێگای نابێتەوە، و لێکۆڵینەوەیەکی بابەتی قورسیشە، بەڵام دانەر دەتوانێت دەستنیشانی کەمێ ئەو ئالایانەی سەر رێگای ژیانی رۆشنبیری خۆی بکات، لەوانەیە خوێنەر هەندێك سوودی لێوەرگرێت.

یەکەم شت بیڵێم وئاگاداری خوێنەر لێبکەم ئەوەیە من هیچ

چاکەیەکم لە خوێندنگە نەدیوە لە رۆشنبیرییەیەکەمدا، لەو خوێندنگەیانە فێرە بابەت بووم و زانیاریم وەرگرتووە، ئەوەندەش بەهای زۆر نەبووە، بەڵام رەفتاری فێرنەکردمو رێبازی پەروەردەی نەدامێ، و هەموو رێساکانی رێزمانو ناوی جوگرافی و مێژوویی و جەبر وئەندازیاریم لەبیرچۆتەوە، وزۆربەیانم بەئەنقەست لەبیرخۆم بردۆتەوە، و ئاواتی لەبیرچونەوەیان دەخوازم، بۆ ئەوەی بیرم خاڵی بکەم، و پڕیبکەمەوە بەئەو لێکۆڵینەوە و زانیارییانەی لەباری ئەم زەوییەن و کە شایستەشن...

زۆربەری ئەوانەی کەمن دەناسن لەبەرفراوانی رۆشنبیریم منیان بەدڵە، و مافی خۆیانە، لەبەرئەوەی بەبەراوردکردنم لەگەڵ خەڵکی تردا، خۆم دەبینم توانای وتویوێژم لەگەڵ نوسەر و پزیشك و سایکۆلۆجی و بایلۆجی و مێژوونوس و پیاوی ئاینی و مادی ورۆشنبیری ترم وەك یەك هەیە، نەك لە هەموو کارەکانیان، بەڵکو بەوەی کە پەیوەنداره بەرۆشنبیرییەکەیانەوە. ئەم فراوانی رۆشنبیرییەم ، دەرگای بۆ والاّ کردووم بۆ بینینێکی پێکهاتەی دانەری دروستکەری بۆ باری جیهانی مرۆڤایەتی. لەجیاتی ئەوەی پاڵم پێوە بنێت بۆ شیکردنەوە و رەتکردنەوە و وێرانکردن.

لەبیرمە، کە (تای) رۆشنبیریم گرت لەتەمەنی (١٨)ساڵیدا. زۆر بەرەو شیکاری و رەخنە و رەتکردنەوە دەڕۆیشتم، ئەوەش بۆ خوێنەر بە روونی دیارە کە لەوتارێکدا لە گۆڤاری (المقتطف) بەناونیشانی (نیتشە وأبن الانسان) لەساڵی (١٩٠٩)



دا بلاّو کراویەوە..ئەوەندەی رەخنەی وێرانەی ئەم کەڵە پیاوەم کردووە، ئەوەندە باسی ژیانی زانستیو کراوەیی ورۆژنامەگەرییەکەیم نەکردووە، من ئێستا ئەم پیاوە بەهێمای تێکۆشانی ژیانم دادەنێم.

ریککەوتێکی خۆش بوو لەژیانمدا کە لە تەمنێکی کەمەوە گۆڤاری (المقتطف)م ناسی و بەشداریم تێداکرد، و هەر لەوانیشەوە رێبازی ئابووریم وەرگرت، و دوورکەوتمەوە لە چەنەبازی وشە، و هەرلەوانیشەوە هەوەسی زانستیم وەرگرت، و تائێستاش رێبازم زانستییە. نوسراویەکی پزیشکی لەسەر رژێن(غدە)م پێ پەسەندترو لە پێشترە، لە چیرۆکێکی روسی پلەیەك، ومانای ئەوەش نییە کە چیرۆکم پێشتگوێ خستووە، بەڵکو نوسراوە زانستییەکان پێش چیرۆکەکان دەخوێنمەوە.

پاشان شانس هەلی بۆ رەخساندم کە لەپاریس و لەندەندا بژیم، و لەوێش پەروەردە و ئاڕاستە و فەلسەفەم دیتەوە، رۆژنامەو گۆڤاری حەفتانەو مانگانە لەو دوو پایتەختدا گەلەك زۆرن، بەتایبەت لەلەندەن، کە بینینێکی جیهانییە بۆ باری سیاسی و کۆمەڵایەتی، و لەمیسریش رۆژنامەو گۆڤارەکانمان بینینێکی لادێییانە بوو تێکۆشانمان دژی ئینگلیز لەمیسردا، نەیدەهێشت بیر لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بکەینەوەو دووری دەخستەوە لەبیرکردنەوەمان، لەبەرئەوەی هەموو خەم و بایەخدان و هەوڵ و تەقەلاّمان بۆ سەروەری بوو. مافی خۆشمان بوو بەلاّم ئەم تێکۆشانە رێگای بینینێکی جیهانی و فراوانکردنی رۆشنبیری خوێنەری میسر گرتبوو.

رۆژنامەو گۆڤار لە لەندەن و پاریسدا، تۆوی رۆشنبیریم بوون، زۆر بایەخم بە ململانێی بازرگانی نێوان بەریتانیا و ئەڵمانیا دەدا، و دەمزانی پاشان چیبیان لێدێت، و هۆیەکانی چین، تا وام لێهات بەچاوکراوەیی دەربارەی چین و هیند و تورکیام دەخوێندەوە.. لەتەك ئێستایان دەڕۆیشتم و چاودێری ئایندەیانم دەکرد، و کارل مارکسم ناسی و زانیم کە ئەوانەی لە هاوبەشییەتی نەزانن، لەرووداوە گەورەکانی جیهانیش تێناگەن!!..

لێرەدا گرنگی فێربوونی زمانێکی ئەوروپایی زیندوو دەردەکەوێت، بۆئەوەی بکرێتە رێبازی رۆشنبیری میسری، لەبەرئەوەی زمانی ئێستامان بایی ئەوەندە نییە مرۆڤێکی رۆشنبیر دەربچێنێت، کە بیری گشتی هەبێت، و مانای ئەوەش نییە کە من فولکلۆری مەزنی عەرەب پشتگوێ دەخەم، لەوانەیە بەدەگمەن نوسراوەی کۆنی عەرەب هەبێت نەمخوێندبێتەوە، و بەمێشك هەرسم نەکردبێت، بەڵام گومانم لەوەدایە بە دەروونیش هەرسی بکەم؟!....

هەموو ئەو نوسەرانەی لێکۆڵینەوەی وێژەی عەرەبیان کردووە، ئێستاش بە رێبازێکی عەرەبی کۆن دەنوسن، منیش گوێم نەدا بەم رێبازە، لەبەرئەوەی خووی کۆنی و لاساییکەریم نییە، و مەبەستی سەرەکیم لە لێکۆڵینەوەی وێژەی کۆنی عەرەب ئەوە بوو، کە ژیانی عەرەبم لا روون و روونالک بێت. هەربۆیە نوسراوەی (الطبقات) ی(ابن أبی أصیبعه)و (تاريخ الطبری)و (أبن خلکان) و(یاقوت) و (کتب الرحاله)ی(أبن بطوطه)ەم



خویندەوە.

زۆر (الجاحظ) و (المعری)یم بەدڵە، (الجاحظ) رۆشنبیرێکی فەرهەنگی بوو، و(المعری) یش بیرکدنەوەیەکی مرۆڤانەی ئازادی هەبوو. خۆشم حەزم لە رێبازی(الجاحظ)ە وبێ فیزی(المعری) یشم پێناخۆشە.

لەوێژەی عەرەبدا، بەتایبەتی لەشیعردا، زێرو خشڵی وای تێدایە، هەتا ئێستاش دەدەروشێنەوە کە دەیاندۆزینەوە، وڕادەمینێین لە ماناکانیان. وێژەی عەرەب کۆکراوەی ویژەی سەدەی ناوەڕاستە، و لەبەرئەم هۆیە، نابێت داوای پێکهاتەی کەسییەتی وێژەی ئەم چەرخەی لێبکەین، پێش هەموو شتێك سوودی مێژوویی هەیە، و ئەو نوسەرەی تەنها پشت بەو ببەستێت لە رۆشنبیریدا ، گۆشەگیر دەبێت ، و لە تەزووی جیهانی دووردەکەوێتەوە، ، بەڵکو بەوێژەیەکی سەڵتی دەژین گەر بەراوردی بکەی لەگەڵ ئەوانەی هاوسەری وێژەی ئەوروپاییان کردووە.

ئەو نوسەرە ئەوروپاییانەی کە تۆوییەکی زیندوو بوون لەپێکهاتەی کەسیەتیم و رۆشنبیریمدا زۆرن، و لاپەڕەی زۆری دەوێت بۆ ناویان و تایبەتمەندییەکانیان، بەڵام ئاوڕێکی زۆر تایبەتم لە ئەگریکە کۆنەکان داوەتەوە وشتی جوانم لێوەرگرتوون وەك ئازدای و وێژدان و پوختی و پاکی بیریان، لەتەمەنێکی زووەوە بایەخم بە لێکۆڵینەوەی وێژەی رووسیداوە، و گەیشتمە ئاستێکی بەرز لە جیاکاری هونەری و دووری خستمەوە لەو چیرۆك و گۆڤارانەی کە بایەخ دەدەنە

سروشتەی سێکس. بەراستی بەشانسی دەزانم، یەکێك پێش تەمەنی(٢٠) ساڵی (دستۆفسکی)و(گۆرگی)و(تۆلستۆی) بناسێت و خۆشیانی بوویێت.

لەساڵی(١٩٠٨) ەوە تائێستا. من نوسینەکانی (هـ.ج. وولز) دەخوێنمەوە ئاڕاستەی جیهانی و ئامۆژگاری زانستیم تیادا دۆزییەوە، و ئەمەشم لە (برنادۆشۆ)شدا دۆزییەوە، نوسراوەیان نییە نەمخوێندبێتەوە.

هەوەسی دەروونیم زۆربەی دەگەڕێتەوە بۆ(داروین) وبیرۆکەی پەرەسەندن. ئەم بیرۆکەیە بیرسازای رۆشنبیریمە و ڕێبازی لێکۆڵینەوەمە، و ئاینیشە لەژیانمدا. تۆوەکیەکان دەرگای زۆری لەسایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و جیولۆجی و مێژوو و سیاسەت و ئابووری وێژەییدا بۆ واڵا کردم، لەبەرئەوەی بیردۆزی پەرەسەندن، ڕێبازو ئاڕاستەی نوێی فیرکردم لەلێکۆڵینەوەدا، بۆیە لەگەڵ زۆربەی نوسەراندا جیاوازم، لەبەرئەوەی بەبینینێکی پەرەسەندنی سەیری زمان و ووێژە دەکەم، ئەوانەی نەزان بن لەبیردۆزی پەرەسەندندا، وا دەزانن کە شارستانییەتی و رۆشنبیری و سروشت وەستاو وسڕن، بۆیە قینیان لە گۆڕانە لەزمان و وێژەدا، و لێشی دەترسێن، پاساویش بۆئەم قینە دەهێننەوە بەوەی کەئەوان ملکەچین گەر لێڵ و بۆگەنیش بێت.

ئەم بیردۆزییە، زۆری دوورخستمەوە لەنادیارەکان، و نەیهێشت کات و توانام بەفیڕۆ بڕوات لە توێژینەوەی تاریکی ئەواندا، بەم دوورکەوتنەوەش چاکتر لە ئەم هەسارەیە گەیشتم



و ملکەچی بووم.

ئەگەر ویستم ناوی(١٠) لەو دانەرانە بهێنم، کە کاریگەری زۆریان لەسەر پەروەردەکردنم هەبووە ئەوا دەڵێم کە :_

- لە (ئەفلاتون) فێری بیرکردنەوەی پاك و خاوێن بووم، و ئازادی کردم لە وێنەکێشانی کۆمەڵایەتی، هەروەك لە نوسراوەی(الجمهوریە)ی دا هاتووە.
- لە (دۆستۆفسکی) فێری جیاکاری هونەری بووم، وای لێکردم بەدڵ بیربکەمەوە، و بەمێشك هەست بکەم ، ئەمەش بەڕوونی لەچیرۆکە جیهانییەکەی (الاخوە کرامازۆف) دەردکەوێت، و هەموو نوسینەکانی وا لە خوینەر دەکەن مرۆڤانە بێت.
- لە (نیتشە) شتی زۆر فێربووم لەبارەی رەوشت و مێژوو و بەها مرۆڤایەتیەکەیەوە.
- (گۆتە) نمونەی بەرزی کەسییەتی پێشکەوتوو و فراوانی بیرە، ئەو وێژدانە زیندووەیە کە کاتێك بێ هیوا و بێ جووڵە دەبم، هەڵم دەسێنێتەوە.
- (رۆسۆ) سەرۆکی جوڵانەوەی رومانسییە لەئەوروپادا، زۆرکاری تێکردم، بە ئەو لە شۆڕشە گەورەکەی فەرەنساو پەرەسەندنی وێژەکان و وەرگێڕانی روسیا گەیشتم، و داواکردنەکەی بۆ( گەڕانەوە بۆ سروشت) تۆوی ژمارەیەکی گەورەی جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی و وێژەی بوو.
- (داروین) باوکی پەرەسەندنە، تەنها ناوهێنانی بەسە.
- (برناردشۆ) سوودم لە روونی بیرکدنەوەی و توانجەکانی (٥٠) ساڵی سەبارەت بەرووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان

وەرگرت، ئەو رۆژنامەنوسە بوو کە لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەم هەسارەیەکرد بەگیانێکی ئاینیەوە.

- (وولز) ئاراستەیەکی جیهانی کردم، وای لە رۆشنبیرییەکەم کرد توێنییەتییەك بێت و نەشکێت. زۆربەی بیرکردنەوەم لەسەر رێبازی ئەوە.
- (مارکس) نەبا، من خۆم بە نەخوێندەوار دادەنا، و لە خوێندنەوەی رۆژنامەش تێنەدەگەیشتم، و نەمدەزانی چۆن سۆزو رەوشت دروست دەبن، و چۆن کۆمەڵ دەگۆڕێت.
- (فرۆید) ئەو دەرگا داخراوانەی لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجی بۆکردینەوە، و منی کردە خوێندکارێکی هەمیشەیی ئەم زانستە و جیهانی نوێی بۆ ئاسان کردم.

کە باسی ئەو(١٠) یە دەکەم ، مەبەستم کورتکردنەوەیەو گەر بەدوورو درێژی باسیان بکەم دەگەنە(١٠٠)و زیاتریش. هەموو خوێنەرێك بارودۆخ و هەوەسی تایبەتی خۆی هەیە، نیوەی سەدەی رابردوو جیاوازە لەگەڵ نیوەی سەدەی داهاتوو، بۆیە دەبێت خوێنەر بەرنامەی رۆشنبیری خۆی بگۆڕیت،و هەرخۆیشی دەتوانێت ئەو دانەرانە هەڵبژێرێت کە تۆوەکین.

خوێنەر لەنێو ئەو(١٠)یە دەبینێت کە من داوای رۆشنبیریم کردووە لەبەریەك هۆ ، ئەویش پێشخستنی کەسییەتیمە،و تێگەیشتنی کۆمەڵە بەلێکۆڵینەوەی ئەم چەرخە،و دەبێت ئاگادارت بکەم، کە هیچ یەکێك لەو(١٠)یە نییە هەڵەی نەبێت و منیش کوێرانە بەشوێن کەسیان نەکەوتووم.

(ناپلیۆن) سەبارەت بەستراتیژییەتی جەنگ دەیگوت:



لەشکری جەنگاوەر، دەبێت چەکێکی تایبەتی هەبێت، لەوانەیە تۆپ یان پیادە یان سوارە بێت، ئەوسا گوێ نادەیتە چەکەکانی تر گەر ئاسایی بوون، رۆشنبیریش دەبێت ئەوها بێت، دەبێت لە بابەتێك لێزان و تایبەت بێت، دوای ئەوەش گوێ ناداتە بابەتەکانی تر ، گەر ئاسایی بوو تیایاندا، کە قوڵ دەبیتەوە لەیەك لێکۆڵینەوە بریسکەدارەکان، ئەوا دەیەها تیشکی جوان بەرەو بابەتەکە دەچێت، و دەبینیت دەرگایەکان بۆ بایەخی نوێ دەکرێنەوە.

بایەلۆجی، واتا زانستی ژیان ، خاڵی رۆشنبیریم بوو لەتافی لاوییەتیم لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا دروستبوو کە دوو دڵیی سێکس تێکەڵ بەکیمیای دەروونی دەبێتو دەبنە دوو دڵیی رۆشنبیری، واقورومانی ئاینی لەنێو رێباوەڕی داروینیدا بۆ دروست کردم، لێکۆڵینەوەی ئەم رێباوەڕە منی بردە نێو لێکۆڵینەوەی تر، کە پاش(٤٠) ساڵ هەرلە نێو تۆڕەکەیم، وئەوەندە قووڵبوومەوە لەنێو ئەم رێباوەڕەدا، تا نوسراوەی (نظریة التطور وأصل الانسان) م دانا، چەندین وتارم لەرۆژنامەی (البلاغ)دا بلاوکردەوە، بێ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ سەرچاوەکان ، لەبەرئەوەی هەر هەموویانم لەبەر بوو.

لێکۆڵینەوەی بایەلۆجی منی گەیاندە لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و ئاینی و مێژوویی و جیولۆجی.

رۆژنامەگەریم کردە پیشە، پێش ئەوەی بگاتە ئاستی ئەڵێن و وتیانورابواردن، کەدەمانمرێنێت، و بیرکردنەوە لەباری کۆمەڵایەتی و سیاسی جیهانی و نیشتمانی بوو بە پیشەم،

کەبـەردەوام ئـەم پیشـەیە وام لێـدەکات زیـاتر وزیـاتر قـووڵ ببمەوەتیایاندا ...

( ٤٥ )

## قووڵبوونەوە بۆ لێکۆڵینەوەیە

وانە وەرگرتن لەژیاندا، هـەروەك لـە جەنگیشـدا، بـەو پلانەیـە کەلەسەری دەڕۆیت. رۆشنبیریش هـەر ئەوهایـە، لـە کتێبخانـەی مۆزەخانەی بەریتانیادا پترلە (٤) ملیۆن بەرگ هـەن، بـەجێ نییـە مرۆڤێـك حـەزبکات هـەمووی یـان نیـوەی یـان(یـەك لەسـەردەی)ی بخوێنێتەوە. لەبەرئەوەی مرۆڤ لەم کاتەدا ، تەمەنی بای ئەوەندە نییە بتوانێت هەر هەمووی بخوێنێتەوە، و ئێمەش پێویسـتیمان بە خوێننەوەی هـەمووی نییـە، زۆربـەی ئـەو بەرگانـە بـەهایان بـە قەد بەهای ئەو تۆزەیە کەلەسەری نیشتووە.

بۆیـە دەبێـت پلانێـك دابـنێن بـۆ رێکخسـتنی توانامـان بـۆ خۆڕۆشـنبیرکردن، و دەبێـت گـرنگتر پـێش گـرنگ بێـت، تـڕۆ و نەزۆکـەکانیش بـەلاوە بنـێین، بۆیــە نابێــت بەهەرەمــەکی بخوێنینــەوەو بــەفێڕۆ بــڕوات، لــەم جیهانــەدا و لــەژیانی مرۆڤایەتیـدا، لەبیرکردنـەوەی مرۆڤایـەتی گـرانتر نییـە، بۆیـە دەبێـت زۆرتـرین پەرۆشـی پێبـدەین، پـەروەردەی بکـەین و رۆشـنبیری بکـەین و پێبگەیـەنین ، لەبەرئـەم هۆیـە دەبێـت بـیر



لـەپلانێك بکەینـەوە بـۆ لێکۆڵینـەوە، بۆئـەوەی بتـوانین دەسـت بەکات و رەنجمان بگرین.

ئـەوەی ئـاواتی رۆشـنبیرییە، دوو دڵـە لـەنێوان فراوانکـردن بـۆ زانینی زۆرترین زانیاری رووپی ، و نێوان قووڵبوونەوەو پسـپۆڕ بوون لە هونەرێك یان زانستێك بەتەواوی. واتا لەنێوان گشتاندن و پسپۆڕی دەوەستێت. باشە بەشوێن کام پلان بکەویت؟!.

پێشـتر باسـی پلانـی ناپلیۆنمـان کـرد لـە جەنگـدا، ئـەویش ئــەوەبوو ، کــە دەبێــت لــە یــەك لــە چــەکەکانی. زاڵــتر بێــت لەسەرهەمان چەکی دوژمن، لەوانەیە چەکی تۆپ یـان پیـادە یـان سوارە بێت، واتا لەیەك لەو سێیانە دەبێت لە دوژمن بەهێزتر بێـت. بۆئـەوەی بـەم هێـزو زاڵێیـە بگاتـە خـاڵی لاوازی دوژمـن، لێیبدات و بۆ بەشەکانی هێزەکانی تر رەت بێت و هەڵیوەشێنی، ئێمەش پێویستیمان بە پلانێك هەیە بۆئەوەی بگەینـە ئاواتمـان. و ئاواتیشمان لێرەدا، پێگەیشتنمانە بە رۆشنبیری. بیریشمان پڕبکەین لە فراوانترین و زۆرترین زانیاری، بۆئەوەی پەروەردەی بینینمــان لەژیانــدا بکــەین ، و گــەر بەختــەوەریمان لەژیانــدا پێنبەخشـێت. خـۆ تێگەیشـتنمان دەداتـێ، تێگەیشـتنیش لای مرۆڤـی رۆشـنبیر بەختەوەرییـە ، و لـە بەختـەوەریش گـرنگترە. ئـەوەی حـەز بـە خۆرۆشـنبیرکردن بکـات، یەکـەم جـار گشـتاندن وەردەگرێت و هەموو هونەرو زانستەکان دەناسێت وئەمەباشـە. بــیری دەگەێنێتــە بابەتــە جۆراوجۆرەکــان تــا دەگاتــە ئــەو خورادنەوەی کە خۆشە لای ، واتا ئەو مادەیـەی کە بارودۆخی هەوەســی و بــژێوی و کێشــەکانی وای لێــدەکات قووڵبێتــەوە

تیایاندا، ئەوسا ئەو (٤) ملیۆن نوسراوە و بەرگەی لەپێش نابێت، بەڵکو بە(١٠٠) نوسراوەی رەسەن قایل دەبێت ، ئیتر پاش ئەوانە چی بخوێنێتەوە بە لق دادەندرێن بۆ راڤەکردن و توانج لێدان لەسەر ئەو (١٠٠) نوسراوەیە.

پلان لە رۆشنبیریدا، وەك پلانی جەنگە لای ناپلیۆن، واتا لەخاڵێك قووڵدەبینەوەو لەو خاڵەوە فراوان دەبینەوە،و لێرە و لەوێ لق دەکەینەوە بۆ زانیاری جۆراوجۆر، کە بەم خاڵە پەیوەندارن، یان بەم مادەیەوە، ئەم پلانەش پلانێکی فسیۆلۆجییە. بەقەد لێوەشاوەیی و حەزەکانمان قیت دەبێتەوە، ئێستا لە جیهاندا نزیکەی (١٣٠) زانست و هونەرهەن،و تەمەنی مرۆڤیش بەشی لێکۆڵینەوەی ئەو هەمووە ناکات،و ماحاڵیشە بیری مرۆڤێك بتوانێت ئەو هەموو لێکۆڵینەوە گشتیانە بە خۆوەبگرێت، لەبەرئەوەی بەرەنگاری هەندێکیان دەبێتەوە، وهەندێکی تری لاپەسەند دەبێت.

ئەوەی حەز لە رۆشنبیری دەکات، ئەوەندەی لەسەرە کە بگەڕێت بەشوێن ئەو مادەی کە حەزی لێدەکات و دەگونجێت لەگەڵ بژێوی و دەتوانێت تیایدا قووڵبێتەوە، دواتر بلاوبێتەوە بەنێو هەموو هونەرە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندار بەو مادەیەوە، واتا ئەو مادە رەسەنەی کە لێکۆڵینەوەی دەکات، ئەو خاڵەیە کە لەوێوە تیشك بڵاودەکاتەوە بۆ ماددەکانی تر. لێکۆڵینەوە بەهەرەمەکی نابێت، بەڵکو دەبێت پەیوەندی فسیۆلۆجی بە بیرمان و پێداویستییەکانی بژێوی تاکی و کۆمەڵایەتیمانەوە هەبێت.



بیری مام ناوەندی نەك بیری بەرز، بڕوا بەو رۆشنبیرییە ناهێنێت کە فڕ لە هەموو خواردنەوەیەك بدات بەهەرەمەکی، بەڵکو ئەو پاش ماوەیەك خۆی دەبینێتەوە کە زۆر حەزی لە قووڵبوونەوەیە. لەوبارەیەوەش کۆڵ نادات، کات ئەوەندە ناڕوات، تۆڕی ئەو زانیارییانە دەدۆزێتەوە کە پەیوەندی بە فسیۆلۆجییەتەکەی خۆیەوە هەیە، هەر وەك تۆڕێکی دەمار تێکەڵ هەموو بیری دەبێت، و وەك حەز داوای ئەو زانیارییانەش دەکات، و بەحەزی خواردن دەچێت،و بگرە جاریش هەیە لە حەزی خواردنیش بەتینترو بەهێزتر دەبێت.

مرۆڤ ناتوانێت بەخۆی بڵێت رۆشنبیر گەر لەمادەیەك قووڵ نەبووبێتەوە، وایە زانای نەزان هەن لە مادەیەك قووڵبوونەتەوە و لەوێوە بەرەو مادەی تر نەڕۆیشتوون، منیش بەئەوانە ناڵێم قووڵبوونەتەوە، بەڵکو پێیان دەڵێم پسپۆڕ بوونە،وزۆربەیان ئەو مادەی کە تیایدا پسپۆڕبوون هەڵیاننەبژاردوە، و بەڵکو بێ هەڵبژاردن ملکەچی ئەو پسپۆڕییە کراون!؟.

نمونەی ئەوانە، ئەوەی پسپۆڕ بووە لەکیمیا،هیچ لەئاین و ئابوری نازانێت، لەبەرئەوەی لەلاوەییەوە دەستیکردووە بە پسپۆڕبوون لە کیمیاداو بواری نەبووە لەو کێڵگە سەوزەی رۆشنبیری بلەوەڕێت.. ئەوەی حەزی لێیە هەڵیبژێرێت:- خۆرۆشنبیرکردنەکەی لەکیمیادا خۆیی نەبووە،و ئێمەش ئەم نوسراوەیەمان داناوە بۆ خۆرۆشنبیرکردن، واتا بۆئەو کەسانەی کە مەبەستیان ئەوەیە خۆیان پەروەردە بکەن،و هەریەك لەوانە فێرکارو خوێندکارە، هەردووکیان ئازادن لە هەڵبژاردندا،

ئەوانەی بۆمبی گەردیلەییان دروستکرد، بێگومان پسپۆڕ بوون ، لەبەر پسپۆڕییەکەیان، لەوێژەو فەلسەفەو ئایندا نەزان بوون، لەبەرئەوەی گەر ئەمانەیان بزانیبا ئەو بۆمبەیان دانەدەهێنا؟!.

خوێنەر بەردەوام بەبیر خۆی بهێنێتەوە، کە نابێتە ڕۆشنبیرێکی تەواو گەر لە زانستێك قووڵ نەبێتەوە، کە مەشقی زانستی لێوە فێر دەبێت و دەتوانێت جیاکاری نێوان ڕاستی و ناڕاستیەکاندا بکات، ئەم قوڵبوونەوەیە وای لێدەکات توانای ڕەخنەی هەبێت لە زۆربەی بابەتەکاندا، بۆیە دەبێت خۆی ئەو مادەیە هەڵبژێرێت بۆ قووڵبوونەوە تیایدا، لەبەرئەوەی هەڵبژاردنەکەی لەناخ و قوڵایی کەسییەتیەکەی هەڵدەقوڵێت، لەگەڵ توانای دەگونجێت.

ئەو خوێنەرەی چەندین ساڵ بەسەریدا دەڕوات بێ قووڵبونەوە لەمادەیەکدا،ئەوا دەروونی لەو چەند ساڵەدا سڕە و ناگەڕێت بەشوێن بابەتێکدا .بۆیە ئەو خوێنەرە نەخۆشەو پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە!!.....



( ٤٦ )

## سەد نوسراوە

زۆربەی خوێنەر پێویستی بەدەستنیشانکردنی ئەو نوسراوە ڕەسەنانە هەیە کە ڕۆشنبیر بۆ خوێندنەوە پێویستییەتی، ئەم نوسراوانەش گشتین، و مەبەستیش لێیان پسپۆڕی نییە، یان گرنگن و بەخوێندنەوەیان دەگەینە مرۆڤایەتیەکی بەرز، و لەوێوەش دەمانگەیێنێتە گیانێکی جیهانی بەرز.

دیارە ئەو لاوەی بایەخی دابێت بەوەی کە ئاستی بیری بەرزبکاتەوە، پێویستی بەوە نییە ئێمە دەستنیشانی ئەو نوسراوانەیان بۆبکەین، لەبەرئەوەی خۆی دەناسێت، و گەر ڕێگای ڕاستی لەڕۆشنبیریدا گرتبێت، ئەوا خۆی نوسراوەکان دەناسێتەوە، بەڵام نوسراوە هەن بەهایان شاراوەیە بۆ ئەوانەی کە گوێبیستی نەبوون، بۆیە زۆربەی بیرمەندان بیریان لەوە کردۆتەوە کە دەستنیشانی ئەو نوسراوانە بکەن کە بەهایان لەڕۆشنبیرکردنی گشتیدا زۆرترە لە نوسراوەی تر.

دکتۆر( ئەلیۆت) سەرۆکی جارانی زانکۆی(هارفەرد) لەئەمەریکا لیستێکی بە (١٠٠) نوسراوە و بەرگ ڕێکخستووە، و کۆمپانیای (کۆلیار ئیندسن) هەموو ئەو(١٠٠) نوسراوە و

بەرگەی بەیەك چاپ و كاغەز و بەرگ بڵاوكردەوە،و خوێنەر ئاگای لەوەبێت كە ئەم زنجیرە لە (١٠٠) بەرگ پێكهاتووە، نەك (١٠٠) نوسراوە، لەبەرئەوەی ئەم بەرگانە لە (٣٠٢) نوسراوە پێكهاتوون. واتا هەر(٣) دانەر خراوەتە نێو یەك بەرگەوە، بەرێسایەك هەڵیبژاردوون، كە لەبابەتەكانیان یەك بن، یان دانەرەكان بەیەك بچن، بەنوسینەكانی گریكە كۆنەكان دەستپێدەكات، تادەگاتە ئەم چەرخەمان،و بەراستیش چاكترین نوسینی هەموو چەرخەكانی كۆنی كۆكردوتەوە و رۆشنبیریش ناتوانێت هیچ یەك لەم نوسراوانە وەلاوەنێت و گوێی نەداتێ.

(١٠٠) ناوی نوسراوەی تر هەن دكتۆر( هیتشتر)، سەرۆكی زانكۆی شیكاگۆ دایناون، ئەویش هەر لە چەرخی گریكەكانەوە دەستپێدەكات تا دەگاتە ئەم چەرخەمان، بەڵام لەگەڵ دكتۆر(ئەلیۆت) جیاوازێكی هەیە ،ئەویش ئەوەیە كە زۆر ئاوڕی لە دانەرە ئەمەریكییەكان داوەتەوە، لەساڵی(١٩٤٣)دا گۆڤاری (التربیة الحدیثة) ەی زانكۆی ئەمەریكی لەقاهیرە، ئەو لیستەی بڵاوكردۆتەوە،وئەو(١٠٠)ناوە، ناوی نوسەرەكانە،و لەوانەشە لە (٢٠) بەرگ زیاتر بن.

واش بەباشی دەزانم كە یەك لە مامۆستاكانی كۆلێژی وێژە لە زانكۆی قاهیرە، ناوی (١٠٠) نوسراوەی عەرەبیمان بۆ دەستنیشان بكات، كە خوێنەری عەرەب رۆشنبیردەكەن، بەوەی دكتۆر(ئەلیۆت)ودكتۆر( هیتشتر) بچێت، كە هەردووكیان مەبەستیان رۆشنبیرێیكی مرۆڤایەتی گشتی و دانەری جیهانی لە چەرخ و نەتەوەی جۆراوجۆردا بوو. كەسیشیان مەبەستیان



ئەوە نەبوو كە لیستێك بەتەنها بۆناوی دانەری ئەمەریكی و ئینگلیزی بكەن، منیش وا دەزانم كەلیستەكەی دكتۆر(ئەلیۆت) لە هەموو لیستەكانی تر باشترە وشایستەی بوونیەتی لای رۆشنبیر.

لە تەك ئەمانەدا، رۆشنبیر پێویستی بە فەرهەنگ هەیە، بۆ بەداچوون و راڤەكردن، ولەهەموو ئەو فەرهەنگانە گەورەتر، فەرهەنگی (الموسوعە البریطانیە)یە، بەڵام گرانە، ئێستا بە (١٦٠) جنیهە. بۆیە دەتوانیت فەرهەنگێكی ترت هەبێت.

خەوشی هەموو فەرهەنگێك ئەوەیە كە زوو دەمرێت، لەبەرئەوەی ئەو زانیارییانەی كە تیایدایە، زۆر لقیان لێدەبێتەوە،وگۆڕینی بەسەردا دێت،و فەرهەنگەكەش هەر بە زانیارییە كۆنەكانەوە دەمینێتەوە و لەجێی خۆی دەوەستێت، بۆیە فەرنسییەكان فەرهەنگێی نوێیان دەركردووە بەناوی(الورق السائب) واتا ئەوەی ئەو فەرهەنگەی هەبێت وەك بەرگ هەڵیدەگرێت، هەموو مانگێك پەڕەیەكی وێڵی لەو زانیارییانەی كە نوێ بوونەتەوە یان گۆڕاون بۆ دێت، ئەو پەڕە نوێیە دەخاتە شوێن پەڕە كۆنەكە پاش لێكردنەوەی، بۆیە هەتاهەتایە ئەو فەرهەنگە بەنوێی دەمێنێتەوە.

بێگومان فەرهەنگ ناخوێندرێتەوە، بەڵكو پیادا دەچیتەوە، سوودیشی زۆرە گەر چاك بوو. ئاگاشتان لە فەرهەنگی ئینگلیزی بێت گەرهاتوو لەبەریتانیا چاپكرابوو لەبەرئەوەی بایەخەكی زۆری بەیاری و وەرزش وئۆرۆستكراتیەتی داوە و لایەنی مێژووی بەرتیانیا لەسیاسەت و داگیركردن و سیستمی

ئیمپراتۆریەتی گرتووە، خوێنەر سوود لە فەرهەنگی ئەوها وەرناگرێت، و لەبیریشمان نەچێت کە (الموسوعە البریطانیە) لەئەمەریکادا چاپ دەکرێت و سەرەڕای ناوەکەی، بۆچوونی جیهانی تێدایە!!..

بەڵگە نەویستە، فەرهەنگ بەهای زۆرە، بەڵام دووباتی بەهای نوسراوە دەکەمەوە، نوسراوە سۆز دەوروژێنێت وبیر بەئاگادەهێنێتەوە، نوسەرەکەش هەر کورتەیەك لە بابەتەکە نانوسێت، بەڵکو فراوان دەبێتەوە تیایدا، دەتوانیت فەرهەنگ بەکارنەهێنیت، بەڵام ناتوانیت نوسراوە نەخوێنییەوە ، گەر بەخوێنەر وترا: کامیان هەڵدەبژێریت(١٠٠) بەرگەکەی کە دکتۆر(ئەلیۆت) و دکتۆر(هیتشتر) دایانناوە، یان (الموسوعە البریطانیە)؟ وەڵامەکەت بایەکەم بێت لەبەرئەوەی یەکەم رۆشنبیرێیکی گشتییەوئەوەی دووەم رابەرە، ولەبەندەکانی پێشتر ناوی زۆربەی ئەو نوسراوانەم هێناوە تا پیشتگوێ نەخرێن............



( ٤٧ )

## بەرنامەی خۆڕۆشنبیرکردن

مەبەستمان لەئامادەکردنی بەرنامەیەك بۆ خۆڕۆشنبیرکردن ئەوەیە: کە چالاکی لەژێری ناوەوە بگوازینەوە بۆ ژێری دیار، واتا لەناخەوە بۆ ویژدان، یان لە (حەزی کشتییەوە بۆ بەرزکردنەوەی بیر)بۆ (ویستی تایبەت بۆ وەدیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراوە) یان لە(بڵاوبوونەوەی چالاکی گەر هەرئەوها دەڕوات وپەرت و بڵاودەبێتەوە) بۆ(خاڵی تیشکۆیەك تیژی بکاتەوەو گڕبگریت)، وببێتە تیشکی جۆراوجۆر، و ئەوسا پێکەوە فراوان و قووڵدەبنەوە لەهەمان چەقە رەسەنەکەوە.

لەراستیدا ئەمە لەهەموو مرۆڤێك روونادات کە بەرەو رۆشنبیری دەڕوات، و تۆ مرۆڤێکی رۆشنبیر نابینیت کە خاڵی تیشکۆ، یان چەندخاڵێکی تیشکۆی کەمی نەبێت، هەموو چالاکییەکانی تێدا کۆدەبێتەوەو گڕدەگرێت و تیشکی جۆراوجۆر دەداتەوە، ئەو لە مادەیەکدا پسپۆڕ دەبێت و دواتر دەگوازێتەوە بۆ مادەیەکی تر، ئەمەش هەروا دەبێت، گەر هاتوو خاوەنی بیرێکی ئاسایی بوو، بەمەرجێك لێکۆڵینەوەی بەراست گرتبێت.

ئامادەکردنی بەرنامە ، رێگا بۆ ئەم پسپۆڕییە خۆشدەکات،

واتا خاڵی تیشکۆ دروست دەبێت و بارودۆخی ژیان، کات و دراو و رەنج بەکاردەهێنێت، و ئەم هێزانە پەرت و بلاودەکاتەوەو بەشی لێکۆڵینەوە نامێنێت بۆ خۆڕۆشنبیرکردن، بەڵام ئەگەر بەرنامەی دانا، دەتوانێت زۆربەی ئەو هێزانە گل بداتەوە بۆئەوە مەبەستە.

بۆ نموونە گەر ویستی لە زمانێکی بیانی بکۆڵێتەوە،ئەوا یەکەم جار پێویستی بە فێرکارێك هەیە بۆئەوەی گاڤی یەکەم تەواوبکات، کە دەگاتە سەروەری لێکۆڵینەوە، پێویستی بە کڕینی نوسراوە و تەرخانکردنی کات دەبێت و دەبێت بەردەوام لێکۆڵینەوەی بکات، چالاکییەکەی پەرت و بلاودەکاتەوەو لەوانەشە ساردی بکاتەوە.

بۆئەوەی ببینە رۆشنبیر. دەبێت بەرنامە ئامادەبکەین و کات تەرخان بکەین بۆ لێکۆڵینەوە(٢-٣) سات رۆژانە، و دەبێت پارەی بۆ ئامادەبکەین، لەبەرئەوەی پێویستیمان پێیەتی بۆ لێکۆڵینەوە بە کڕینی نوسراوە و گۆڤار ، بڵێ ساڵی(١٠-٢٠) جنیە، کە هەندێکی بۆ فێرکارو ئامۆژگارییەکانی دەڕوات، ئەوەی تریش بۆ لێکۆلینەوە بۆ ماوەی( ٢-٣) ساڵ دەڕوات ، بۆیە بایەخ بەشتی تر نادەین لەبەرئەوەی ئەو پارە و کاتانەمان بۆ لێکۆڵینەوە تەرخان دەکەین.

مایەی سەرسوڕمانە کە یەکێکمان (٥٠) جنیە ساڵانە بۆ منداڵەکەی سەرف دەکات کە لەزانکۆ بێت و(٢٠) جنیهش گەر هاتوو لەئامادەیی بوو بەڵام رەزیلی بۆ خۆی دەکات گەر هاتوو ساڵانە (٣٠-٤٠) جنیهی بۆ نوسراوە کڕین دانا.... خۆی پێ



فێر بکات و پەرە بە بیری بدات.بەداخەوە کۆمەڵی ئێمە هانی ئەو پەروەردەیە نادات، لەبەرئەو تەگەرانەی کەپێشتر باسم کرد، وەك پێشبڕکێی ئابووری کە بەزۆر ملیٚ وامان لێدەکات پارە کۆبکەینەوە لە ترسی ئاینده، یان وەك ئەو ژنە نەزانەی نەیاری نوسراوە کڕینەو نازانێت کە ڕەفەیەکی نوسراوە لەکەلوپەلی نێومالٚ چاکترە!!..

خوێنەری ئەم نوسراوەیە، لەوانەیە هەست بەوە بکات، کە ئێمە شان و شەوکەتی رۆشنبیری زۆر گەورە دەکەین، وەك بڵێی سەرووی ژیان بێت و ئێمەش دەبێت بژین بۆ ئەوەی بخوێنینەوە، هەن وا دەکەن واتا خۆڕۆشنبیرکردن بۆتە حەز لایان، و هەموو ژیانیانی لە باوەش کردووە،و بە ئەو رەنجەش کە دەیدەن بۆ ئەو مەبەستە بەختەوەرن،و گەر بەیەکێکمان بڵێین، کە مەبەستی ژیان زانیارییە، ناتوانێت بڵێت ئەم بیردۆزییە هەر بەهای نییە، لەبەرئەوەی مرۆڤی پێشکەوتوو و بەرز لەم جیهانەدا، تێگەیشتن بەبەرزترین و گرانترین شت دەزانێت کە بەروبوومی زانیارییە.

سەرەڕای ئەوەش، دەبێت بڵێین خۆڕۆشنبیرکردن بۆ ژیانە، نەك ژیان بۆ خۆڕۆشنبیرکردنە، لەبەرئەوەی مانا لەژیان هەر ژیان خۆیەتی،و ئێمەش کە دەڵێین، رۆشنبیریمان ئاراستەی ئەو بەروبوومە دەکەین بۆ تێگەیشتنە، خۆمان خەریکی لێکۆڵینەوەیەکی نەزۆك ناکەین، کە لە چەرخێك زیندوو بوو،و ئێستاش مردووە و هیچ رێگا پێشاندەرێك نییە بۆ ژیانی ئێستامان...

بەڵێ... دەبێت بژین لەپێناوی ژیان ، واتا مەبەست لەژیان هەر ژیان خۆیەتی و کە دەڵێین تێگەیشتن یان دانایی، یان فەلسەفە یان زانیاری یان تەندروستی یان دڵنیایی ، مەبەستمان ژیانە، لەراستیدا ئەمانە هەرهەموویان بۆ ژیانن و پاش ئەمانە دەتوانین بڵێین: کەژیان، ژیانێکی مەردانەو بەختەوەرانەو بەرزە یان تێگەیشتن و ریگا پێشاندەرە... ئەوساش دەتوانین رێبازی دابنێین لە جیاتی رێبازی نوسراوە، شورەییە بۆ نوسەر ، یان تویژەر کە زۆر بایەخ بەپەخشانی گەورەو جوان و هونراوەی بەرزو رەسەن بدات، بەڵام خۆی داوا لەژیانی خۆی ناکات کە ببێتە چامەیەکی بەرز یان پەخشانێکی جوان، واتا داوای ئەوە ناکات کە ژیانی ببێتە هونەرێکی جوان و بەئاوازێکی خۆش رێگا بکات، نەك رێگاکردنێکی خوار وخێچ بێت و گوێشی نەداتێ.

بەڵێ، لەجیاتی لە کیمیا و مێژوودا فراوان بین، با لەژیانماندا فراوان و قوول بین، لەبەرئەوەی ژیان خۆی نەژادە و هەر خۆیشی ئامانجە..

بۆئەوەی فراوان بین، و قووڵ بینەوە لەژیاندا، و چێژ لەمەردترین و خۆشترین شتی وەربگرین، و بۆئەوەی ژیانێکی رەوانبێژی جوان بژین، ژیانی دەروون و لەش و بیر، و هەر یەکە لەئێمە بەژیانی، شتێکی بەرز دروست بکات، هەموو گاڤێکی دێرێکی شیعر بێت، لەبەر هەموو ئەمانە دەبێت مێشکمان رۆشنبیر بکەین و خۆمان پەروەردە بکەین.

ئەم رێبازەش زانیارییە، کە بەڵێکۆڵینەوە دەستمان دەکەوێت، و گەر زانیاریمان لەمەیدانی جۆراوجۆری زانست و



وێژە و فەلسەفەدا کۆکردەوە، و گەر بەتێگەیشتن چارەسەرمانکرد، ئەوا رای زۆر راست و پەسەندی پێ دروست دەکەین.

(ڕا) رەنجێکی دەروونی و بیری گەورەی دەوێت، و تەنها بە ڕا ناتوانین رەفتار بکەین لەژیانماندا، بۆیە بەهاکانی رۆشنبیری لێرەدا، ڕا مان بۆ دەکاتە سۆز(مەبەستمان رای چاك و رەسەنە) و گەر ڕا بوو بە سۆز، ئەوا دەچێتە نێو سیستمی دەروونیمان و گلۆر دەبێتەوە نێو ناخمان... وئێمەش ئەوسا سۆز زۆر بەئاسانی و بێ ویژدانانە بەکاردەهێنین، دواتریش سۆز دەبێتە بەشێك لەرێبازی ژیانمان...

بەشێوەیەکی تر دەڵێم...

زانیاری گاڤی یەکەمە بۆ رۆشنبیری.

و زانیاری دەبێتە تێگەیشتن و ڕا و دانایی.

وڕا ودانایی دەبنە رێبازی ژ یان...

مەبەستە بەرزەکەی رۆشنبیری ژیانە، واتا گەیشتنە بە ئەو رێبازە بەرزەی کە پێی دەژین، لێرەدا دەبێت رۆشنبیری پەیرەوکردن بێت ومەبەستەکەی وەك مەبەستی فەلسەفە و ئاینە: زانیاری دوایی تێگەیشتن، دوایی را، دوایی سۆز، دوایی ئەو رێبازەی کە پێی دەژین، ئە پێوەرەی کەرۆشنبیری پێدەپێوین، نابێت جیاواز بێت لەگەڵ ئەو پێوەرەی کە ئاین فەلسەفەی پێ دەپێوین، واتا چەند فێرە تێگەیشتنی کردووین!؟ وچەند ئەو سۆزە جوان و بەرزانەی لە دەروونمان دروستکردووە؟! و کامەیە ئەو رێبازە بەرزەی کە ژیانی ئێمەی گەیاندووە پێی.